

# ئاگادارکردنەوەی بەندەکان

## لە ترسناکی گەڕانەوەی حوکم بۆلای یاسا دەستکردەکان

نووسینی

**إبراهیم عمر کوردی**

2019 -1440

ئاگاداركردنەوەی بەندەكان

لە ترسناكی

گەڕانەوەی حوكم بۆلای یاسا دەستكردەكان



قال الإمام الحافظ أحمد الحكمي: (وَمَعْلُومٌ أَنَّ اسْتِبْدَالَ مَا تَتْلُوهُ الشَّيَاطِينُ وَتَتَقَوَّلُهُ وَالِانْقِيَادَ لَهُ وَالْعَمَلَ بِهِ عِوَضًا عَمَّا أَوْحَى اللَّهُ تَعَالَى إِلَى رَسُولِهِ ﷺ ، هَذَا مِنْ أَعْظَمَ الْكُفْرِ، وَهُوَ مِنْ عِبَادَةِ الطَّاغُوتِ الَّتِي هِيَ أَصِلُ الْكُفْرِ، وَقَدْ سَمَّى اللَّهُ تَعَالَى طَاعَةَ الْعُلَمَاءِ وَالْأُمَرَاءِ فِي تَحْلِيلِ مَا حَرَّمَ اللَّهُ ﷻ أَوْ تَحْرِيمِ مَا أَحَلَّهُ، سَمَّى ذَلِكَ عِبَادَةً وَأَنَّهُ اتِّخَاذٌ لَهُمْ أَرْبَابًا مِنْ دُونِ اللَّهِ ﷻ فَقَالَ تَعَالَى: ﴿اتَّخَذُوا أَحْبَارَهُمْ وَرُهْبَانَهُمْ أَرْبَابًا مِنْ دُونِ اللَّهِ﴾ الْآيَةَ، قَالَ عَدِيُّ بْنُ حَاتِمٍ ﷺ حِينَ سَمِعَ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَتْلُوهَا: إِنَّا لَسْنَا نَعْبُدُهُمْ قَالَ: أَلَيْسَ يُحِلُّونَ مَا حَرَّمَ اللَّهُ ﷻ فَتُحِلُّونَهُ، وَيُحَرِّمُونَ مَا أَحَلَّ اللَّهُ ﷻ فَتُحَرِّمُونَهُ ؟ قَالَ: بَلَى قَالَ: فَتِلْكَ عبادتكم إياهم ولهذا قَالَ تَعَالَى بَعْدَهَا: وَمَا أُمِرُوا إِلَّا لِيَعْبُدُوا إِلَهًا وَاحِدًا لَا إِلَهَ إِلَّا هُوَ سُبْحَانَهُ عَمَّا يُشْرِكُونَ فَإِذَا كَانَ هَذَا فِي طَاعَةِ الْأَحْبَارِ وَالرُّهْبَانِ فَكَيْفَ فِي طَاعَةِ الشَّيْطَانِ فِيمَا يُنَافِي الْوَحْيَ؟! فَهَلْ فَوْقَ هَذَا الشِّرْكِ مِنْ كُفْرٍ؟!)[1].

---

[1] معارج القبول بشرح سلم الوصول إلى علم الأصول: ٢/ ٥٥٠

**تێبینی :**

١ – سەرەتای کتابەکە بە کۆمەڵێك بابەتی سەرەتایی و بەڵگەکان لەسەر کوفری ئەو کەسەی واز لە یاسای قورئان دەهێنێت دەستی پێکردووە، وەڵامی گومان و شیکردنەوەی بابەتەکان لە دواتردا باسکراوە.

٢ – ئەهلی سوننە نکۆڵی لەوەناکەن کە (کفر دون کفر) لای سەلەف باوبووە، وە ئێمەیش بڕوامان بەوە هەیە، وەئێمە لەپێشترین کە شوێنی ڕێگای سەلەف بکەوین وەك لە جەهمی و غولاتی مورجیئەی سەردەم، بەڵام بەو شێوازەی کە سەلەف لێی تێگەیشتن، وە بۆ ئەو واقع و سەردەم و ولاتەی سەلەف تێیدا بوون نەك ئەم واقع و سەردەم و ولاتانە.

بسم الله الرحمن الرحيم

**ئیمامی عبدالرحمن بن مهدی** رحمه الله وەسیەت دەکات و دەفەرمووی[٢]: (**مَنْ أَرادَ أنْ يصنِّفَ كتاباً، فليبدأ بحديثِ الأعمال بالنيات**)[٣]. واتە : هەرکەسێك ویستی کتابێك بنوسێت ، ئەوا بە فەرموودەی الأعمال بالنيات دەست پێبکات .

ئیمامی البخاري[٤] و مسلم[٥] و أبو داود[٦] ابن ماجة[٧] و الحميدي[٨]و البغوي[٩] و البيهقي[١٠] وغەیری ئەوانیش نقلّیانکردووە لە رێگەی يحيي بن سعيد الأنصاري ، ئەویش لە محمد بن إبراهيم التيمي، ئەویش دەفەرمووێ گوێم لە علقمة بن وقاص الليثي بوو، وتی گوێم لە ئیمامی عمر رضي الله عنه بوو وتاری دەدا فەرمووی گوێم لە پێغەمبـەری خوا بوو ﷺ دەیفەرموو ((**إِنَّمَا الأَعْمَالُ بِالنِّيَّاتِ وَإِنَّ لِكُلِّ امْرِئٍ مَا نَوَى فَمَنْ كَانَتْ هِجْرَتُهُ إِلَى اللَّهِ وَرَسُولِهِ فَهِجْرَتُهُ إِلَى اللَّهِ وَرَسُولِهِ وَمَنْ كَانَتْ هِجْرَتُهُ إِلَى دُنْيَا يُصِيبُهَا أَوْ إِلَى امْرَأَةٍ يَنْكِحُهَا فَهِجْرَتُهُ إِلَى مَا هَاجَرَ إِلَيْهِ**)) . واتە : بەڕاستی کاروکردەوە بە پێی نیەتەکانیەتی، وە بۆ هەموو کارێك نیەتی هەیە، جاهەرکەسێك کۆچی کرد بۆلای الله و رسولـەکەی ﷺ ئەوا بۆلای هیجرەکەی بۆلای الله و پێغەمبەرەکەیەتی ﷺ وە ئەوەی هیجرەتەکەی بۆلای دونیایە تاکو بە دەستی

---

[٢]ئیمام و پێشەوا عبدالرحمن بن مهدی بن حسان العنبری ، ساڵی (١٩٨هـ) وەفاتی کردووە ، یەکێکە لە زانایانی سەلەف .

[٣]طرح التثريب في شرح التقريب لإمام العراقي : ٢٣/١ – والنووي في (صلى الله عليه وسلم) شرح صحيح مسلم (صلى الله عليه وسلم) ٤٨/٧.

[٤]صحيح البخاري / ر.١

[٥]صحيح مسلم / ر. ١٩٠٧

[٦]سنن ابوداود / ر. ٢٢٠١

[٧] سنن ابن ماجة / ر. ٤٢٢٧

[٨]مسند الحميدي /ر. ٢٨

[٩]شرح السنة / ر. ٢٠٦

[١٠]السنن الكبرى / ر. ١٨٤

بهێنێت یان ئافرەتێك تاكو مارەی بكات ، ئەوا هیجرەتەكەی بۆلای ئەو شتەیە كە هیجرەتی بۆلا كردووە . واتە : چاوەڕێی پاداشتی الله نەبێت.

ئەم فەرموودەیە هەموو ڕاوییەكان تفرّدیان پێكردووە ، بەڵام لە دوای یحیی بە سەدەها ڕاوی نقلّیانكردووە ، وە ئەم فەرموودەیە بە اتفاقی محدثین صحیحة[11] .

وە هەمان فەرموودە هاتووە لە ئیمامی أبی سعید الخدري ﷺ بە مرفوعی بە غەیری ڕێگاكەی یحیی بۆ ئیمام عمر ﷺ ، هەروەكو الحافظ أبو نعیم الأصبهاني[12] وە ابن عساكر[13] ڕیوایەتیان كردووە لە ڕێگەی (نوح بن حبیب لە ابن ابی رواد لە مالیكەوە لە زەیدی كوڕی ئەسلەمەوە لە عطائي كوڕی سائیبەوە لە أبی سعید الخدری) بە مرفوعی، بەڵام سەنەدەكەی لاوازە، وە هەمان فەرموودە ڕیوایەتكراوە لە أبوهریرة و علی و ئەنەس ﷺ بەڵام هەمووی لاوازە، تاكە ڕێگەی بەهێز فەرموودەكەی ئیمامی عمرە، هەروەكو ئیمامی علی بن المدیـني والترمذي وإبن رجب والحافظ العراقي دەفەرموون[14].

و زانایان وەصفێكی جیاوازیان بۆ ئەم فەرموودەیە كردووە ، وە زۆرێك لە زانایان كردوویانە بە پێشەكی بۆ كتابەكانیان ، وە بە سێیەكی عیلـم ناویان هێناوە.

**ئیمامی شافعی** ﷬ دەفەرمووێ سێیەكی عیلـمە و (٧٠) بابەتی فیقهی لەخۆ دەگرێت[15].

**وە ئیمامی أحمد** ﷬ فەرموویەتی ئەصڵی دین سێ فەرموودەیە ، یەكێك

---

[11] ئیمامی البغوي وة العراقي وة ابن رجب الحنبلي و العلوان وە غەیری ئەوانیش إتفاقی محدثین نقلّ دەكەن لەسەر تصحیحی ئەم فەرموودەیە.

[12] الحلیةالأولیاء : ٣٤٢/٦

[13] تاریخ دمشق: ١٧٩/٦٥–١٨٠

[14] جامع العلوم والحكم : ١٨ – التقیید الإیضاح : ١٠١ – وطرح التثریب : ٣/٢

[15] أخرجه البیهقي في السنن الكبرى ١٤/٢. وذكره النووي في المجموع ١٦٩/١ وفي شرح صحیح مسلم ٤٨/٧،والعراقي في طرح التثریب ٥/٢،وابن حجر في الفتح ١٤/١.

لەوانە ئەم فەرموودەیە باس دەکات[١٦] .

**وە ئیمامی إسحاق بن راهویە** رحمه الله باسی چوار فەرموودە دەکات ودەفەرمووێ ئەوانە بنچینەی دینن، یەك لەو فەرموودانە ئەم فەرموودەیە باسمانکرد[١٧] (**إنما الأعمال بالنیات**). ئەمیش لەبەر ئەوەی پەیوەندی ڕاستەوخۆی بە قبوڵ بوونی عیبادەتەکانەوە هەیە ، إخلاص و تەوحیدی بەندە دەردەخات ، خۆ ئەگەر کەسێك هەموو کارێکی چاك ئەنجام بدات و مەبەستی غەیری الله تعالی بێت ئەوا هەرگیز الله لێی قبوڵ ناکات ، بەڵکو لەسەریشی تاوانبار دەبێـت و تووشی گەورەترین جەریمەت دەبێت کە شیرکە . بۆیـە داواکارم لـە الله تعالی نیەتمان خالـص بکات و منەتی خۆی بڕژێنێت بەسەرماندا و مخلصمان بکات بۆ خۆی.آمین

**پاشان**: لە ڕۆژگارێکدا دەژین کە حاکمیەتی الله تعالی لە بـیرکراوە و لەسەر ئەرزی واقعیش تعطیل کراوە، خەڵکی هۆکاری دابەزینی قورئانیان لە بـیرکردووە، وادەزانن تەنها بۆ خوێندنەوە و ڕازاندنەوەی دەنگەکانیان پێی هاتۆتە خوارەوە ، بـیئاگا لەوەی کە الله تعالی ئەم قورئانەی ناردۆتە خوارەوە کە ببـیتە بەرنامەی ژیان، وە بەندەکان کاری پێبکەن و گوێڕایەڵی بکەن ، هەروەکو الله تعالی دەفەرمووێ ﴿**شَهْرُ رَمَضَانَ الَّذِي أُنْزِلَ فِيهِ الْقُرْآنُ هُدًى لِلنَّاسِ وَبَـيِنَاتٍ مِنَ الْهُدَى وَالْفُرْقَانِ**﴾[١٨] واتە : مانگی ڕەمەزان ئەو مانگە پڕ خەیر و بەرەکەتەیە کە خوای تعالی تێیدا قورئانی ناردە خوارەوە، ئەو قورئانەی کە ڕێنیشاندەرە بۆ خەڵکی و بەرنامەی ژیانە ، وە جیاکەرەوەیە لە نێوان حەق و باطـــڵدا.

وە هەروەها فەرموویەتی : ﴿**إِنَّ هَذَا الْقُرْآنَ يَهْدِي لِلَّتِي هِيَ أَقْوَمُ وَيُبَشِّرُ الْمُؤْمِنِينَ الَّذِينَ يَعْمَلُونَ الصَّالِحَاتِ أَنَّ لَهُمْ أَجْرًا كَبِيرًا**﴾[١٩]. واتە بەڕاستی ئەم قورئان ڕێنیشان

---

[١٦]طرحالتثريب ٢/٥،والفتح ١/١٥.

[١٧]جامع العلوم والحكم لإمام ابن رجب الحنبلي / ١٩

[١٨](سورة البقرة / ١٨٥)

[١٩] (سورة الإسراء / ٩)

دەدات بۆ ڕێگایەك كە تەواوترینی ڕێگا و بەرنامەكانە ، وە مژدەیش بەو بڕوادارانە دەدات كە كاروكردەوەی چاك ئەنجام دەدەن ، كە پاداشتێكی گەورەیان بۆ هەیە.

ئەو قورئانەی كە الله ﷻ كەسانێكی پێكرد بە خاوەن عیززەت و كەسانێكیشی پێ سەرشۆڕكرد، هەڵگرانی بوون بە خاوەن و سەرداری سەر ڕووی زەوی ، مەشریق و مەغریبی سەر ڕووی زەوی بۆ فەتح كردن و كافرانی بۆ لەناوبردن.بەڵام ئەمڕۆ هۆكاری دابەزینی ئەم قورئانە لەبیركراوە ، ئەوەی ماوە تەنها خوێندەوەی پیتەكانە بەبێ جێبەجێ كردنی فەرمانەكانی لە دەوڵەتداری و حوكمڕانیدا ، ئەمیش تەنها یەك هۆكاری هەیە : ئەویش بێگومان پشت كردنی موسڵمانان خۆیانە لەو قورئانە ، بۆیە كافران زاڵبوونە بەسەرماندا و ئەوان ئێستا خاوەن حوكمن بەسەرمانەوە و یاسای ئەوان خراوەتە پێش یاسای پەروەردگارمانەوە ، بێگومان ئەمیش تاقیكرنەوەیە بۆ موسڵمانان ، ئاخۆ كێ واز لەو دین و بەرنامەیە ناهێنێت و كێیش بۆ پول و پارەی دونیا یان بۆ كورسی كوفرلەمان واز لەم بەرنامەیە دەهێنێت و شوێنی ئەو دەستور و یاسایە دەكەوێت كە كافران بۆی داناوین؟ ' وە بەجوانی نیشان دەدەن و لەو خەڵكە عەوامەیشی دەكەن بەدین ! ،ئەمڕۆیش بە چاوی خۆمان دەبینین زۆرینەی هەرەزۆری ئەوانەی خۆیشیان بە موسڵمان دەزانن لەم تاقیكردنەوەیە شكستیان هێنا و بەوشێوازە نەبوون كە الله تعالى داوای لێكردبووین كە وابین، بەڵكو كەوتنە گەورەترین تاوانەوە كە شیركە .!

**كەواتە**: با من و تۆ لەم تاقیكردنەوەیە سەركەوتوو بین، فیترەتی خۆمان لەدەست نەدەین، دینەكەمان بە كاكیلەمان بگرین ، خۆمان بكەین بە خزمەتكاری دین و گەڕانەوەی ئەو بەرنامە پاكە بۆ سەر حوكم .

ئەمیش بە چەند خاڵێك دێتە جێ :

**یەکەم**: پاککردنەوی دڵ و دەرون و عەقیدەمان، وە بڕواهێنانێکی تەواوەتی بە تەوحید و کارکردن پێی .

**دووەم**: بانگەوازی خەڵك بۆ ئەم ئامانجە وهەوڵدان بۆ گەڕاندنەوەی وئارامگرتن لـەسەری.

ئەگەر ئەمەمان کرد ئەوا خوای تعالى خۆی سەرمان دەخات . هەروەکو خۆی (سبحانه وتعالى) هەواڵی پێداوین کە هەرکاتێك موسڵمانان دەستیان بە کتابەکەی الله (سبحانه وتعالى) گرت و کردیان بە بەرنامەی ژیانیان و کاریانپێکرد ، ئەوا خوای تعالى سەریان دەخات ، خوای تعالى دەفەرمووێ : ﴿وَجَعَلْنَا مِنْهُمْ أَئِمَّةً يَهْدُونَ بِأَمْرِنَا لَمَّا صَبَرُوا وَكَانُوا بِآيَاتِنَا يُوقِنُونَ﴾[20]. واتە لـە نێوانیاندا کەسانێکمان کرد بە پێشەوا، ئەوانە خەڵکیان ڕێنمووی دەکرد بە فەرمان و بەرنامەکەی ئێمە و لـەو نارەحەتیانەی کە دەهاتە ڕێیان ئارامیان دەگرت، وە یەقینیان بەو فەرمانانە هەبوو ، وەهەروەها فەرموویەتی ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا إِنْ تَنْصُرُوا اللَّهَ يَنْصُرْكُمْ﴾[21]. واتە : ئەگەر بڕواداران ئەگەر الله تعالى و دینەکەی سەربخەن ، ئەوا الله ـیش سەرتان دەخات .

بەڵام ئەمڕۆ شتێکی سەیر دەبـینین :کەسانێك بەناوی دینیشەوە هەوڵ بۆ بچووککردنەوەی بابەتی حاکمیەت دەدەن و هەوڵ دەدرێت بە بابەتێکی فەرعی و فیقهی نیشان بدرێت وە بە شێوازێك کە جێگای خیلاف و مشتومڕە ، بـیئاگا لـەوەی کە حاکمیەت پەیوەندی ڕاستەوخۆی بە ئەصڵی دینەوە هەیەوە بەشێکە لـە تەوحید ، وە بە لادانی کافربوونی خاوەنەکەی بە دوادا دێت کە دواتر الله ﷻ هاوکار بـیت ڕوون دەکرێتەوە.

بۆیشە وەکو واجبـێکی سەرشانم بڕیارمدا بە پێی توانا چەند لاپەڕەیەك لـەم

---

[20] (سورة السجدة / ٢٤)

[21] (سورة محمد /٧)

بابەتە بنوسم و خەڵگی لێئاگادار بکەمەوە ، ئەمیش لەبەر هەژاری کتێبخانەی کوردی لەم بوارەدا وکەمی نوسراو لەم بوارە گرنگەدا بە زمانی کوردی ، وە هەروەها گرتن و بێدەنگکردنی مامۆستا و زانایانمان کە بۆتە هۆی ئەوەی کە بانگەوازەکە تەواو کاڵ بێتەوە و تاڕاددەیەك کپ بێت ، بۆیە ئەمەیش پاڵنەرێکی تر بوو، وە کەسانێك بەناوی جۆراوجۆر کار لەسەر بچوك کردنەوەی بابەتەکە دەکەن، بۆیــە بە ئەرکم بینی کە هەڵسم بەم کارە ، الله تعالى بـیکات بە هۆکاری لێخۆش بوون بۆ من و سوودێکیش بۆ موسڵمانانی کوردزمان، وە بـێدارکردنەوەیەکیش بۆ ئەوانەی کە خۆیان دەدەنە پاڵ ئیسلام و ئیسلامیش لێیان بەرییە ،کە ئەم بابەتەیان لە یادکردووە و وازیان لە بەرنامە پاکەکەی ئیسلام هێناوە ، بـــەڵکو بوون بە شوێنکەوتەی یاسادەستکردەکان و بەرنامـە کـوفرییە ئەوروپی و ئەمەریکیەکان .

داوای کۆمەك و هاوکاری لە الله تعالى دەکەم .

براتان : إبراهيم عمر

## سەبارەت بەوەی هاتووە لە وتەی الله تعالى وپێغەمبەرەكەی (صلى الله عليه وسلم) سەبارەت بە وەحدانیەتی الله لە حوكمدا

الله تعالى لـە زۆر شوێن لـە قورئاندا ئەوەمان بۆ ڕوندەكاتەوە كە حوكمڕانی تەنها بۆ الله ــیە وە هەركەسێك دان بەمەدا نەنێت ئەوا ئەو ئیسلامەی نەگرتۆتەبەر كە الله (جل و علا) فەرمانی پێكردووین ملكەچی بـیین ، ئێمەیش بە كورتی بەشێك لـەو ئایەتانە نقلدەكەین :

الله تعالى دەفەرمووێ : ﴿إِنِ الْحُكْمُ إِلَّا لِلَّهِ أَمَرَ أَلَّا تَعْبُدُوا إِلَّا إِيَّاهُ ذَلِكَ الدِّينُ الْقَيِّمُ وَلَكِنَّ أَكْثَرَ النَّاسِ لَا يَعْلَمُونَ﴾[22] . واتە بەڕاستی حوكم نیــە ئیللا بۆ الله نەبـیت ، ئەم حاكمی بـیشەریكە فەرمانی كردووە كە غەیری ئەو نەپەرستین و غەیری ئەو بە حاكم قبولْ نەكەین ، ئائەوە دینی ڕاست و دروستە ، بەڵام زۆرینەی خەڵك لـێی بـێئاگان .

**كەواتە**: دینی ڕاست و دروست ئەوەیە كە تەنها بە حاكمیەتی الله ڕازی بیت و بیشی پەرستیت ، وە گەڕانەوەی حوكمیش خۆی لـە خۆیدا عیبادەتە وەكو ڕوونی دەكەیـنەوە .

## ئایا گەڕانەوەی حوكم بۆلای الله عیبادەتە ؟

بـێگومان بەڵێ، بەڵكو لـە گەورەترین پەرستشەكانە، سەرەتا پێویستــە بزانین عیبادەت چیە ؟ ، هەر **كارێك یان وتەیەك الله تعالى پێی خۆش بـیت عیبادەتە** كە دواتر زیاتر ڕوونی دەكەینەوە، **هەر عیبادەتێكیش بۆ غەیری الله بكرێت شیركـە** .

گەڕانەوەی حوكمیش بۆلای الله عیبادەتە چونكە الله تعالى پێی خۆشە حوكمی بۆلا بگەڕێنینەوە وە فەرمانی پێكردووین بەو كارە ، مادام عیبادەتە كەواتە ئەگەر حوكم بۆ غەیری الله تعالى گەڕێنرایەوە ئەوا شیركـە.

دواتر الله تعالى فەرمووی ﴿**ذالك الدين القيم**﴾[23] . واتە : ئەمە دینە ڕاست و

---

[22] سورة يوسف / ٤٠

[23] سورة يوسف / ٤٠

دروستەکەیە، خۆ ئەگەر نەتکرد ئەوا ئەو دینەت وێلکردووە و سەرئجامت ترسناکە .

وە هەروەها الله تعالى فەرموویەتی : ﴿ثُمَّ رُدُّوا إِلَى اللَّهِ مَوْلَاهُمُ الْحَقِّ أَلَا لَهُ الْحُكْمُ وَهُوَ أَسْرَعُ الْحَاسِبِينَ﴾[24] . واتە : پاشان دەگەڕێنرێنەوە بۆلای الله کە پەرستراوی بە حەقتان، بزانن کە حوکم تەنها بۆ ئەوە (جل و علا) ، وە الله تعالى لێپرسینەوەی خێراترە لە هەموو کەس.

وە هاتووە لە رسول الله ﷺ هەروەکو أبوداود[25] و بوخاری لە (الأدب المفرد)[26] و النسائی[27] و البیهقی[28] و غەیری ئەوانیش ڕیوایەتیان کردووە کە پێغەمبەری خوا فەرموویەتی : (إن الله هو الحكم و إليه الحكم) . واتە الله تعالى خۆی حاکمە و حوکمیش هەربۆلای خۆی دەبرێتەوە . واتە : تەنها ئەو شایەنی بردنەوەی حوکمە، (وە سەنەدەکەی بەهێزە).

**گوتم**: بزانە الله تعالى هیدایەتی من و تۆیش بدات کە ئیسلامەتی هیچ کەسێك دانامەزرێت ئیللا بە ئەداکردن وچەسپاندنی ئەم فەرموودەیە نەبێت لە دڵ و کاروکردەوەیشیدا ، پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) فەرمووی (**الله خۆی حاکمە**) ، ئەمە پەیوەندی دارە بە هەردوو تەوحیدی ڕوبوبیەت و أسماء و صفاتەوە وە پێویستە لە دڵماندا ئەوە بچەسپێنین کە الله (جل و علا) تەنها خۆی حاکمە .

**پاشان فەرمووی** : (**وە حوکمیش بۆلای ئەو دەبرێتەوە**) ئەم خاڵەیە کەمترین کەس تێیدا بە سەلامەتی ڕزگاری دەبێت ، چونکە ئەمەیان پێویستی تەنها بە

---

[24] سورة الأنعام / ٦٢

[25] سنن أبـي داود لإمام أبو داود السِّجِستْاني : ب٤ / ل٢٨٩

[26] لأدب المفرد لإمام أبو عبد الله البخاري / ل ٣٧٢ .

[27] المجتبى من السنن السنن الصغرى للنسائي لإمام النسائي (المتوفى: ٣٠٣هـ) : ب٨/ ل٢٢٨

[28] السنن الصغير للبيهقي لإمام أبو بكر البيهقي (المتوفى: ٤٥٨هـ) : ب٤/ل١٣٧

چەسپاندی بابەتەکە نیــە لـە دڵدا ، بەڵکو کاروکردەوە کە بـیسەلمێنیت ، زۆرن ئەو کەسانەی کە بڕوایان بەوە هەیە کە تەنها الله خۆی شایەنی حوکمڕانیــە ، بەڵام لـەگەڵ ئەوەیشدا حوکم بۆلای تاغوتان دەبەنەوە و بە حوکمی ئەوانیش ڕازیـن و سەریان دەخەن ، ئەمە شیرکە لـە تەوحیدی ئلوهیەتدا و هەڵوەشێنەرەوەی ئەو تەوحیدەیە ، چونکـە گەڕانەوەی حوکم بۆلای الله وجێبەجێ کردن و تەواوکاریە لە تەوحیدی ئلوهیــەت ، خۆ ئەگەر ئەو حوکمە بۆلای غەیری الله برایەوە ئەوا شیرکە و خەسارۆمەندی بۆ خاوەنەکەی دێنێتەجێ.

## سەبارەت بەوەی هاتووە لە وتەکانی الله تعالی لە فەرمانکردن بە هەموو خەڵکی کە تەنها بە حوکمی الله تعالی ڕازی بن

### یەکەم: فەرمان بە پێغەمبەر ﷺ

الله تعالی فەرمان بە پێغەمبــەرەکەی ﷺ دەکات و دەفەرمووێ ﴿فَاحْكُمْ بـينَهُمْ بِمَا أَنْزَلَ اللَّهُ وَلَا تَتَّبِعْ أَهْوَاءَهُمْ عَمَّا جَاءَكَ مِنَ الْحَقِّ﴾[29] . واتە : ئەی محمد ﷺ حوکم لـە نێوانیاندا بکـە بەو کتابــەی الله تعالی بۆی ناردووی و شوێنی هەواوئارەزووی ئەو خەڵکە نەکەویت لـە کاتێکدا ئەو حەقەت لایــە کە الله ﷻ بۆی ناردووی .

پاشان الله تعالی دووبارە ئاگاداری دەکاتەوە و پێی دەفەرمووێ : ﴿وَأَنِ احْكُمْ بـينَهُمْ بِمَا أَنْزَلَ اللَّهُ وَلَا تَتَّبِعْ أَهْوَاءَهُمْ وَاحْذَرْهُمْ أَنْ يَفْتِنُوكَ عَنْ بَعْضِ مَا أَنْزَلَ اللَّهُ إِلَيْكَ﴾[30] . واتە : ئەی محمـد ﷺ حوکم بو قورئانــە بکــە کە الله بۆی ناردویتە خوارەوە ، نەکەی شوێنی هەواو ئارەزووی یەهوود بکەویت ، وە ئاگاداریان بــە کە تووشی هەڵەت نەکەن و لە بەشێك لـەو حوکمە لات نەدەن کە الله بۆی ناردوویت .

---

[29] سورة المائدة / ٤٨

[30] سورة المائدة / ٤٩

بۆیە ئیمامی ابن أبـی حاتم رَحِمَهُ اللَّهُ ڕیوایەتێك نقلٚ دەكات[٣١] و دەفەرمووێ :

(حدثنا أبـي ، ثنا عمرو الناقد ، ثنا شبابة بن سوار ، عن أبـي بكر الهذلي ، عن عكرمة ، عن ابن عباس ، قال : **إياكم والرأي ، قال الله تعالى لنبـيه : احكم بـينهم بما أراك الله ولم يقل بما رأيت**) . واته : لـه عكرمەوه لـه ابن عباسەوه رَضِيَ اللهُ عَنْهُ كه فەرموویـەتی : (**ئاگاداربن لـه بـیروبۆچوونی خۆتان ، الله تعالى به پێغەمبـەرەكەی ﷺ فەرموو حوكم بەوه بكه كه الله عَزَّ وَجَلَّ داینـاوه و پێی باشـه نەك ئەوەی كه خۆت بەباشی دەبـینیت**).

ئیمامی البـیهقی دەفەرمووێ[٣٢] : (**فإن الحاكم ليس رجلا خص من بـين الناس ، فقيل له : احكم بما شئت ، فإن هذا لم يكن لملك مقرب ولانبـي مرسل**). واته حاكم كەسێكی تایبەتكراو نیـه تاكو چی بـیەوی بـیكات لـەنیوخەڵكدا كه پێی بگوترێ چۆن دەتەوێ حوكم بكه ، ئائەمه بۆ فریشتەیەكی نزیكی الله یان بۆ هیچ پێغەمبەرێكیش ڕێگه پێدراو نیه.

وه هەروەها الله تعالى وەڵامی ئەو كافر و بەكرێگیراوانه دەداتەوه كه دەڵێن ئیسلام تەنها بۆ پەیوەندی نێوان خۆت وخوایـه و پەیوەندی به دەوڵەت و سیاسەت نیـه، نەخێر الله تعالى محمدی كوڕی عبداللە ـی بەنده و پێغەمبەری نارد ﷺ تاكو حوكم بكات و دەوڵەت دروست بكات ، الله تعالى پێی فەرمووه : ﴿**إِنَّا أَنْزَلْنَا إِلَيْكَ الْكِتَابَ بِالْحَقِّ لِتَحْكُمَ بَـيْنَ النَّاسِ بِمَا أَرَاكَ اللَّهُ وَلَا تَكُنْ لِلْخَائِنِينَ خَصِيمًا**﴾[٣٣] . واته : ئەی محمد ئێمه كتابـیكمان بۆ ناردی (كه قورئانه) كه هەرمووی حەق و ڕاستیه ،تاكو لـه نێوان خەڵكی حوكمی پێبكەیت بەو شێوازەی الله عَزَّ وَجَلَّ بۆی دەسنیشانكردووی ، نەكەی لایەنگیری ناپاكان بكەیت .

بـینه الله تعالى لـه من و تۆیش خۆش بـیـت : الله تعالى ئەم كتابەی نەناردووه

---

[٣١] تفسير القرآن العظيم مسندا عن رسول الله و صحابة و التابعين لإمام ابن أبـي حاتم / ر.٥٩٢٨

[٣٢] شعب الإيمان لإمام أبو بكر البـيهقي (المتوفى: ٤٥٨هـ) : ب ١٠ / لا ٣١

[٣٣] سورة النساء / ١٠٥

تەنها بۆ هەندێك بابەتی فیقهی و فەرعی، لـە قوماشی سەوزدا هەڵگیرێت و ماچی بکرێت ، نەخێر هەرگیز : الله تعالی قورئانی نارد تاکو ببیــت بە پێشەنگی خەڵك لـە عەقیدە و حوکم، وە حوکمی بڕیاری هەموو دونیا بەم کتابــە بکرێــت، وە دەوڵەتی لـەسەر دروست بکرێت و جەیش و هێزی هەبــیت ، ڕووڕەشی بۆ کافر و بەناو بانگخوزانی دین کە شەو و ڕۆژیانخستۆتە سەر یەك بۆ پاراستنی تاغوتان و کردنی دینەکەیان بە سەرخەری زوڵم و کوفریان دەرهەق بە دین و موسڵمانان .

وە هەروەها ﷻ فـەرموویـەتی : ﴿وَإِنْ حَكَمْتَ فَاحْكُمْ بَينَهُمْ بِالْقِسْطِ إِنَّ اللَّهَ يُحِبُّ الْمُقْسِطِينَ﴾[34] ، واتە : ئەی محمد (صلی الله علیه وسلم) ئەگەر حوکمت لـە نێوانیانکرد ئەوا حوکم بکە بە دادپەروەری ، بەڕاستی الله ﷻ دادپەروەرانی خۆش دەوێ .

## محمد ﷺ بۆی ڕەوا نیە بە ئارەزووی خۆی حوکم بکات و واز لە قورئان بهێنێ ، ئەگەر نا بە ئاگادارکردنەوەیەکی ترسناك ئاگادار کراوەتەوە !

الله تعالی دەفەرمووێ : ﴿لَيْسَ لَكَ مِنَ الْأَمْرِ شَيْءٌ﴾[35]. واتە : ئەی محمد (صلی الله علیه وسلـم) هیچ فەرمانێك بۆ تۆ نیە لـە خۆتەوە دەربارەی قوڕەیش بـیدەیت .

وە هەروەها ئاگاداریەکی ترسێنەریشی پێدەدات کە ئاگاداربـیت لـەو حوکمەی الله ﷻ لانەدات، الله تعالی فەرموویەتی ﴿وَكَذَلِكَ أَنْزَلْنَاهُ حُكْمًا عَرَبِيا وَلَئِنِ اتَّبَعْتَ أَهْوَاءَهُمْ بَعْدَمَا جَاءَكَ مِنَ الْعِلْمِ مَا لَكَ مِنَ اللَّهِ مِنْ وَلِيٍّ وَلَا وَاقٍ﴾[36] . واتە : بەهەمان شێوە حوکمێکمان بۆ ناردووی ئەی محمد ﷺ ، **خۆئەگەر هاتوو شوێنی هەواو ئارەزووی خەڵك کەوتیت لـە دوای ئەوەی کە ئەو عیلـم و حەقەت بۆ نێردراوە ، ئەوا هیچ کەسێك نیە پەنات بدات لـە سزای الله !** .

---

[34] سورة المائدة / ٤٢

[35] سورة ال عمران / ١٢٨

[36] سورة الرعد / ٣٧

وە الله تعالى دەربارەی قورئان و شەریعەتەکەی دەفەرمووێ ﴿**تَنْزِيلٌ مِنْ رَبِّ الْعَالَمِينَ (٤٣) وَلَوْ تَقَوَّلَ عَلَيْنَابَعْضَ الْأَقَاوِيلِ (٤٤) لَأَخَذْنَا مِنْهُ بِالْيَمِينِ (٤٥) ثُمَّ لَقَطَعْنَا مِنْهُ الْوَتِينَ**﴾[٣٧] . واتە : ئەم قورئانە وتەی الله تعالى ــە و لەلایەن ئەوەوە (سبحانە وتعالى) دابەزیوە ، **خۆ ئەگەر محمد ﷺ شتانێکی بوتایە لە غەیری ئەوەی ئێمە بۆیمان نارد ، ئەوا بە دەستی ڕاستی خۆمان دەمگرت و شادەماری دڵیمان دەپچڕی !** .

وە الله تعالى دیسان ﷺ و هاوەڵانی ئاگادار دەکاتەوە و پێیان دەفەرمووێ ﴿**وَلَا تَأْكُلُوا مِمَّا لَمْ يُذْكَرِ اسْمُ اللَّهِ عَلَيْهِ وَإِنَّهُ لَفِسْقٌ وَإِنَّ الشَّيَاطِينَ لَيُوحُونَ إِلَى أَوْلِيَائِهِمْ لِيُجَادِلُوكُمْ وَإِنْ أَطَعْتُمُوهُمْ إِنَّكُمْ لَمُشْرِكُونَ**﴾[٣٨]. واتە : ئەی **محمد** ﷺ ئەی بڕواداران سەربڕاوێك مەخۆن کە ناوی الله ــی ﷻ لەسەر نەهێنرا ، چونکە ئەوە فیسقە، واتە تاوانێکی گەورەیە، وە شەیتانەکان وەحیە پیسەکانیان دەنێرن بۆ ئەولیاکانی خۆیان و تا بــێن و موجادەلەتان لەگەڵ بکەن ، خۆ ئەگەر بە گوێی ئەوانتان کرد ئەوا ئێوە لە موشریکانن .

**گوتم**: ئەم ئایەتە پیرۆزە بــێگومان بۆ پێغەمبــەری خوا ﷺ و هاوەڵان دابەزی پاشان بۆ دواتر، بەڵام گومان لەوە نیە کە رسول الله مەعصومە وتووشی ئەو کوفرە نابێ، بۆیە لێرە بۆمان دەردەکەوێ کە الله دەیەوێ بەو ئاگادارکردنەوە ترسناکە پێمان بفەرمووێ گەر رسول ــەکەم ئاوا ئاگاداربکردبێتەوە ئەوا ئێوە لە پێشتر تا تووشی ئەو کارە بن، ئەگەر هاتوو شوێنی وتەی کافران کەوتن و وازتان لەوەی الله تعالى هێنا ئەگەر چی لە بابەتێکیش بــیت ، ئەوا پێی دەبن بە موشریك، هەرچەندە پێشتر لەلای الله ﷻ خۆشەویست بوبــیتن .[٣٩]

کەواتە وەیل و تیاچوون بۆ ئەوەی پشتی لە حوکمی الله کردووە ،وەیل و

---

[٣٧] سورة الحاقة / ٤٣ – ٤٦

[٣٨] سورة الأنعام / ١٢١

[٣٩] دواتر ان شاءالله بە تفصیلی لەسەر ئایەتەکە دەوەستین .

نەهامەتی بۆ تاغوت و ملوڕانی ئەمڕۆ کە بەو شێوازە وازیان لە بەرنامەکەی الله تعالی هێناوە .

## دووەم : فەرمان بە پێغەمبەرانی پێشویش کرابوو کە تەنها بەوە حوکم بکەن بەوە کە الله تعالی بۆی ناردوون :

الله تعالی پێغەمبەرانی ناردووە تاکو لەگەڵ گەیاندنی پەیامەکانی الله ـدا حوکمیش بکەن و حوکمی الله ـیش بگەیەنن بە خەڵك، الله ﷻ دەفەرمووێ : ﴿كَانَ النَّاسُ أُمَّةً وَاحِدَةً فَبَعَثَ اللَّهُ النبيين مُبَشِّرِينَ وَمُنْذِرِينَ وَأَنْزَلَ مَعَهُمُ الْكِتَابَ بِالْحَقِّ لِيَحْكُمَ بين النَّاسِ فِيمَا اخْتَلَفُوا فِيهِ﴾[40] . واتە : پێش ئەوەی شیرك لە ناو نەوەکانی ئادەم بڵاوبیتەوە خەڵك هەمووی یەك ئوممەت بوون موەحید بوون، لە دوای ئەوەی شیرك لەنێوانیاندا بڵاو بۆیەوە الله تعالی پێغەمبەرانی بۆ ناردن و وازی لێنەهێنان کە بەرەو ئاگر بڕۆن ، جا ئەم پێغەمبەرانە (علیهم السلام) هاتن و مژدەیاندا بەو کەسنەی کە شوێنی تەوحید دەکەون و هەڕەشەی ترسێنەریشی لەو کەسانەکرد کە پشتیان لە تەوحید کرد، لەگەڵ ئەم پەیامەدا الله تعالی کتابیشی لەگەڵ ناردن **تاکو ئەم پێغەمبەرانە حوکمی پێبکەن و خەڵکیش بۆ ئەو حوکمە بگەڕێنەوە** لەو بابەتانەی کە جیاوازیان بۆ دروست دەبێت نەك بگەڕێنەوە بۆلای تاغوتان بۆ حوکم.

وە هەروەها فەرموویەتی : ﴿مَا كَانَ لِبَشَرٍ أَنْ يُؤْتِيَهُ اللَّهُ الْكِتَابَ وَالْحُكْمَ وَالنُّبُوَّةَ ثُمَّ يَقُولَ لِلنَّاسِ كُونُوا عِبَادًا لِي مِنْ دُونِ اللَّهِ وَلَكِنْ كُونُوا رَبَّانِيِّينَ بِمَا كُنْتُمْ تُعَلِّمُونَ الْكِتَابَ وَبِمَا كُنْتُمْ تَدْرُسُونَ﴾[41] . واتە ناگونجێت بۆ مرۆڤێك کە الله تعالی کتابی پێبەخشیبێت و کردبیتی بە حاکم و دەسەڵاتدار و پێغەمبەرایەتی پێبەخشیبێت ، پاشان بچێت و بە خەڵك بڵێت ببن بە بەندەی من لە غەیری الله تعالی ، بەڵکو

[40] سورة البقرة / ٢١٣

[41] سورة آل عمران / ٧٩

فەرموویانە ببن بە ڕەبّانی و بۆ خوا صوڵحاو و تەنها الله ﷻ بپەرستن ئەمیشیان بەو کتاب و زانستە دەکرد کە الله بۆی ناردبوون .

وە هەروەها الله تعالی دیسان باسی پێغەمبەران دەکات کە حوکمیان بۆ خەڵك هێناوە لەگەڵ دینەکەدا وە بە حوکمی غەیری الله ڕازی نابوون فەرموویەتی : ﴿أُولَئِكَ الَّذِينَ آتَيْنَاهُمُ الْكِتَابَ وَالْحُكْمَ وَالنُّبُوَّةَ فَإِنْ يَكْفُرْ بِهَا هَؤُلَاءِ فَقَدْ وَكَّلْنَا بِهَا قَوْمًا لَيْسُوا بِهَا بِكَافِرِينَ﴾[٤٢] . واتە : ئائەوانەی کە کتاب و حوکم و پێغەمبەراییەتیمان پێدان خۆ ئەگەر گێل و نەفامەکانیش شوێنیان نەکەون ، ئەوا کەسانێك هەن کە ژیرن و کافر نین دژی ئەو پێغەمبەرانە ناکەن .

## پێغەمبەرانی بنی إسرائیل (علیهم السلام)

الله تعالی فەرموویەتی : ﴿إِنَّا أَنْزَلْنَا التَّوْرَاةَ فِيهَا هُدًى وَنُورٌ يَحْكُمُ بِهَا النبيونَ الَّذِينَ أَسْلَمُوا لِلَّذِينَ هَادُوا﴾[٤٣] . واتە : ئێمە تەوراتمان ناردە خوارەوە ڕێنمویی و ڕوناکی تێدابوو ، ئەو پێغەمبەرانەی کە هەمیشە مل کەچ بوون بۆ الله حوکمیان پێکردووە لەنێوان خەڵکەکە ئەوەی الله هیدایەتی دابوو لە بنی ئیسرائیل .

وە هەروەها فەرموویەتی : ﴿وَلَقَدْ آتَيْنَا بَنِي إِسْرَائِيلَ الْكِتَابَ وَالْحُكْمَ وَالنُّبُوَّةَ وَرَزَقْنَاهُمْ مِنَ الطَّيِّبَاتِ وَفَضَّلْنَاهُمْ عَلَى الْعَالَمِينَ﴾[٤٤]. واتە : بەڕاستی ئێمە کتابی ئاسمانی و پێغەمبەرانمان نارد بۆ بنی ئیسرائیل ، وە **حوکمڕانیمان بەو پێغەمبەرانەدا** ، وە لە ڕزقە پاکەکان ڕزقماندان و ئەوانمان هەڵبژارد بە پێشەنگی جیهانیان .

## عیسا (علیه السلام) و قەومەکەی

الله ﷻ فەرمان بە نەصارا دەکات کە حوکم بەو حەقە بکەن کەلە ئینجیلدایە و عیسا (علیه السلام) بۆی بەجێ هێشتوون، الله تعالی دەفەرمووێ : ﴿وَلْيَحْكُمْ

---

[٤٢] سورة الأنعام / ٨٩

[٤٣] سورة المائدة / ٤٤

[٤٤] سورة الجاثية / ١٦

﴿أَهْلُ الْإِنْجِيلِ بِمَا أَنْزَلَ اللَّهُ﴾[45] . واته دەسا با ئەهلی ئینجیلیش حوکم بەو حەقە بکەن کە الله تعالى لە ئینجلیلدا بۆی ناردبوون ، بێگوامان پێغەمبەرانیش سەردەمی خۆیان گوێڕایەڵی فەرمانەکانی خوای تعالى ئەنکردبوو ، کەواتە عیسایش (علیه السلام) حوکمی بە حوکمی الله کردووە کە ئەوکات ئینجیل بووە

## یحیى ی کوڕی زەکەریا (علیهما السلام)

الله تعالى فەرمان بە پێغەمبەر يحيى (علیه السلام) دەکات و دەفەرمووێ : ﴿يَا يَحْيَى خُذِ الْكِتَابَ بِقُوَّةٍ وَآتَيْنَاهُ الْحُكْمَ صَبِيًّا﴾[46] . واتە ئەی يحيى ئەو کتابە (إنجيل) بە توندی بگرە ، وە توانای جیاکردنەوەی حەق وناحەقمان پێ بەخشی و **کردمان بە حاکم و دادوەر لە نێوان خەڵك کە بە ڕێك و باشی حوکمی دەکرد .**

## داود پێغەمبەر (علیه السلام)

الله تعالى فەرمانی بە داود کرد (علیه السلام) کە بەو حەق و ڕاستیە حوکم بکات کە الله تعالى بۆی ناردووە وە دیسان هەڕەشەی تێدایە بۆ ئەو کەسانەی کە پشت دەکەن لە حوکمی الله ﷻ، هەروەکو دەفەرمووێ : ﴿يَا دَاوُودُ إِنَّا جَعَلْنَاكَ خَلِيفَةً فِي الْأَرْضِ فَاحْكُمْ بَيْنَ النَّاسِ بِالْحَقِّ وَلَا تَتَّبِعِ الْهَوَى فَيُضِلَّكَ عَنْ سَبِيلِ اللَّهِ إِنَّ الَّذِينَ يَضِلُّونَ عَنْ سَبِيلِ اللَّهِ لَهُمْ عَذَابٌ شَدِيدٌ بِمَا نَسُوا يَوْمَ الْحِسَابِ﴾[47] .

واتە : **ئەی داوود ئێمە تۆمان کرد بە جێنشین و دەسەڵاتدار ، دەسا تۆیش حوکم بکە لەناو خەڵکیدا بەو حەقە بکە کە بۆت هاتووە ، وەنەکەی شوێنی هەواوئارەزوو بکەویت ، چونکە گومڕات دەکات لەو ڕێیە ڕاستەی الله بۆی داناوی** ، جا باش بزانە ئەوانەی کە ئەو ڕێگا ڕاستەیان وێڵکرد کە الله ﷺ بۆی دانابوون ئەوا سزایەکی بە هێزیان بۆ هەیە بەهۆی ئەوەی پشتیانکرد لە حوکمی الله و ئەم ڕۆژەیان لە بیرکرد کە الله تعالى لێیاندەپرسێتەوە .

[45] سورة المائدة / ٤٧
[46] سورة مريم / ١٢
[47] سورة ص / ٢٦

**سێهەم : وەاللە ﷻ فەرمانی بە تێکڕای خەڵك کردووە کە تەنها حوکم بە کتاب و دینەکەی اللە بکەن :**

اللە تعالی فەرمانی کردووە کە هەموو خەڵکیش ئەگەر هاتوو حوکمیاندا ئەوا تەنها حوکم بە کتاب و دینەکەی اللە بکەن ، هەروەکو خۆی (جل و علا) فەرموویەتی : ﴿وَإِذَا حَكَمْتُمْ بَيْنَ النَّاسِ أَنْ تَحْكُمُوا بِالْعَدْلِ﴾[48] . واتە : خۆ ئەگەر حوکمتان لە نێوان خەڵك کرد ئەوا بە یەکسانی حوکم بکەن . هیچ حوکمێکیش وەکو حوکمەکەی اللە تعالی یەکسان نیە و ماف ناگەڕێنێتەوە بۆ خاوەن ماف .

**ئیمامی أبو جعفر الطبري** رحمه الله دەفەرمووێ : **(يأمركم إذا حكمتم بين رعيتكم أن تحكموا بينهم بالعدل والإنصاف، وذلك حكمُ الله الذي أنزله في كتابه، وبينه على لسان رسوله)**[49] . واتە :اللە تعالی فەرمانی پێکردوون ئەگەر لەسەر ئەوانەی لەبەردەستاندایە حوکمتان کرد ئەوا بە دادوەری و وە ویژدانەوە حوکم بکەن ، وە ئەو داودوەریە حوکمی اللە یە کە لە کتابەکەی خۆیاندا ناردوویەتی و لەسەر زای ﷺ ڕوونی کردۆتەوە .

وە اللە تعالی فەرمانی کردووە و فەرموویەتی : ﴿إِنَّ اللَّهَ يَأْمُرُكُمْ أَنْ تُؤَدُّوا الْأَمَانَاتِ إِلَى أَهْلِهَا وَإِذَا حَكَمْتُمْ بَيْنَ النَّاسِ أَنْ تَحْكُمُوا بِالْعَدْلِ﴾[50] . واتە: اللە (جل و علا) فەرمانی پێکردوون ئەی خەڵکینە کە ئەو ئەمانەتیانەی کە لاتان دانراون بگەڕێننەوە بۆلای خاوەنەکانیان وە ئەگەر حوکمتاندا ئەوا حوکم بە عەدل بدەن . عەدلیش تەنها و تەنها حوکمی اللە یە و غەیری حوکمی اللە عەدل نیە.

---

[48] سورة النساء / ٥٨

[49] جامع البيان في تأويل القرآن لإمام أبو جعفر الطبري (المتوفى: ٣١٠هـ) : ب ٤ / لا ٤٩٤

[50] سورة النساء / ٥٨

## * قال الإمام إبن القيم *

والله ما خـو في الذنـوب فإنها ... لعلى طــريق العـفو والغفران

لكنني أخشى انســــلاخ القلب من ... تحكيم هذا الوحي والقرآن

ورضا بآراء الرجــال وخرصها ... لا كان ذاك بـمنة الرحمــن

## الله تعالى ئەو حاكمانەی بە كافر و تاغوت ناوبردووە كە حوكم بۆلای الله ناگەڕێننەوە !

### بەڵگەی یەكەم :

الله تعالى شەریعەتێكی پاك و بـی كەم و كورتی بۆ ڕەوانە كردووین ، وە فەرمانی كردووە كە دەستی پێوە بگرێن و شوێنی بكەوین و بـیكـەینە حاكم لـە نێوان خۆماندا ، وە هەركەسێكیش پشتی لـێبكات ئەوا هیچ پەیوەندی بە ئیمان و ئیسلامەوە نەماوە وە خوای تعالى بە كافری ناوهێناون هەروەكو فەرمووویــە تی ﴿وَمَنْ لَمْ يَحْكُمْ بِمَا أَنْزَلَ اللَّهُ فَأُولَئِكَ هُمُ الْكَافِرُونَ﴾[51]. واتە : جاهەركەسێك حوكم بەوە نەكات كە الله ﷻ دایگرتووە كە بریتیە لـە قورئان ، ئائەوانــە كافرن.

گوتم : ببـینە الله تعالى هیدایەتی من و تۆش بدات الله تعالى حوكمی كافرێتی داوە بەسەر كەسێكیدا كە حوكم بە قورئان نەكات و پشتی لـێبكات ، كوان ئەوانەی وتەی فلاّن و فلاّن دەخەنە پێشی وتەی الله تعالى ، مەگەر الله تعالى فەرمان پێنەكردین كە لـە كاتی كێشە و جیاوازیدا بگەڕێینەوە بۆ قورئان و سوونەت ؟ ، ببـینە الله تعالى ئەو حاكمانە بە كافر ناودەبات كە حوكم بە قورئان ناكەن.

الله تعالى فەرمووی كافرن ، نەیفەرموو ئەوانە كوفریانكردووە ، نەخێر بەڵكو فەرمووی ﴿هم الكافرون﴾ واتە : ئائەوانە كافرن ، خۆ ئەگەر حوكمكردن بە غەیری قورئان كوفری بچوك بوایە ئەوا الله تعالى نایفـەرموو كافرن ، چونكـە بەندە بە كوفری بچوك كافر نابێت و اسمی كافریش لـەسەری ناچەسپێت، بۆیــە هەموو ئەمانە دەرخەری ڕووڕشی خزمەتكارانی تاغوتانن كە شەو و ڕۆژیان خستۆتە سەر یەك تاكو ئەم ئایەتانە تأویل بكەن تاكو خەلیفەكانیان چیان بوێ بـیكەن ، الله تعالى حوكمی كوفری داوە بەسەریاندا ، كەچی ئەم دەڵێت ئیمامی فلاّن و فلاّن فەرموویانە كافر نین ، بەم كارەیان وتەی غەیری الله پێش دەخەن جا بزانن یان نا.

---

[51] سورة المائدة / ٤٤

ئیمامی عبدالله کوڕی عەباس فەرموویـەتی : (**یوشك أن تنزل علیكم حجارة من السماء . أقول قال رسول الله ﷺ وتقولون قال أبوبكر و عمر؟**)[٥٢] واتە : نزیکە بەرد بباریێت بەسەرتاندا .!ئەم هەڕەشەیەی بە هاوەڵـان و تابعین وت باشترینی ئەم ئومەتە ، بۆچی ئەو قسەیە دەکات ؟ چونکە عبدالله دەفەرمووێ : من دەڵـێم پێغەمبــەری خوا ﷺ فەرموویەتی کەچی ئێوە دەڵێن أبوبکر و عمر وایان فەرموو؟؟؟

بـینە ئەگەر بۆ أبوبکر و عمر بەو شێوازە ڕەخنەی گرتبـیت کە قسەکانیان بدرێتە پاڵ قسەی پێغەمبــەری خوا ﷺ ئەی لـەمڕۆبوایە چی دەفەرموو ؟.من دەڵـێم الله تعالی دەفەرمووێ ئائەوانەی حوکم بە قورئان نەکەن کافرن ،کەچی ئەو دەڵـێی نەخێر کافر نین چونکە فلـان و فلـان وادەفەرموون .! سبحان الله لـە گومڕاییەی کە تێیدان .

وە ئەوەی گوایــە ئەمە کوفری بچوکە و ابن عباس فەرموویەتی : ئەمە تەفصیلـەکەی هەڵـدەگرین بۆ دواتر ، بەڵـام ئەوەندە کیفایەتە لێرە بزانیت : کە **ئەگەر هاتوو حاکم لـە دەوڵـەتی ئیسلامیدا حوکم و یاسای وڵـاتی قورئان بوو وە دەستکاری یاساکانی نەکردبوو ، بەڵام هەندێکجار کاری پێنەکرد ، واتە تەنها فعلی بـیت ، ئەمیش حاڵـەت نەك دائیمی ، ئەمە کوفری بچوکە** بەو مەرجەی خۆی لـە چەند خاڵێك بپارێزێت :

**یەکەم**: دەستکاری یاسای وڵـات نەکات و وەکو حاکمانی ئەمڕۆ یاسایەکی تر نەهێنێت .

**دووەم**: کارەکەی خۆی بە حەڵـاڵ نەزانێت .

**سێیەم**: کارەکەی خۆی بە باشتر نەزانێت لـە حوکمەکەی خوای تعالی .

**چوارەم**: نابـیت نکۆڵی لـە حوکمەکەی قورئان بکات .

---

[٥٢] كتاب التوحيد للشيخ محمد بن عبدالوهاب / ١٠٢

ئەگەر خۆی لەم چەند حاڵەتە پاراست ، ئەوا کوفرەکەی کوفری بچوکە، بەڵام ئەگەر هاتوو تووشی یەك حاڵەتیشیان بـیت ئەوا کافرە بە **ئیجماع** وە کوفرەکەی کوفری گەورەیە کە دواتر بۆ هەریەکیان تفصیل باس دەکەین الله ﷻ هاوکارمان بێت.

## بەڵگەی دووهەم

وە الله تعالی حوکمی زاڵمی داوە بەسەر هەرکەسێکدا حوکم بە قورئان نەکات هەروەکو فەرموویەتی ﴿وَمَنْ لَمْ يَحْكُمْ بِمَا أَنْزَلَ اللَّهُ فَأُولَئِكَ هُمُ الظَّالِمُونَ﴾[53] . واتە : جا ئەوانەی حوکم بەو قورئانە ناکەن کە الله تعالی دایگرتووە ئائەوانە ستەمکارن.

## بەڵگەی سێهەم

وە بە فاسقی ناوهێناون هەروەکو فەرموویەتی : ﴿وَمَنْ لَمْ يَحْكُمْ بِمَا أَنْزَلَ اللَّهُ فَأُولَئِكَ هُمُ الْفَاسِقُونَ﴾[54] . واتە ئائەوانەی حوکم بەو قورئانە ناکەن کە الله دیگرتووە ئائەوانە فاسق و سنور بەزێنن.

### تەفسیری ئەم دوو ئایەتە پیرۆزە:

خوای تعالی دەفەرمووێ ﴿وَمَنْ لَمْ يَحْكُمْ بِمَا أَنْزَلَ اللَّهُ فَأُولَئِكَ هُمُ الظَّالِمُونَ﴾[55]. واتە : جا ئەوانەی حوکم بەو قورئانە ناکەن کە الله تعالی دایگرتووە ئائەوانە ستەمکارن ، وە دەفەرمووێ ﴿وَمَنْ لَمْ يَحْكُمْ بِمَا أَنْزَلَ اللَّهُ فَأُولَئِكَ هُمُ الْفَاسِقُونَ﴾[56] . واتە ئائەوانەی حوکم بەو قورئانە ناکەن کە الله دیگرتووە ئائەوانە فاسق و سنور بەزێنن ، واتای ستەمکار و فاسق چیە ؟

دیارە گوێمان لێدەبێت کە دەڵێن حوکم کردن بە غەیری قورئان زوڵم و تاوانە و کوفر نیە ئەگەر چی تەشریعیش بکات (پەنابە الله) ، بەڵام بێئاگا لەوەی کە زاڵم و فاسق لێرەدا بە واتای کوفر دێت !

---

[53] سورة المائدة / ٤٥

[54] سورة المائدة / ٤٧

[55] سورة المائدة / ٤٥

[56] سورة المائدة / ٤٧

**هەم فیسق و هەمیش زوڵم دوو جۆرن :**

**یەکەم**: فیسق و زوڵمی گەورە .

**دووەم**: فیسق و زوڵمی بچوك .

**الإمام حافظ بن أحمد الحكمي** رحمه الله : دەفەرمووێ (**وَذَلِكَ لِأَنَّ كُلًّا مِنَ الْكُفْرِ وَالظُّلْمِ وَالْفُسُوقِ وَالنِّفَاقِ جَاءَتْ فِي النُّصُوصِ عَلَى قِسْمَيْنِ:أَكْبَرُ يُخرِجُ مِنَ الْمِلَّةِ لِمُنَافَاتِهِ أَصْلُ الدِّينِ بِالْكُلِّيَّةِ.وَأَصْغَرُ يُنْقِصُ الْإِيمَانَ وَيُنَافِي الْمِلَّةَ وَلَا يَخْرُجُ صَاحِبُهُ مِنْهُ**)[57]. واتە: کوفر و زوڵم و فیسق و نیفاقیش لە ئایەتەکاندا دوو قیسمن : گەورە کە ئەمە خاوەنەکەی لە دین دەکاتە دەرەوە ، چونکە دەبـیتە هۆی نەفیکردنی ئەصڵی دین بە گشتی (واتە ئیمانی بەندە هەڵدەوەشێنێتەوە) ، وە بچوکیش کە ئیمانی بەندە کەم دەکاتەوە بەڵام کافر نابـیت .

**الإمام محمد المروزي** رحمه الله : دەفەرمووێ : (**وكذلك الفسق فسقان: فسق ينقل عن الملة، وفسق لا ينقل عن الملة**)[58]. واتە : فیسق دووجۆرە ، جۆرێك لـە فیسق کە خاوەنەکەی پێی کافر دەبـیت ، وە جۆرێکی تر لـە فیسق کە خاوەنەکەی پێی کافر نابـیت .

**الإمام إبن القيم الجوزية** رحمه الله : دەفەرمووێ : (**فالكفر كفران، والظلم ظلمان، والفسق فسقان، والجهل جهلان، والشرك شركان: شرك ينقل عن الملة، وهو الشرك الأكبر، وشرك لا ينقل عن الملة، وهو الشرك الأصغر: شرك العمل، كالرياء**)[59] . واتە : کوفر دوو کوفرە وە زوڵم و فیسق و جەهل و شیرکیش بە هەمان شێوە ، شیرکێك کە خاوەنەکەی پێی کافر دەبـیت ، کە شیرکی گەورەیە ،

[57] معارج القبول بشرح سلم الوصول إلى علم الأصول لإمام الحكمي : ٢/ ٢٩٤.

[58] الإيمان لشيخ الإسلام ابن تيمية الحراني الحنبلي الدمشقي (المتوفى: ٧٢٨هـ) / لا ٢٥٧ .

[59] مصباح الظلام في الرد على من كذب الشيخ الإمام ونسبه إلى تكفير أهل الإيمان والإسلام لإمام عبد اللطيف بن عبد الرحمن بن حسن بن محمد بن عبد الوهاب : ٥٣٣/٣ .

وه جۆرێکی تر لـه شیرك كه خاوه‌نه‌كه‌ی پێی كافر نابـیت ، كه شیركی بچوكه ، شیركی كرده‌وه‌یه وه‌كو ریا.

**شیکردنه‌وه‌ی ئه‌م وتانه‌ی سه‌ره‌وه**:-هه‌ركاتێك لـه قورئانی پیرۆز بـینیت باسی بابه‌تی كوفر و شیرك یان نیفاق یان لـه‌و جۆره بابه‌تانه كرا و پاشان خاوه‌نه‌كه‌ی به زاڵـم یان فاسق وه‌صف كرد ، ئه‌وا به واتای كافر دێت ، هه‌روه‌كو خوای تعالی ده‌فه‌رمووێ ﴿**وَالْكَافِرُونَ هُمُ الظَّالِمُونَ**﴾[60] . واته : كافران ئائه‌وان سته‌مكارن . وه هه‌روه‌ها فه‌رموویه‌تی ﴿**إِنَّ الشِّرْكَ لَظُلْمٌ عَظِيمٌ**﴾[61]. واته : به‌ڕاستی شیرك زوڵـمێكی گه‌وره‌یه . وه‌هه‌روه‌ها فه‌رموویه‌تی : ﴿**وَلَقَدْ أَنْزَلْنَا إِلَيْكَ آيَاتٍ بَـيِّنَاتٍ وَمَا يَكْفُرُ بِهَا إِلَّا الْفَاسِقُونَ**﴾[62] . واته : ئه‌ی محمد ﷺ به‌ڕاستی كۆمه‌ڵێ به‌ڵگه و نیشانه‌ی ڕونمان بۆ تۆ ناردووه ، وه‌هیچ كه‌سێك نیه كه كوفری پێبكات و بڕوای پێ نه‌هێنێت ئیلا فاسقه‌كان نه‌بـیت . وه هه‌روه‌ها ﷻ فه‌رموویه‌تی ﴿**لَا تَعْتَذِرُوا قَدْ كَفَرْتُمْ بَعْدَ إِيمَانِكُمْ إِنْ نَعْفُ عَنْ طَائِفَةٍ مِنْكُمْ نُعَذِّبْ طَائِفَةً بِأَنَّهُمْ كَانُوا مُجْرِمِينَ (٦٦) الْمُنَافِقُونَ وَالْمُنَافِقَاتُ بَعْضُهُمْ مِنْ بَعْضٍ يَأْمُرُونَ بِالْمُنْكَرِ وَيَنْهَوْنَ عَنِ الْمَعْرُوفِ وَيَقْبِضُونَ أَيْدِيَهُمْ نَسُوا اللَّهَ فَنَسِيَهُمْ إِنَّ الْمُنَافِقِينَ هُمُ الْفَاسِقُونَ (٦٧) وَعَدَ اللَّهُ الْمُنَافِقِينَ وَالْمُنَافِقَاتِ وَالْكُفَّارَ نَارَ جَهَنَّمَ خَالِدِينَ فِيهَا هِيَ حَسْبُهُمْ وَلَعَنَهُمُ اللَّهُ وَلَهُمْ عَذَابٌ مُقِيمٌ**﴾[63]. واته : (ئه‌ی ئه‌وانه‌ی گاڵته به الله و پێغه‌مبـه‌ره‌كه‌ی و دینه‌كه‌ی ده‌كه‌ن) عوزر بۆ خۆتان مه‌هێننه‌وه ، به‌ڕاستی كافربوون لـه دوای ئه‌وه‌ی ئیمانتان هێنابوو ، خۆ ئه‌گه‌ر سزای هه‌ندێكتان نه‌ده‌ین و لـێتان ببورین به‌هۆی ته‌وبه‌تانه‌وه ، ئه‌وا سـزای ئه‌وانی ترتان ده‌ده‌ین چونكه ئه‌وان تاوانبار بوون ، پیاوان و ئافره‌تانی مونافیق هه‌ندێكیان لـه هه‌ندێكیانن ، فه‌رمان ده‌كه‌ن به خراپه و نه‌هیش لـه باشه

---

[60] سورة البقرة / ٢٥٤

[61] سورة لقمان / ١٣

[62] سورة البقرة / ٩٩

[63] سورة التوبة / ٦٦ و ٦٧ و ٦٨

دەكەن و دەستەكانیان دەنوقێنن لـە چاكە و خوا و دینەكەی و گەڕانەوە بۆلایان بـیرچۆتەوە ، بۆیـە خوای تعالی ــش ئەوان لـە بـیردەكات و وازیان لـێدەهێنێت ، بەڕاستی مونافیقەكان لـە فاسقانن الله تعالی بەڵێنی داوە بە ژن و پیاوە مونافیقەكان و كافران بە ئاگری بەسزای دۆزەخ ، ئاگرێك كە تێیدا دەمێننەوە و چارەنوسیان هەر لـەوێیە ، وە الله تعالی نەفرەتی لـێكردوون و سزای هەمیشەییان بۆ هەیە .وە ئایەت لـەم بارەوە زۆر زۆرە بەڵام ئەوەندە كیفایەتە بۆ كەسێك حەقی بوێت.

**الإمام عبدالله بن عباس** ﷺ : فەرموویەتی زاڵـم واتاموشریك[64] .

**الإمام الطبري** رحمه الله : دەفەرمووێ : (**المنافق والكافر سُمّيا فاسقيْن، لخروجهما عن طاعة ربهما. ولذلك قال جل ذكره في صفة إبليس: ﴿إِلا إِبْلِيسَ كَانَ مِنَ الْجِنِّ فَفَسَقَ عَنْ أَمْرِ رَبِّهِ﴾**[65]**، يعني به خرج عن طاعته واتباع أمره**)[66]. واتە : مونافیق و كافر ناودەنرێن بە دوو فاسقەكە ، لـەبەر دەرچونیان لـە گوێڕایەڵی الله تعالی ــەوە ، هەر لـەبەر ئەمەیشە الله تعالی باسی سیفەتی ئیبلیس دەكات و دەفەرمووێ : ﴿ئیللا ئیبلیس نەبـیت كە لـە جن بوو سوجدەی بۆ ئادەم نەبرد و دەرچوو لـە فەرمانی پەروەردگاری﴾.(ففسق) واتە : دەرچوو لـە گوێڕایەڵی الله و شوێنكەوتنی فەرمانی .

**گوتم** : كەواتە ئەم دوو ئایەتە هەمان واتای ئایەتی یەكەمیان هەیە ، حوكم كردن بە غەیری قورئان دوو حاڵەتە :

**یەكەم**: كوفر و زوڵـم و فیسقی گەورەیە و خاوەنەكەی پێی كافر دەبـێت ، لـە نمونەی ئەم حاكمانە ئەوانەن كە یاسای قورئان لادەدەن و تەشریع دەكەن و یاسای دەستكرد لـە وڵات دەچەسپێنن ، مەجلیسی تەشریع و پەرلـەمان لـە جێی الله عزوجل یاسا دەنوسنـەوە ، ئائەمە خاوەنەكەی كافرە بە **إجماع**.

---

[64]زاد المسير في علم التفسير لإمام ابن الحوزي : ٤١٠/٣

[65]سورة الكهف / ٥٠

[66]جامع البـيان في تأويل القرآن لإمام أبو جعفر الطبري (المتوفى: ٣١٠هـ) : ب ١ / لا ٤٠٩.

**دووەم**: کوفر و زوڵم و فیسقی بچوکە و خاوەنکەی پێی کافر نابـیت ، لـە نمونەی ئەم حاکمانە ئەوانەن کە لـەسەردەمی سەلـەف لـە دەوڵـەتی ئیسلامی بوون، حوکمیان بە یاسای قورئان دەکرد لـە وڵـاتدا و دەستکاری یاسایان ناکرد ، بەڵام هەندێکجار بە هۆی هەواو ئارەزووەوە لـە هەندێ بابەت حوکمیان پێناکرد ، ئەمیش حاڵـەتە نەك بە یاسای بکرێت وەکو ئەمڕۆ ، ئائەمە کوفری بچوکە .

## بەڵگەی چوارەم

وە الله ﷻ دیسان حوکمی کوفرو تاغوت دەدات بەسەر ئەو کەسانەی کە حوکم بە غەیری قورئان دەکەن و یاسا و دەستور و بـیروبۆچوونی مرۆڤیانکردووە بە یاسای وڵات، وە حوکمی مونافیق و بـی بڕوای داوە بەسەر کەسێکیشدا کە بـیەوێت حوکمەکەی بۆلای ئەو حوکمە تاغوتیـە بگەڕێنێتەوە، هەروەکو فەرموویەتی ﴿**أَلَمْ تَرَ إِلَى الَّذِينَ يَزْعُمُونَ أَنَّهُمْ آمَنُوا بِمَا أُنْزِلَ إِلَيْكَ وَمَا أُنْزِلَ مِنْ قَبْلِكَ يُرِيدُونَ أَنْ يَتَحَاكَمُوا إِلَى الطَّاغُوتِ وَقَدْ أُمِرُوا أَنْ يَكْفُرُوا بِهِ وَيُرِيدُ الشَّيْطَانُ أَنْ يُضِلَّهُمْ ضَلَالًا بَعِيدًا**﴾[٦٧]. واتە ئەی محمد ﷺ ئایا ئەو کەسانەتبـینیوە کە لافی ئیمان لـێدەدەن و وادەزانن بڕوادارن ، **کەچی دەیانەوێ حوکم بۆلای تاغوتان ببەنەوە** ؟؟ ، لـە کاتێکدا فەرمانیان پێکرابوو کە کوفر بە تاغوت بکەن و دژایەتیان بکەن (نەك حوکمیان بۆلا ببنەوە و سەریان بخەن و چەکیان بۆ هەڵبگرن و ببنە خزمەتکار و هاوکاریان لـە کارە خراپەکانیان) ، بەڵام ئەو شەیتانەی کە هەمیشـــە لـە کەمیندایـە بۆ مرۆڤ دەبـیتە هۆی گومڕا بوونی ئەو کەسانە ، وە کوفر و شیرکیان لـەلا جوان دەکەن.

**گوتم**: ئەم ئایەتە ڕوونترین بەڵگەیە بۆ کەسێك کە حەقی بووێ و بزانێ تحاکم بۆلای غەیری حوکمەکەی الله کوفرە و پێی بـێبڕوا دەبـیت ، وە ئەو کەسانەی بە تاغوت ناوبردووە لـە پیسترینی کافرانن وە واجـــبـە لـەسەر بڕواداران کوفر بە تاغوت بکەن و شوێنیان نەکەون، بەڵکو مەرجی یەکەمی لاالـەالاالله ــە، وە هەرکەسێك کوفر بە تاغوت نەکات بڕوادار نیە ، الله تعالی فەرموویەتی ﴿**فَمَنْ يَكْفُرْ بِالطَّاغُوتِ وَيُؤْمِنْ بِاللَّهِ فَقَدِ اسْتَمْسَكَ بِالْعُرْوَةِ الْوُثْقَى لَا انْفِصَامَ لَهَا**﴾[٦٨]. واتە : جا هەرکەســــێك کوفری بە تاغوت کرد و پشتی تێکرد ، پاشان ئیمانی بە الله تعالی هێنا **ئەوا دەستی بە لاالـەالاالله گرتووە** کە پەتێکی بە هێزە و ناپسێت.

---

[٦٧] سورة النساء / ٦٠

[٦٨] سورة البقرة / ٢٥٦

**الله تعالى كوفركردن به تاغووتی لـه پێش ئیمان هێنان به خۆی باسكرد ، وه هەردووكی كرد به مەرجی لاالـهالاالله** ، بۆیه كوفركردن به تاغوت مەرجی یەكەمی لاالـهالاالله ، هەركەسێك كوفری به تاغوت كرد ئینجا لاالـهالاالله سوودی بۆ دەبـیت ، بەڵام هەركەسێك كوفر به تاغوت نەكات ، بەڵكو بچێت بـیانپارێزێت و ببـیته سەرخەریان هەرچەنده بـیشڵێت لاالـهالاالله ئەوا لاالـهالاالله سوودی بۆی نابـیت چونكه مەرجه سەرەكییەكەی شكاندووه ، هەروەكو نوێژ بەبێ دەستنوێژ سوودی نیه چونكه مەرجی نوێژه ، ئاوهایش كوفر و خۆبـیبەری كردن لـه تاغوتان مەرجی شەهادەته .

بۆیه ئیمامی موسلیم ڕیوایەتی كردووه[٦٩] كه پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) فەرموویەتی : (**من قال لااله الاالله و كفر بما يعبد من دون الله حرم ماله و دمه و حسابه على الله**) . واته : هەركەسێك بڵێت لاالـهالاالله و كوفر به تاغوت بكات ئەوا خوێن و ماڵی حەرامه و لـێپرسینەوەیشی لـەسەر الله ـــیه. (خۆ ئەگەر كەسێك كوفری به تاغوت نەكرد ئەوا خوێت و ماڵی بۆ دەوڵـەت حەڵاڵه) .

بۆیـــه مەرجی ئیمان هێنان به الله كوفر به تاغوته ، وه هەردوكیان مەرجی وەرگرتنی شەهادەت و لاالـهالاالله .

وه هەر ئیمامی موسلیم و غەیری ئەویش نقڵیانكردووه لـه پێغەمبەری خواوه كه فەرموویەتی : (**بني الإسلام على خمس : على ان يعبد الله و يكفر بما دونه ، وإقام الصلاة و إيتاء الزكاة ، والحج البـيت ، و صوم رمضان**)[٧٠]. واته ئیسلام لـه سەر پێنج شت بنیادنراوه ، لـەسەر پەرستنی الله و كوفر كردن و پشت هەڵكردن لـەو تاغوتانەی لـه غەیری الله دەپەرسترێن و گوێڕایەڵی دەكرێن (چونكـــه گوێڕایەڵی

---

[٦٩] صحيح مسلم: ر. ١٣٩.

[٧٠] صحيح مسلم: ر.١٢١.

یەكێكە لە گەورەترین عیبادەتەكان بۆ الله تعالى) وە لەسەر ئەنجامدانی نوێژ و زەكات و حەج و ڕۆژووی مانگی ڕەمەزان بنیاندنراوە .

وە الله تعالى ئەو كەسانەی بە بێ ئیمان ناوهێنا ، چونكە فەرمووی ﴿يزعمون أنهم آمنوا﴾[71] واتە : وادەزانن بڕوادارن ، واتە بێباوەڕن، ئەمە زۆر ڕوونە ، **ئەم هەڕەشەیە بۆ كەسێك نیە حوكم بە غەیری قورئان بكات ، نەخێر ئەم هەڕەشە قورسە بۆ كەسێكە كە تەنها دەیەوێت حوكم بۆلای حوكم و دادگای بە تاغووتە بگەڕێنێتەوە .! ئەی دەبێ حوكمی كەسێك چی بێت كە خۆی هەڵدەستێت بە لادانی حوكمی خواو و حوكمی خۆی بچەسپێنێت؟**

**بۆیـــە دەتوانین بڵێن**: لە ئایەتەكـەدا ئەوە فێربووین كە:

١-هەركەسێ واز لە یاسا و حوكمی الله بهێنێت (واتە حاكمەكە) تاغوتە.

٢- و ئەوكەسەیش حوكمی بۆلا دەگەڕێنێتەوە (واتە محكومەكە) مونافیق و بێ بڕوایـە .

**الإمام مجاهد بن جبر** رحمه الله : هاتووە لە تەفسیری ئیمامی موجاهید : (أنبأ عَبْدُ الرَّحْمَنِ، قَالَ: ثنا إِبْرَاهِيمُ، قَالَ: نا آدَمُ، قَالَ: نا وَرْقَاءُ، عَنِ ابْنِ أَبِي نَجِيحٍ، عَنْ مُجَاهِدٍ، قَالَ: تَنَازَعَ رَجُلٌ مِنَ الْمُنَافِقِينَ وَرَجُلٌ مِنَ الْيَهُودِ فَقَالَ الْيَهُودِيُّ: اذْهَبْ بِنَا إِلَى مُحَمَّدٍ، وَقَالَ الْمُنَافِقُ: اذْهَبْ بِنَا إِلَى كَعْبِ بْنِ الْأَشْرَفِ فَأَنْزَلَ اللَّهُ: ﴿يُرِيدُونَ أَنْ يَتَحَاكَمُوا إِلَى الطَّاغُوتِ﴾ «وَهُوَ كَعْبُ بْنُ الْأَشْرَفِ»)[72] . واتە بەو سەنەدە پێمان گەیشتووە لە ئیمامی موفەسیری قورئان موجاهیدی كوڕی جبر كە فەرموویەتی : پیاوێكی مونافیق و پیاوێك لە جوولەكەكان بووبەكێشەیان ، كابرای جوولەكە وتی بابڕۆین بۆلای محمد ﷺ وە كابرای مەنافیق (كە بەڕواڵەت و زاهیری كەسێكی موسڵمانە) وتی نەخێر بابچین بۆلای كەعبی كوڕی ئەشرەف .!!

---

[71] (سورة النساء / ٦٠)

[72] تفسير مجاهد : سورة النساء / ٦٠

وه ڕیوایەت هاتووه لـه قتادة و عامر الـسدى و غەیری ئەوانیش به ئاماژه به هەمان باس دەكەن[٧٣] .

**الإمام ابن كثير** رحمه الله فەرموویـــەتی : (**هَذَا إِنْكَارٌ مِنَ اللَّهِ، عَزَّ وَجَلَّ، عَلَى مَنْ يَدَّعِي الْإِيمَانَ بِمَا أَنْزَلَ اللَّهُ عَلَى رَسُولِهِ وَعَلَى الْأَنْبِيَاءِ الْأَقْدَمِينَ، وَهُوَ مَعَ ذَلِكَ يُرِيدُ التَّحَاكُمَ فِي فَصْلِ الْخُصُومَاتِ إِلَى غَيْرِ كِتَابِ اللَّهِ وَسُنَّةِ رَسُولِهِ**)[٧٤] .

واته : ئەم ئایەتەدا نكۆڵی كردنی الله تعالى ـى تێدایـــه بۆ ئەوانەی كه بانگەشەی بڕوابوون دەكەن بەو كتابانەی كه دابەزیون به پێغەمبـــەری خۆمان ﷺ) و پێغەمبــــەرانی پێشوتریش (علیهم السلام) ، لـه كاتێدا ئەم كەسانه (تەنها) دەیانەوێ لـەكاتی كێشه و جیاوازیەكانیاندا حوكم بۆلای غەیری قورئان و سونەت ببەنەوه .

بۆیه الله تعالى حوكمی تاغوتی دا بەسەر هەركەسێكدا كه حوكم به غەیری كتابەكەی الله بكات ، وه حوكمی بـێ بڕوای و نیفاقیدا بەسەر كەسێكیشدا كه بـیەوێت به حوكمی ئەو تاغوته كارەكانی جێبەجێ بكات . وەیل و نەگبەتی بۆ كەسێك كه پشتی لـه حاكمیـەت و دەستوری الله عزوجل كردووه ودیموكراسی كردووه به ڕێچكه و پرۆگرامی وڵـات . وەیل و تیاچوون بۆی دووباره .

---

[٧٣] جامع البـيان في تأويل القرآن لإمام أبو جعفر الطبري (المتوفى: ٣١٠هـ) : ب ٨ / لا ٥١١.

[٧٤] تفسير القرآن العظيم لإمام ابن كثير (المتوفى: ٧٧٤هـ) : ب ٢ / لا ٣٠٥ .

## بەڵگەی پێنجەم

وە الله تعالى فەرموویەتی : ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا أَطِيعُوا اللَّهَ وَأَطِيعُوا الرَّسُولَ وَأُولِي الْأَمْرِ مِنْكُمْ فَإِنْ تَنَازَعْتُمْ فِي شَيْءٍ فَرُدُّوهُ إِلَى اللَّهِ وَالرَّسُولِ إِنْ كُنْتُمْ تُؤْمِنُونَ بِاللَّهِ وَالْيَوْمِ الْآخِرِ ذَلِكَ خَيْرٌ وَأَحْسَنُ تَأْوِيلًا﴾[٧٥] . واتە : ئەی بڕواداران گوێڕایەڵی فەرمانەکانی الله ﷻ و ڕەسولەکەی ﷺ و زانا و کاربەدەستە موسڵمانەکان بن کە لە خۆتانن و موسڵمانن ، خۆ ئەگەر جیاوازی کەوتە نێوانتانەوە لە بابەتێکدا ئەوا حوکم بۆلای الله ﷻ و ڕەسولەکەی ﷺ بگەڕێننەوە **ئەگەر ئێوە ڕاست دەکەن و بڕواتان بە خواو ڕۆژی دوای هەیە ، ئائەمە باشە بۆتان بۆ چارەسەری کێشەکانتان .**

**ئەم هەڕەشە گەورەیە بۆ کەسێکە کە تەنها لەیەك بابەت حوکم بۆلای غەیری الله دەباتەوە هەروەکو الله فەرمووی ﴿في شيء﴾ ، واتا لە شتێکدا لە بابەتێکـــدا ،** ئەی حوکمی ئەو کەسە چیـــە خۆی هاتووە یاسا دەنوسێت و هەموو حوکمەکانی الله ـی لاداوە و حوکمێکی دیموکراسی تاغوتی داناوە و حوکمی خەڵکی پێدەکات و هەرکەسێکیش دژی دەستورەکەیان بوەستێـتەوە زیندانی دەکـــەن و تەنانەت دەیکوژن .بـێگومان کـــافرە و موسڵمان نیـــە وە تاغوتە وەهەر کەسێکیش تەکفیری نەکات ئەوا ئیمان هێنانەکەی بە الله سوودی بۆی نابـێت ، چونکـــە پێشتر باسمانکرد مەرجی ئیمان بریتیـــە لە کوفرکردن بە تاغوت .

**الإمام الطبري** رحمه الله فەرموویـــەتی : **(إن كنتم تؤمنون بالله واليوم الآخر يقول: افعلوا ذلك إن كنتم تصدقون بالله واليوم الآخر)**[٧٦] . واتە : دەربارەی ئایەتەکە ﴿**إن كنتم تؤمنون بالله و اليوم الآخر**﴾ واتە : ئەو فەرمانە جێبەجێ بکـەن ئەگەر ئێوە الله و ڕۆژی دوای بەڕاست دەزانن.

---

[٧٥] سورة النساء / ٥٩

[٧٦] جامع البـيان في تأويل القرآن لإمام أبو جعفر الطبري (المتوفى: ٣١٠هـ) : ب ٨ / لا ٥٠٤ .

**الإمام أبوبكر الجصاص** رحمه الله فەرموویەتی : (**مَنْ رَدَّ شَيْئًا مِنْ أَوَامِرِ اللَّهِ تَعَالَى أَوْ أَوَامِرِ رَسُولِهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَهُوَ خَارِجٌ مِنْ الْإِسْلَامِ**)[77]. واتە هەرکەسێك تەنها شتێك لە فەرمانەکانی الله عزوجل ڕەتبکاتەوە و بۆی تەسلیم نەبی ، یان فەرمانەکانی پێغەمبەری خوا ﷺ ئەوا لە دەرەوەی میللەتی ئیسلامە واتە کافرە (پەنابە الله).

**وە هەروەها فەرموویەتی**: (**مَنْ لَمْ يُسَلِّمْ لِلنَّبِي صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَضَاءَهُ وَحُكْمَهُ فَلَيْسَ مِنْ أَهْلِ الْإِيمَانِ**)[78] . واتە هەرکەسێک تەسلیمی پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) نەبیت لە قەزاوەت و حوکمەکانیدا ئەوا لە بڕواداران نیە.

**الإمام البيضاوي** رحمه الله فەرموویەتی : (**وفي معناه من يحكم بالباطل ويؤثر لأجله، سمي بذلك لفرط طغيانه أو لتشبهه بالشيطان**)[79] . واتە : لەواتای (تاغوتدا ئەوەیە) کە هەرکەسێك حوکم بە باتڵ بکات وکارکاتە سەری، ئەوا بە (تاغوت) بەو ناوە ناودەنرێت بەهۆی زێدەڕەوی لە سنووربەزاندنەکانیاندا ، یان وەکو تەشبیهێك بەشەیتان) ، واتە چۆن شەیتان سنوری خۆی بەزاند ئەم تاغوتانەیش کە حوکم بە باتڵ دەکەن ئاوا سنوری خۆیان دەبەزێنن وەکو شەیتان .

**گوتم** : پشت هەڵکردن لە حوکمی الله و ڕووکردن لە حوکمی تاغوت نیشانی نیفاقی گەورەیە (أكبر) ، وە الله تعالى بڕیاری لەسەر بێبڕوا بوونی ئەو کەسانەداوە ، وە ئەم کارەی بە سیفەتی ئەهلی نیفاق ناوبردووە هەروەکو فەرموویەتی : ﴿**وإذا قيل لهم تعالوا إلى ما أنزل الله وإلى الرسول رأيت المنافقين يصدون عنك صدودا**﴾[80] . واتە : ئەگەر بەو (مونافیقانە) بوترێت وەرن بۆلای

---

[77]أحكام القرآن لإمام أحمد بن علي أبو بكر الرازي الجصاص الحنفي (المتوفى: ٣٧٠هـ) : ب ٣ / لا ١٨١.

[78] هەمان سەرچاوەی سەرەوە .

[79]أنوار التنزيل وأسرار التأويل لإمام البيضاوي (المتوفى: ٦٨٥هـ) : ب ٢ / لا ٨١ .

[80](سورة النساء / ٦١)

ئەو كتابەی الله ﷻ ناردوویـــەتی وە بۆلای پێغەمبـەرەكەی(صلى الله عليه وسلم) ، دەبـینیت مونافیقەكان پشتت لـێهەڵدەكەن .

**بزانە** الله ﷻ **هیدایەتی من و تۆیش بدات**: ئەم هەڕەشانـە بۆ كەسێك نیـــە كە حاكم و دەسەڵاتدار بـیت و حوكم بە غەیری قورئان بكات .!! ، بـەڵكو ئەم هەڕەشانە بۆ خەڵكی عەوامە كە بە حوكمی ئەو حاكمانە ڕازین ، ئەو حاكمانە كافرن هیچ قسە لـەوە نیە الله تعالی حوكمی كافری داون بەسەریدا هەروەكو فەرموویـــەتی ﴿**ومن لم يحكم بما أنزل الله فأولئك هـــم الكـــافرون**﴾[٨١] ، وە حوكمی تاغوتی داوە بەسەریانـدا هەروەكـــو فەرموویەتی ﴿**يريدون أن يتحاكموا إلى الطاغوت**﴾[٨٢] .

بەڵام ئەم مونافیقی و كافریەی كە ئێستا باسمانكرد بۆ كەسێكە كە تەنها دەیەوێ حوكم بۆلای ئەم تاغوتانە بباتەوە ، بڕوانە الله فەرمووی ﴿**يريدون أن يتحاكموا الى الطاغوت**﴾[٨٣] ، واتە دەیانەوێ حوكم بۆلای تاغوتان ببەنەوە ، واتە كوفری ئەمانە حوكمكردن بە غەیری قورئان نیـــە ، بەڵكو گەڕانەوەی حوكمە بۆلای ئەوانەی كە حوكم بە قورئان ناكەن ، چونكە ئەم دووانە جیاوازن ، ئەم كەسانە الله نكۆڵی لـەوە دەكات كە ئەمانە بڕوادار بن هەروەكو فەرمووی ﴿**يزعمون أنهم آمنوا..**﴾[٨٤] ، واتە واگومان دەبەن كە بڕوادارن ، بەڵام لـە ڕاستیدابڕوادار نین بەڵكو مونافیقن وەك باسكرا، الله تعالی بمانپارێزێ لـە گەڕانەوەی حوكم بۆلای تاغوتان .

---

[٨١](سورة المائدة / ٤٤)

[٨٢] (سورة النساء / ٦٠)

[٨٣](سورة النساء / ٦٠)

[٨٤](سورة النساء / ٦٠)

## بەڵگەی شەشەم

وە هەروەها الله تعالى دیسان دەمانترسێنێت و دەفەرمووێ ﴿فَلَا وَرَبِّكَ لَا يُؤْمِنُونَ حَتَّى يُحَكِّمُوكَ فِيمَا شَجَرَ بَيْنَهُمْ ثُمَّ لَا يَجِدُوا فِي أَنْفُسِهِمْ حَرَجًا مِمَّا قَضَيْتَ وَيُسَلِّمُوا تَسْلِيمًا﴾[85] . واتە : نەخێر سوێند بیت بە پەروەردگاری تۆ ئەی محمد ﷺ بڕوایان نیە تاکو تۆ نەکەن بە حەکەم و کێشەکانیان بە بڕیارەکانی تۆ چارەسەر نەکەن، لەگەڵ ئەویشدا نابیت تەنانەت لە دڵیانیشدا نارەحەتی و پێناخۆش بوون هەبیت ، بەڵکو دەبیت تەسلیم بن بۆ ئەو بڕیارە .

ببینە الله چۆن دەمانترسێنێت، چ هەڕەشەیەك دەكات ﴿فلا وربك لا يؤمنون﴾ واتە نەخێر سوێند بیت بە پەروەردگاری تۆ ئەی محمد ئەوانە ئیمانیان نیە ، بێگومان ئەم سوێندە گەورەیە الله تعالى دەیەوێ ئاگادارییەکی گرنگمان پێبدات ، وە سنورێکمان بۆ دابنێت کە ﴿حتى يحكموك فيما شجر بينهم﴾[86] ، واتە تاکو تۆ نەکەن بە حاکم و دادوەر لە نێوان خۆیاندا.

ئەم ئایەتە پیرۆزە سبب نزولی هەبوو ، ئیمامی بوخاری[87] و موسلیم[88] و غەیری ئەوانیش ڕیوایەتیانکردووە کە زوبەیری کوڕی عەووام (ڕەزای الله لێبێ) لەگەڵ پیاوێك لە ئەنصار لە خەڵکی مەدینە بووبەکێشەیان لەسەر جۆگە ئاوێك، جۆگەکە سەرەتا بەناو باخەکەی زوبەیر تێپەڕ دەبوو پاشان دەهاتە ناو باخی کابرای ئەنصاری ، کابرای ئەنصاری دەیوت : نابیت ئەم جۆگە ئاوە بەناو باخەکەی زوبەیر تێپەڕ ببیت، بەڵکو دەبیت ڕاستەوخۆ بۆ باخەکەی من بیت.

---

[85] سورة النساء / ٦٥

[86] سورة النساء / ٦٥

[87] الجامع الصحيح (صحيح البخاري) لإمام البخاري (المتوفى: ٢٥٦هـ) : ب ٣ / لا ١٤٦ حسب ترقيم فتح الباري – الناشر: دار الشعب – القاهرة –الطبعة: الأولى، ١٤٠٧ – ١٩٨٧

[88] صحيح مسلم لإمام مسلم بن الحجاج النيسابوري (المتوفى: ٢٦١هـ) / ر. ٢٣٥٧ – المحقق: محمد فؤاد عبد الباقي – الناشر: دار إحياء التراث العربي – بيروت

حوكم برايــــەوە بۆلای خۆشەویستمان ﷺ ئەویش بەحەق حوکم دەکات وە الله ﷻ فەرمانی پێکردووە کە کەمێکیش لـە حەق لانەدەی وەکو لـەسەرەتادا باسمانکرد ، بۆیـە حوکمیدا لـەبەرژەوەندی زبـیر ، چونکـە حەقی خۆی بوو وە سروشتی ئاوەکەیش هەروابوو کە سەرەتا دەهاتە ناو باخەکەی زبـیر ، بەڵام کابرای ئەنصاری خۆی پێنەگیرا و وتی زبـیر خزمی خۆتـە بۆیـە لـەبەرژەوەندی ئەو حوکمتدا .! (پەنابە الله لـەم سنوربەزاندنە) ، بۆیـە الله ﷻ ئەم ئایەتەی ناردە خوارەوە.

**الإمام ابن أبي العز الحنفي** رَحِمَهُ ٱللَّهُ فەرموویــــەتی : (**قسم سبحانه بنفسه أنهم لا يؤمنون حتى يحكموا نبـيه ويرضوا بحكمه ويسلموا تسليما.**)[٨٩] . واتە : الله تعالى سوێندی بە خۆی خوارد کە ئەو کەسانە بڕوادارنین هەتاکو پێغەمبەرەکەیان ﷺ نەکەن بە حەکەم و بە حوکمەکەیشی ڕازی و تەسلیم بن.

**الإمام حسين بن غنّام** رَحِمَهُ ٱللَّهُ فەرموویەتی : (**أقسم الله تعالى بنفسه الكريمة المقدسة أنه لا يؤمن أحد حتى يحكم الرسول صلى الله عليه وسلم في جميع الأمور**)[٩٠] . واتە: الله تعالى سوێندی بە زاتی پاك و بەڕێزی خۆی خواردووە کە هیچ کەس ئیمانی نیـە هەتاکو محمد ﷺ نەکات بە حەکەم و بەوە حوکم دەکات کە محمد ﷺ هاوردی ، لـەهەموو کاروبارەکانی ژیانیان.

گوتم : ئەی بەندەکانی الله، بترسـن لـەوەی کە کافر ببەوە و هەست بە خۆتان نەکەن ، الله تعالى کاروکردەوەی ئەو کەسانە هەڵدەوەشێنێتەوە کە تەنها دەنگ بەسەر پێغەبــەری خوا ﷺ بەرز دەکەنەوە و مایەپوچیان دەکات لـە قیامەت هەروەکو لـە سوڕەتی الحجرات[٩١] هاتووە ، ئەی دەبـیت حاڵی کەسێك چیبـیت کە حوکم و بڕیارەکانی ڕەتبکاتەوە و حسێبی بۆ نەکات و بە کۆن و نەگونجاو بۆ

---

[٨٩] شرح العقيدة الطحاوية لإمام ابن أبـي العز الحنفي / لا ٢٠٣ .

[٩٠] العقد الثمين في شرح أحاديث أصول الدين لإمام حسين بن غنّام النجدي (المتوفى: ١٢٢٥هـ) / لا ١٤٠.

[٩١] الآية/ ٢

سەردەم وەسفی بکات ، ئەی دەپرسم حاڵی کەسێك دەبیت چییت کە حوکمەکانی الله ـی ل وڵاتەکەیدا پەکخستووە و هیچ گرنگیەك بە بڕیارەکانی نادات ، ئائەوانە ﴿خسروا أنفسهم فهم لا يؤمنون﴾[٩٢]، ئائەوانە مایەپوچ بوون ' ئائەوانە ئیمانیان نەبوو ، لە قیامەتدا ئەو دەسەڵات و سەربازانەی دەیانپاراستن و پشتگیریان لێدەکردن بە فریایان ناگات ، بەڵکو هەرکەسە نەفسی ـتی ، ئەو ڕۆژەی کە الله لەبارەیەوە فەرموویەتی ﴿يوم لا ينفع مال ولا بنون﴾[٩٣] کە ماڵ و سامان بە فریات ناگات .جا لە الله بترسن و پارێزگار بن ، سنورەکانی مەبەزێنن ، تاکو لە قیامەتدا لەو کەسانە نەبیت کە الله دەربارەیان دەفەرمووێ ﴿بدلناهم جلودا غيرها ليذوقوا العذاب﴾[٩٤] ، واتە ئەو بێ باوەڕانە لە دۆزەخدا پێستەکانیان بۆ دەگۆڕدرێت، تاکو سزاکەیان بەئێشتر بیت (الله تعالى بمانپارێزێ).وە دەربارەی ئەم ئایەتە کۆمەڵێك شوبهە دروستکراوە کە ئەویش هەڵدەگرین بۆ دواتر خوا ئاسانی بکات .

---

[٩٢] سورة الأنعام / ١٢

[٩٣] الشعراء / ٨٨

[٩٤] سورة النساء / ٥٨

# بەڵگەی حەوتەم

وە الله تعالى زۆر بە ڕوونی ئەو کەسانە بە مونافیق ناودەبات کە پشت لە حوکمی الله دەکەن ، هەروەکو فەرموویــەتی ﴿وَإِذَا قِيلَ لَهُمْ تَعَالَوْا إِلَى مَا أَنْزَلَ اللَّهُ وَإِلَى الرَّسُولِ رَأَيْتَ الْمُنَافِقِينَ يَصُدُّونَ عَنْكَ صُدُودًا﴾[٩٥] . واتە ئەی محمد ﷺ ئەگەر بەو مونافیقانــە بوترێ وەرن بۆلای ئەو بەرنامەیەی الله ﷻ دایگرتووە ، دەبــینیت مونافیق و دووڕووەکان پشتتلێدەکەن .

ئەو ســـەردەمەیش کەسانێك هەبوون بەناوموسڵمان کە حوکمی غەیری الله ـیان دەویست و حوکمیان بۆلادەبردەوە ، بەڵام بـینیمان الله (جل و علا) بە مونافیق ناوی بردن نەك موسڵمان و سەلەفی و حیزی بەناوئیسلامی و فلانی و فلانی ، وە ئەم نیفاقـە نیفاقی أکبرە و خاوەنەکەی پێی کـافر دەبـێت ، ئەمەیش الله تعالى ئاگاداری پێغەمبــەری خوا ﷺ و ئێمەیش دەکاتەوە لـە حاڵی ئەو کـەسانە لە دونیا کە مونافیق ناوی هێنان وە سەرئەنجامیشیان لـە قیامـەتدا بۆ ســزایـەکی بەئێش و قورس دەبرێن لـە خواری خواری دۆزەخ (پەنادەگرین بە الله) ، هەروەکو خۆی ﷻ فەرموویەتی ﴿إن المنافقين في الدرك الأسفل من النّار ولن تجد هم نصيرا﴾[٩٦].

واتە بەڕاستی مونافیقان لـە بەشی هەرە خواری دۆزەخن و وە کەسێك نیە ئەو ڕۆژە ڕزگاریان بکات . وە ئەم سزایـەش بە هەتاهەتای دەمێنێتەوە و خاوەنەکەی ناچێتە بەهەشتەوە ، چونکـە مونافیق کافرە ، هەروەکو الله تعالى دەربارەیان فەرموویــەتی ﴿إنهم كفروا بالله و رسوله و ماتوا وهم فاسقون﴾[٩٧] چونکـە ئەو مونافیقانە کوفریان بە الله و پێغەمبــەرەکەی کرد ، مردن ، ئائەوانە سنوری الله ـیان بەزاندبوو و وەسەرپێچی الله ـیان دەکرد.

---

[٩٥] سورة النساء / ٦١

[٩٦] سورة النساء / ١٤٥

[٩٧] سورة التوبة / ٨٤

**گوتم**: ببـینه خوای تعالی هیدایەتی من و تۆیش بدات : الله تعالی لـه قورئانەکەیدا ئەوەی بۆ بەیانکردووین کە هەرکەسێك پشت هەڵکات لـه حوکمی الله ئەوا مونافیقـه ، وه مونافیقیش کافره و شوێنەکەیشی لـه دۆزەخدا لـه خواری خواری دۆزەخه ، ئائەمەیـه سزای کەسێك کە حوکمی الله و پێغەمبـەرکەی نەوێت ، کەواته جێی خۆیەتی وەکو کەسێکی خاوەن بـیروهۆش بـیربکەیتەوه ئایا کام کاره هەڵبـژێرم ؟ ، ئایا تەنها بە حوکمی الله ڕازی بم و ڕەزامەندی ئەوم بەدەست بکەوێ؟ ، یان بە حوکمی غەیری الله قایل بم و سەری بۆ بنوێنم و بلێم لـه یاسای من سەرووەرتر نیـه کە ئەم یاسا کوفریه لـه دەیەها شوێندا موخالـەفەی فەرمانی الله ﷻ ـی کردووه . جا دواڕۆژی ئەم سزای دۆزەخه ! ، ئایا ئینسانی ژیر کـــام لـەم دووانه هەڵدەبژێرێت ؟ بـێگومان یەکەم ئەگەر چی لـه دونیایش توشی کێشه و گرفت ببـیتەوه .

**الإمام ابو جعفـر الطبري** رحمه الله فەرموویەتی : **(ألم تر، يا محمد، إلى الذين يزعمون أنهم آمنوا بما أنزل إليك من المنافقين، وإلى الذي يزعمون أنهم آمنوا بما أنزل من قبلك من أهل الكتاب، يريدون أن يتحاكموا إلى الطاغوت ﴿وإذا قيل لهم تعالوا إلى ما أنزل الله﴾ ، يعني بذلك: ﴿وإذا قيل لهم تعالوا﴾، هلُمُّوا إلى حكم الله الذي أنزله في كتابه، وإلى الرسول ليحكم بـيننا ﴿رأيت المنافقين يصدون عنك﴾)**[98]. واته : ئەی محمد ئایا ئەوانەت دیوه لـەو مونافیقانەی کە لافی ئەوەلـێدەدەن کە بڕوایان بە قورئان و ئەو کتابـە ئاسمانیانەی پێش تۆیش هێناوه ، بەڵام دەیانەوێ حوکم بۆلای تاغوتان ببەنەوه ، ﴿ئەگەر بەمانه بوترێ وەرن بۆلای حوکمی قورئان﴾ وەرن بۆلای ئەو حوکمی کە ناردوویەتی ، وه وەرن بۆلای پێغەمبەری خوا تاکو حوکم لـه نێوانتان بکات ،﴿ئەوا دەبـینیت کە مونافیقان دەبـینن پشت هەڵدەکەن﴾ .

[98]جامع البـيان في تأويل القرآن لإمام أبو جعفر الطبري (المتوفى: ٣١٠هـ) : ب ٨ / ل ٥١٣

## بەڵگەی هەشتەم

الله ﷻ ڕەخنـــە لـەو کەسانە دەگرێت کە شوێنی غەیری شەرع و حوکمی الله دەکەون، وە کارەکەیان بەشەریك ناودەبات و ئەو کەسانەیش کە حوکمیان بۆ دەبرێتەوە بە شێوازێك وەسفیان دەکات کە کراون بە شەریکی الله ، حاشا هیچ کەسێك شەریکی الله نیە بەڵام ڕووڕەشی بۆ ئەو موشریکانەی کەسانێك دەکەن بە شەریکی الله ـو بە حوکم و شەرعیان ڕازین، الله تعالی دەفەرمووێ : ﴿**أَمْ لَهُمْ شُرَكَاءُ شَرَعُوا لَهُمْ مِنَ الدِّينِ مَا لَمْ يَأْذَنْ بِهِ اللَّهُ وَلَوْلَا كَلِمَةُ الْفَصْلِ لَقُضِيَ بـينَهُمْ وَإِنَّ الظَّالِمِينَ لَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ**﴾[99] . واتە ئایا ئەو کەسانە کەسانێکیان کردووە بە شەریکی الله کە حوکمیان بۆ دابرێژن و بە کەیفی خۆیان حەڵاڵ و حـــەڕام بـکـەن ؟لە کاتێکـــدا الله (جل و علا) بەمە ڕازی نیـــە ! ، ئەگەر بڕیاری الله نەبوایـــە لـەسەر ئەوەی کە لـە سزایان هەڵدەگرێت بۆ قیامەت ، ئەوا لـە دونیایش عەزابی دەدان ، بەڵام لـە قیامەتدا ئەم زاڵـم و موشریکانە سزایەکی بەهێز دەدرێن پەنابەخوا .

**الإمام ابو جعفـر الطبري** رحمه الله زاڵمان بە کافران تەفسیر دەکات و دەفەرمووێ (**وإن الكافرين بالله لهم يوم القيامة عذاب مؤلم مُوجع**)[100] ، واتە بەڕاستی ئەو کەسانەی کە کافربوون بەرامبەر بە الله لـە ڕۆژی قیامەتدا سزا و سوتانێکی سەختیان بۆ هەیە .

**الإمام ابن كثير** رحمه الله فەرموویەتی : (**هُمْ لَا يَتَّبِعُونَ مَا شَرَعَ اللَّهُ لَكَ مِنَ الدِّينِ الْقَوِيمِ، بَلْ يَتَّبِعُونَ مَا شَرَعَ لَهُمْ شَيَاطِينُهُمْ مِنَ الْجِنِّ وَالْإِنْسِ، مِنْ تَحْرِيمِ مَا حَرَّمُوا عَلَيْهِمْ، مِنَ الْبَحِيرَةِ وَالسَّائِبَةِ وَالْوَصِيلَةِ وَالْحَامِ، وَتَحْلِيلِ الْمَيْتَةِ وَالدَّمِ وَالْقِمَارِ، إِلَى نَحْوِ ذَلِكَ مِنَ الضَّلَالَاتِ وَالْجَهَالَةِ الْبَاطِلَةِ، الَّتِي كَانُوا قَدِ اخْتَرَعُوهَا فِي جَاهِلِيَّتِهِمْ،**

---

[99] سورة الشورى / ٢١

[100] جامع البـيان في تأويل القرآن لإمام أبو جعفر الطبري (المتوفى: ٣١٠هـ) : ب ٢١ / لا ٥٢٢

مِنَ التَّحْلِيلِ وَالتَّحْرِيمِ، وَالْعِبَادَاتِ الْبَاطِلَةِ، وَالْأَقْوَالِ الْفَاسِدَةِ)[101]. واته : شوێن ئەو شەرعــە بەهێزە ناكەون كە الله بۆی داناوین ، ئەی محمد ﷺ بەڵكو شوێنی ئەو حوكم و شەرعـــە دەكەون كە شەیتانەكانیان (لە ئینس و جن) بۆیانیان دارِشتووە لە لەحەڕامكردنی ئەوەی الله حەڵاڵی كردووە ، لە خواردنی مردارەوە بوو و خوێن و ئەو كارە خراپانەی دەیانكردن لە حەڕامەكانی خوا و حەڕامكردنی حەڵاڵەكانی الله و ئەو عیبادەتانەی كە بۆ الله و غەیری الله ـیش دەیانكردن وە لەو وتە فاسدانە .

**گوتم**: ئەم موشریكانەی كە الله ﷻ لە موشریك و كافر ناوی بردن لەو حوكم و شەرعی الله ﷻ ڕەیاندەكرد و پێی ڕازی نابوون ، بەڵكو ڕوویان لەو حوكمانە دەكرد كە شەیتانەكان بۆیان داناون لە نەصارا و جوولەكە و هەموو ئەو حوكمانەی كە ئەمڕۆ هەیە و هەمووی دروستكراوی دەستی كافرانە و هیچی الله ﷻ پێی ڕازی نیـــە ، ئەمە حاڵی خەڵكی ئەمڕۆیە كە ئەو حەڵاڵ و حەڕامەیان ناویَ كە الله بۆیانی داناون ، شوێن ئەو حوكمەناكەون كە الله ﷻ بە پێغەمبــەرەكەیـدا ﷺ ناردی ، بەڵكو شوێن بڕیار و حوكمی حاكم و حیزبەكەی دەوێت ، ئەمیش لە پێناو بەدەست خستـنی ماڵێكی كەمێكی دوونیا والله المستعان.

[101] تفسير القرآن العظيم لإمام ابن كثير (المتوفى: ٧٧٤هـ) : ب ٧ / لا ١٢٨ .

## بەڵگەی نۆیەم

وە الله تعالی ئەوەمان بۆ ڕوون دەکـاتەوە کە هیچ کەسێك لـە دانانی حوکم و یاسادا شەریکی نیـە، وە ڕازیش نیـە هیچ کەسێك بکرێت بەشەریکی یان هەرشتێکی تر کە بەندەخراپکارەکان حوکمیان بۆلادەبەنەوە لـە (دار الندوة) ـکەی سەردەمی پێغەمبـــەر ﷺ و پەرلـەمانەکەی سەردەمی خۆیشمان هەروەکو فـەرموویـەتی : ﴿وَلَا يُشْرِكُ فِي حُكْمِهِ أَحَدًا﴾[102]. ببـینە الله ڕێنمویت بکات : ئایا هیچ کەسێك هـەیە وتەی ڕوونتر بـیت لـە وتەی الله ؟ ، ئایا بەزمانێکی عەرەبی ڕوون و ئاسان دانەبەزیووە هەروەکو خۆی ﷻ فەرموویـەتی ﴿بِلِسانٍ عَرَبـي مُبـين﴾[103] واتە قورئانمان داگرتووە بە زمانێکی عەرەبی ڕوون ، کەواتە ببـینە الله زۆر بە ڕوونی پێت دەفەرمووێ **کەسم نەکردووە بە شەریکی خۆم لـە حوکمدا** ، شەرم بتانگرێ ئەی ئەوانەی کەسانێك یان شتانێکتان کردووە بە شەریکی الله ، خەجاڵەتی دونیا و قیامەت بن ، چۆن شەرم ناکەن شەریك بۆ الله دادەنێن لـە حوکمدا کاتێك بە پەرلـەمان و ئەو یاسایانەی ڕازین کە دەریدەکەن کە باشیش دەزانیت کە پێچەوانەی حوکم و یاساکانی الله ـیە ، ئەمە شەریکە بۆ الله لـە حوکمدا، الله فەرموویـەتی ﴿وَلَا يُشْرِكُ فِي حُكْمِهِ أَحَدًا﴾[104] . الله کەسی نەکردووە بە شەرکی خۆی لـە حوکمدا کەچی تۆ شەریـــکی بۆ قەرار دەدەیت ؟ وەیل و تیاچوون بۆ تۆ ئەگەر بەو حاڵـەترسناکـەوە بمریت و بچیتـــەوە حزووری الله چونکە ئەوەی شەریك بۆ الله قەراربدات لـە حوکمدا موشریك و کافرە . سزای موشریکان بە ئێشترین و ترسناکترین سزایـــە ، وە بە هەتاهەتای لـە دۆزەخدا دەمێننەوە و ڕزگار بوونیان بۆ نیە و بەهەشتیش لـەسەریان حەرام دەبـیت (الله بمانپارێزێ) . بۆیـە ﷻ لـە بارەیانەوە دەفەرمووێ ﴿إِنّ اللهَ لا يَغفِرُ أَن يُشرَك

---

[102] سورة الكهف / ٢٦

[103] سورة الشعراء / ١٩٥

[104] سورة الكهف / ٢٦

بِهِ﴾[105] . واته بەڕاستی الله لـه كەسێك خۆش نابـیت كه شەریكی بۆ قەراردابـیت . وه فـەرموویـەتی ﴿إِنَّه مَن يُشرِك بِاللهِ فَقَد حَرَّمَ اللهُ عَلَيهِ الجَنَّة وَ مَأواه النّار وَما لِظالِمِين مِن أنصار﴾[106] . الله تعالى بەهەشتی حەڕامكردووه لـەسەر موشريك و هەرگیز پێی نابەخشێت ، بەڵكو سەروخواری جەهەنمی دەكات ، بۆ ئەم موشريك و زاڵمانه كه زوڵمیان لـه خۆیانكرد لـه دۆزەخدا كەسێك نیـه سەریانبخـات و ڕزگاریان بكــات.

**الإمام ابو جعفـر الطبري** رحمه الله فەرموویـەتی :(**ولا يجعل الله في قضائه، وحكمه في خلقه أحدا سواه شريكا، بل هو المنفرد بالحكم والقضاء فيهم،وتدبـيرهم وتصريفهم فيما شاء وأحبّ**)[107].واته : الله تعالى لـه حوكم و قەزاوەت لـەناو دروستكراوەكانیدا كەسی دانەناوه به شەریكـــی خۆی ، بەڵكو تاك و تەنهایـه لـه حوكمدان و قەزاوەتكردن لـه نێوان بەندەكانی خۆیدا.

**الإمام ابن الجوزي** رحمه الله لـه تەفســيری ئایەتەكەدا فەرموویەتی : (**ولا يجوز أن يحكم حاكم بغير ما حكم به، وليس لأحد أن يحكم من ذات نفسه فيكون شريكاً لله عزّ وجلّ في حكمه**)[108]. واته : دروست نیـه كه حاكم حوكم به غەیری ئەوه بكات (كه الله بۆی داناوه) ، وه بۆ هیچ كەسێكیش نیه كه لـه نەفس و بۆچوونی خۆیەوه حوكم بكات ، **چونكـه ئەبـێته (خۆی دەكاته) شەریكی الله لـه حوكمیدا.**

**الإمام ابن كثير** رحمه الله فەرموویەتی : (**أَنَّهُ تَعَالَى هُوَ الَّذِي لَهُ الْخَلْقُ وَالْأَمْرُ، الَّذِي لَا مُعَقِّبَ لِحُكْمِهِ، وَلَيْسَ لَهُ وَزِيرٌ وَلَا نَصِيرٌ وَلَا شَرِيكٌ وَلَا مُشِيرٌ**)[109] . واته :

---

[105] سورة النساء / ١١٦

[106] سورة المائدة / ٧٢

[107] جامع البـيان في تأويل القرآن لإمام أبو جعفر الطبري (المتوفى: ٣١٠هـ) : ب ١٧ / لا ٦٥٠.

[108] زاد المسير في علم التفسير لإمام ابن الجوزي (المتوفى: ٥٩٧هـ) : ب ٥ / لا ١٣١ .

[109] تفسير القرآن العظيم لإمام ابن كثير (المتوفى: ٧٧٤هـ) : ب ٥ / لا ١٣٧ .

الله ئەو زاتەیە کە خۆی خالق و خاوەن حوکمە ، ئەو حاکمەی کە ڕێگەنادات حوکمەکانی تعطیل بکرێت یان بگۆڕدرێت ، وە نە وەزیری هەیە و لـە پشتیوان نە شەریکێك و نە ڕاویژکارێك.

**الإمام محمد الأمين الشنقيطي** رحمه الله لـە تەفسیری ئایەتەکەدا لـە دوای باسی خوێندنەوەی ئایەتەکە دەکات لـەلای قوراءکە لـەگەڵ قیرائەتەکاندا تەفسیرەکەی باس دەکات کە دوو واتا دەبەخشێت بە پێی دوو قیرائەت :

**یەکەم**: الله تعالى کەسی نەکردووە بە شەریکی خۆی لـە حوکمدا ، کە ئەمە واتای ﴿**ولا يُشرِكُ**﴾ کە لای هەموو قوراءَ وا خوێندراوەتەوە ئیلا ابن عـامـر نەبـێـت.

**دووەم**: بەڵام ئیمامی ابن عـامر بە ﴿**ولا تُشرِك**﴾ خوێندوویەتییەوە کە بە واتای : ئەی محمد ﷺ (ئەی گوێگرلـەقورئان و خوێنەری قورئان) لـە حوکمدا شەریك بۆ الله قەرار مەدە .

**پاشان ئیمام** رحمه الله **دەفـەرمووێ**: (**وَيُفْهَمُ مِنْ هَذِهِ الْآيَاتِ، كَقَوْلِهِ: وَلَا يُشْرِكُ فِيحُكْمِهِ أَحَدًا، أَنَّ مُتَّبِعِي أَحْكَامِ الْمُشَرِّعِينَ غَيْرِ مَا شَرَعَهُ اللَّهُ أَنَّهُمْ مُشْرِكُونَ بِاللَّهِ،** وَهَذَا الْمَفْهُومُ جَاءَ مُبَيـنًا فِي آيَاتٍ أُخَرَ، كَقَوْلِهِ فِيمَن اتَّبَعَ تَشْرِيعَ الشَّيْطَانِ فِي إِبَاحَةِ الْمَيْتَةِ بِدَعْوَى أَنَّهَا ذَبِيحَةُ اللَّهِ: وَلَا تَأْكُلُوا مِمَّا لَمْ يُذْكَرِ اسْمُ اللَّهِ عَلَيْهِ وَإِنَّهُ لَفِسْقٌ وَإِنَّ الشَّيَاطِينَ لَيُوحُونَ إِلَى أَوْلِيَائِهِمْ لِيُجَادِلُوكُمْ وَإِنْ أَطَعْتُمُوهُمْ إِنَّكُمْ لَمُشْرِكُونَ ، **فَصَرَّحَ بِأَنَّهُمْ مُشْرِكُونَ بِطَاعَتِهِمْ، وَهَذَا الْإِشْرَاكُ فِي الطَّاعَةِ، وَاتِّبَاعِ التَّشْرِيعِ الْمُخَالِفِ لِمَاشَـرَعَهُ اللَّهُ تَعَـالَى هُوَ الْمرَادُ بِعِبَادَةِ الشَّيْطَانِ**)[110]. واتە : وە لـەم ئایەتانەوە ئەوەیش تێدەگەیت بۆ نمونە ﴿**ولا يشرك في حكمه أحدا**﴾[111] کە **شوێنکەوتوانی حوکمی ئەو یاسادانەرانەی کە یاسا دادەنێن کە یاساکەیان ئەو**

[110] أضواء البيان في إيضاح القرآن بالقرآن لإمام الشنقيطي (المتوفى : ١٣٩٣هـ) : ب ٣ / لا ٢٥٩.

[111] (سورة الكهف / ٢٦)

یاسایە نیــە کە اللە دایناوە کە ئەوانە موشریکن بەرامبــەر بە اللە ﷻ ، وە ئەم تێگەیشتنە بە ڕوونکراوەی هاتووە لە ئایەتی دیکەدا ، وەکو ئەو ئایەتەی کە خوای تعالی دەربارەی ئەوانە باسی دەکات کە شوێنی تەشریع و یاسای شەیتان دەکەون لە حەڵاڵکردنی مردوو کە گوایــە ئەمە سەربڕاوی اللە ــە ﷻ (هەروەکو فەرموویەتی) ﴿وَلَا تَأْكُلُوا مِمَّا لَمْ يُذْكَرِ اسْمُ اللَّهِ عَلَيْهِ وَإِنَّهُ لَفِسْقٌ وَإِنَّ الشَّيَاطِينَ لَيُوحُونَ إِلَى أَوْلِيَائِهِمْ لِيُجَادِلُوكُمْ وَإِنْ أَطَعْتُمُوهُمْ إِنَّكُمْ لَمُشْرِكُونَ﴾[112] . واتە : ئەی خەڵکینە گۆشتی ئەوسەربڕاوانە مەخۆن کە ناوی خوای لەسەر ناهێنرێت ، چونکــە ئەمە تاوان و شکاندنی فەرمانی اللە ــیە (جل و علا) ، وە بــیشزانن کە شەیتانە جنەکان هەواڵ دەنێرن بۆ شەیتانە ئیسانەکان کە وەلی و نزیکی خۆیانن تاکو بــێن و موناقەشەی بەتاڵتان لەگەڵ بکەن لەسەر ئەم حەیوانە سەربڕاوانە ، خۆئەگەر هاتوو گوێڕایەڵی ئەوانتان کرد ئەوا بــێگومان ئێوە لە موشریکانن !. ئەوەی ڕوونکردەوە کە بــێگومان ئەوانە موشریکن تەنها بەهۆی گوێڕایەڵییانەوە ، وە ئەم شەریك بۆ قەراردانــە لە گوێڕایەڵی غەیری خوادایە و لە شوێنکەوتن و گوێڕایەڵی یاسایەك کە مخالف و پێچەوانەی ئەو یاســــــایەیە کە اللە ﷻ دایناوە ،ئائــەمە مەبەستییەتی بۆ عیـــــبادەتی شەیتان .

گوتم: ئەمیش لە ژمارەیەکی زۆر لە سەلەفەوە چەسپاوە ، هەروەکو ئیمامی الحاکم و ئەهلی سنن و غەیری ئەوانیش لە ابن عباسەوە..

وە عبدالـرزاق لە قتادەوە و لە غەیری ئەوانیشەوە هاتووە کە فەرموویانە کافران هاتن بۆلای پێغەمبــەر ﷺ و پێیان وت : ئەی محمد ﷺ ئایا تۆ سەربڕاوی دەستی خۆت دەخۆیت کە چی ئاژەڵێك ناخۆیت کە اللە کوشتوویەتی (مرداربۆتەوە) ..؟ بۆیە ئایەتەکە دابەزی ، بۆیــە ئەگەر بۆیەك بابەت بەو شێوازە هەڕەشەی کردبــیت (سبحانه وتعالی) ، ئەی دەبــیت حاڵی کەسێك چی بــیت کە

[112] سورة الأنعام /١٢١

**هەموو یاساکەی بە ئارەزووی خۆی و شەیتان دادەنێت و پشتی لە یاساکەی الله کردووە ؟.**

## بەڵگەی دەیەم

وە خوای تعالى فەرموویەنی ﴿أَفَحُكْمَ الْجَاهِلِيَّةِ يَبْغُونَ وَمَنْ أَحْسَنُ مِنَ اللَّهِ حُكْمًا لِقَوْمٍ يُوقِنُونَ﴾[113]. واتە : ئایا ئەوە داوای حوكمی جاهیلی دەكەن ؟! ، باشە حوكمی كێ لە حوكمەكەی الله باشترە بۆ كەسانێك كە یەقینیان هەیە بەرامبەر بە الله و گومانیان نیە لە پاك و بێ گەردی دینی الله. كەواتە هەركەسێك حوكمی غەیری الله ى بویێت كەواتە گومانی هەیە لە دینی الله ، چونكە ئەگەر دینی الله بە پاك بزانێت ئەوا ڕوولەغەیری الله ناكات .

خوای تعالى سەرزەنشتی ئەوانە دەكات كە حوكمی غەیری خوایان دەوێ ، وە ڕوونی دەكاتەوە بۆمان كە تەواوترین حوكم و باشترینیان حوكمی الله ـیە ، كەواتە ڕووڕەشی بۆ ئەو بەناوموسڵمانانەی كە دەڵێن حوكمی قورئان باشە بەڵام بۆ ئەم سەردەمە نابێت ، نابێت دەستببڕێتەوە و نابێت زانی محصن ڕەجم بكرێت ، ئەم سەردەمە بۆ ئەو حوكمانە ناگونجێ ، پەنابەخوا واتای قسەكەیان ئەوەیە كە خوای تعالى نەیزانیوە كە حوكمێك دابنێت بۆ هەموو سەردەمێك ببێت ئەگەر چی بە زمانیش نەیڵێت بەڵام واتای قسەكەی ئەوەیە ..!بۆیە هیچ گومانێك نیە لە كوفر و ڕیددەی هەركەسێك كە ئیسلامبە تەواوترین و پاكترین و شاملترین حوكم نەزانێت ، ئەمەیە بیروباوەڕمان، وە بانگەوازیشمان بۆ ئەمەیە .

**الإمام الحسن البصري (رحمه الله):**-ئیمامی ابن أبي حاتم نقلی دەكات و دەفەرمووێ : (حَدَّثَنَا أَبِي ثنا هِلالُ بْنُ الْفَيَّاضِ بْنِ أَبُو عُبَيدَةَ النَّاجِيُّ قَالَ: سَمِعْتُ الْحَسَنَ يَقُولُ: **مَنْ حَكَمَ بِغَيْرِ حُكْمِ اللَّهِ فَحُكْمُ الْجَاهِلِيَّةِ**)[114]. واتە : بەو سەنەدە

---

[113] سورة المائدة / ٥٠

[114] تفسير القرآن العظيم لإمام ابن أبي حاتم الرازي (المتوفى: ٣٢٧هـ) / ر.٦٥٠٤ – المحقق: أسعد محمد الطيب – الناشر: مكتبة نزار مصطفى الباز – المملكة العربية السعودية – الطبعة: الثالثة – ١٤١٩ هـ.

لە ئیمامی (گەورەتابعی) حەسەنی بەصری کە دەیفەرموو : هەرکەسێك حوکم بە غەیری حوکمی الله تعالی بکات ئەوا حوکمی بە حوکمی جاهیلی کردووە . واتە غەیری حوکمی الله (جل و علا) جاهیلییە ئەگەر چی لە ژێرهەرناوێکیشدا بـیت ، کەواتە هەڕەشەکەی الله بۆ هەرکەسێکە کـەغەیری حوکمی الله هەڵدەبژێرێت (پەنابەخوای تعالی). چونکە ئەگەر سەیری قورئان و سونەت بکەین باسی دوو حوکم کراوە ، یان حوکمی الله ، یان حوکمی کوفری تاغوتی جاهیلی ، یان حوکمی الله ، یان حوکمی غەیری الله ، یان حکم بما أنزل الله ، یان حکم بغیر ما أنزل الله ، جا کەوتمان حوکم غەیری قورئان ئەمە هەموو شتێك دەگرێتەوە لە غەیری قورئان جا کێیە با ببـیت ، ئائەوە تاغوتە و لە نێوانەدا هیچی تر نیە .

**الإمام إبن كثـــير (رحمه الله)** فەرموویەتی : (**يُنْكِرُ تَعَالَى عَلَى مَنْ خَرَجَ عَنْ حُكْمِ اللَّهِ الْمُحْكَمِ الْمُشْتَمِلِ عَلَى كُلِّ خَيْرٍ، النَّاهِي عَنْ كُلِّ شَرّ وَعَدْلٍ إِلَى مَا سِوَاهُ مِنَ الْآرَاءِ وَالْأَهْوَاءِ وَالِاصْطِلَاحَاتِ، الَّتِي وَضَعَهَا الرِّجَالُ بِلَا مُسْتَنَدٍ مِنْ شَرِيعَةِ اللَّهِ، كَمَا كَانَ أَهْلُ الْجَاهِلِيَّةِ يَحْكُمُونَ بِهِ مِنَ الضَّلَالَاتِ وَالْجَهَالَاتِ، مِمَّا يَضَعُونَهَا بِآرَائِهِمْ وَأَهْوَائِهِمْ، وَكَمَا يَحْكُمُ بِهِ التَّتَارُ مِنَ السِّيَاسَاتِ الْمَلَكِيَّةِ الْمَأْخُوذَةِ عَنْ مَلِكِهِمْ جِنْكِزْخَانَ، الَّذِي وَضَعَ لَهُمُ اليَساق وَهُوَ عِبَارَةٌ عَنْ كِتَابٍ مَجْمُوعٍ مِنْ أَحْكَامٍ قَدِ اقْتَبَسَهَا عَنْ شَرَائِعَ شَتَّى، مِنَ الْيَهُودِيَّةِ وَالنَّصْرَانِيَّةِ وَالْمِلَّةِ الْإِسْلَامِيَّةِ، وَفِيهَا كَثِيرٌ مِنَ الْأَحْكَامِ أَخَذَهَا مِنْ مُجَرَّدِ نَظَرِهِ وَهَوَاهُ، فَصَارَتْ فِي بَنِيهِ شَرْعًا مُتَّبَعًا، يُقَدِّمُونَهَا عَلَى الْحُكْمِ بِكِتَابِ اللَّهِ وَسُنَّةِ رَسُولِهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ. وَمَنْ فَعَلَ ذَلِكَ مِنْهُمْ فَهُوَ كَافِرٌ يَجِبُ قِتَالُهُ، حَتَّى يَرْجِعَ إِلَى حُكْمِ اللَّهِ وَرَسُولِهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فَلَا يَحْكُمُ سِوَاهُ فِي قَلِيلٍ وَلَا كَثِيرٍ، قَالَ اللَّهُ تَعَالَى: ﴿أَفَحُكْمَ الْجَاهِلِيَّةِ يَبْغُونَ﴾ أَيْ: يَبْتَغُونَ وَيُرِيدُونَ، وَعَنْ حُكْمِ اللَّهِ يَعْدِلُونَ. ﴿وَمَنْ أَحْسَنُ مِنَ اللَّهِ حُكْمًا لِقَوْمٍ يُوقِنُونَ﴾ أَيْ: وَمَنْ أَعْدَلُ مِنَ اللَّهِ فِي حُكْمِهِ لِمَنْ عقل عَنِ اللَّهِ شَرْعَهُ، وَآمَنَ بِهِ وَأَيْقَنَ وَعَلِمَ أَنَّهُ تَعَالَى أَحْكَمُ الْحَاكِمِينَ، وَأَرْحَمُ بِخَلْقِهِ مِنَ الْوَالِدَةِ بِوَلَدِهَا، فَإِنَّهُ**

**تَعَالَى هُوَ الْعَالِمُ بِكُلِّ شَيْءٍ، الْقَادِرُ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ، الْعَادِلُ فِي كُلِّ شَيْءٍ)**[115]. واته :
الله تعالى نەهی و ئینکاری لە کەسێك دەکات کە لە حوکمی الله دەربچێت کە حوکمێکە کە پێکهاتووە لە چاکە و خەیرێك و ناهی و ڕێگر لە هەمووخراپە و شەڕێك ، ڕەخنەی گرتووە لەوانەی کە وازیان هێناوە و چوونە بەرەو شتی تر (جگە لەقورئان) ، ئەمیش لە ئارائ و بۆچوونی کە خەڵك دروستیانکردووە کە هیچ بەڵگەیەکی لەسەر نەهاتووە لە دین و حوکمی الله (جل و علا) ، هەروەکو ئەهلی جاهیلی حوکمیان پێدەکرد لە گومڕای و جاهیلەت بەوەی خۆیان دایاننابوو بە بۆچوونی خۆیان ، هەروەکو (تەتار)حوکمی خەڵکیان پێدەکرد لە سیاسەتی پاشایەتی کە لە سەرۆکەکیان جەنگیزخان وەریانگرتبوو کە یاسایەکی بۆ دانابوون بە ناوەی یاسقەوە کە لە کتێبێك پێکهاتبوو کە کۆکراوە لە أحکام و بڕیارەکانەوە وەریگرتبوو لە چەندان شەریعەتی جیاجیا ، لە شەریعەتەکانی نەصرانیەکان و جوولەکە و بەشێکیشی لە شەریعەتی ئیسلام ، وە زۆر حوکم و بڕیاری تری تیابوو کە بە بیروبۆچوون و ئارەزووی خۆی وەریگرتبوو وە دایانبوو ، تاوای لێهات کە ئەم یاسایە لەناو نەوەکانیدا کرا بە یاسایەك کە شوێنی دەکەوتن ، پێشیاندەخست بەسەر قورئان و سونەتدا ، **جا هەرکەسێك ئەم کارە ئەنجام بکات ئەوا کافرە و پێویستە کوشتاری لەگەڵ بکرێت ، تاکو دەگێڕێتەوە بۆلای حوکمی قورئان و سونەت ، تاکو جگە لە قورئانی پیرۆز هیچ کەس و شتێکی تر حوکم نەکات نەلەکەمدا نەلەزۆردا** ، خواە تعالی دەفەرمووێ :
﴿**أَفَحُكْمَ الْجَاهِلِيَّةِ يَبْغُونَ**﴾واتە : ئایا حوکمی جاهیلی داوادەکەن ؟؟ و دەیانەوێ تۆ لە حوکمی الله لابدەن ؟ ، ﴿**وَمَنْ أَحْسَنُ مِنَ اللَّهِ حُكْمًا لِقَوْمٍ يُوقِنُونَ**﴾ واتە : کێ لە حوکمدا لە الله تعالی دادپەروەرترە ؟ بۆکەسێك لە دینی الله (جل و علا) تێگەیشتبێت و ئیمانیشی پێهێنابێت و دڵنیایش بێت لە ڕاستێتی و زانستیشی

[115] تفسير القرآن العظيم لإمام ابن كثير (المتوفى: ٧٧٤هـ) : ب ٣ / لا ١١٩ .

بەوە هەبیت کە الله تعالی چاکترینی حاکمانـــە ، وەزۆر بەبەزیترە لە دروستکراوەکانی لە دایکی خۆیشیان ، چونکە الله تعالی ئاگاداری هەموو شتێکە ، بەتوانایە بەسە هەموو شتێکداو عادلە لە هەموو شتێکدا.

## لێکچوونێکی ڕوون لەنێوان یاسا دەستکردەکانی ئەمڕۆ و یاسای مەغۆل

مەغۆلەکان یاسایەکیان دانا لە چواربەش پێکهاتبوو:

١-بەشێکیان لە ئینجیل وەرگرت .

٢-بەشێکی تریان لە تەورات وەرگرت .

٣-بەشێکیشی لە قورئان .

٤-بەشێکیشی لە بـیروبۆچوونی خۆیان .

بۆیـــە هەموو زانایان کۆدەنگن لەسەرکافرێتیان وە دەرچونیان لەدین ، ڕەنگە کەسانێك بلێن جا مەغۆلەکان خۆیان هەرموسڵمان هەرنەبوون ، کەواتە هۆکاری کافربوونیان حوکمکردن نیە بەغەیری قورئان .

**لەوەڵامدا دەڵێن**: ڕاستــە مەغۆلەکان سەرەتا کە هاتن سەردەمی جەنگیزخان و هۆلاکۆ هەموویان کافربوون وە ئەصلەن بڕوایان بە ئیسلام نەبوو ، بەڵام دواتر دوای ئەم جیلە زۆربەیان بوون بە موسڵمان و هاتنە ناو ئیسلامەوە ، جابەشێکیان هەر لە حکومەتەکە کاریان دەکرد ، وە ئیمامی ابن کثـــیر باسی ئەم جیلە دەکات نەك جیلە پێشتریان ، وە ئەم جیلەیش بە کافر ناودەبات کە شەهادەیشیان دەهێنا و نوێیشیان دەکرد ، هەروەکو فەرمووی : (**وَكَمَا يَحْكُمُ بِهِ التَّتَارُ مِنَ السِّيَاسَاتِ الْمَلَكِيَّةِ الْمَأْخُوذَةِ عَنْ مَلِكِهِمْ جِنْكِزْخَانَ، الَّذِي وَضَعَ لَهُمُ اليَساق وَهُوَ عِبَارَةٌ عَنْ كِتَابٍ مَجْمُوعٍ مِنْ أَحْكَامٍ قَدِ اقْتَبَسَهَا عَنْ شَرَائِعَ شَتَّى**) . واتە : (هەروەکو (تەتار)حوکمی خەڵکیان پێدەکرد کە لە سیاسەتی پاشایەتی کە لە سەرۆکەکیان جەنگیزخان وەریانگرتبوو کە یاسایەکی بۆ دانابوون بە ناوەی یاسقەوە کە لە کتێبـیك پێکهاتبوو کە کۆکراوە لە أحكام و بڕیارەکانەوە وەریگرتبوو لە چەندان

شەریعەتی جیاجیا) . واتە ئەوانەی کە هەموو زانایان لەسەر کافربوونیان کۆك بوون کەسانێك بوون کە خۆیان بە موسڵمان دەزانی ، بەڵام بە یاسایەك حوکمیان دەکرد کە غەیری حوکمی الله بوو وەکو ئەمڕۆ ، تەنانەت حوکمی تەتار باشترێك بوو لە حوکمی ئەمڕۆ ، پێت سەیر نەبێت چونکە بۆتی دەسەلمێنم .

## دەرکەوتنی مەغۆلەکان

لەدوای وەفاتی موجاهید صلاح الدینی ئەیوبی لە ساڵی (٥٨٩) بەچەند ساڵێك دیسانەوە خاچ پەرستان گەلەکۆمەکیەکی تریان کرد و خۆیان سازدایەوە و حەملەی پێنجەمینیان دەستپێکرد بۆسەر موسڵمانان ، سەرەتا لە هەندێ ناوچە سەرکەوتن ، بەڵام دواتر موجاهیدانی میصر تێکیانیان شکاند و بە مل شکاوی گەڕانەوە بۆ وڵاتی خۆیان ، بۆیـــە ئەم ڕق و کینەیە دڵیانی گرتبوو ، بۆیە چوون بۆلای تەتارەکان کە ناوبانگیان دەرکردبوو ، وە هێرشیان بۆ چەند ناوچەیە بردبوو وە تێیدا سەرکەتووبون ، ئەوەیان پێیان ڕاگەیاند کە وڵاتی موسڵمانان وڵاتانێـــــکیخۆش و فراوانە و بەشێکە لەبەهەشت ، وە خورما و هەنگوینی زۆری لێیە ، وە ئافرەتەکانیان دەنارد بۆلای سەربازان و دەسەڵاتدارانی مەغول تاکو داوێن پیسیان لەگەڵ بکەن و هانیشیان بدەن بۆسەر موسڵمانان ، بۆیـــە هێرشی مەغۆلەکان بە هاوکاری بەناوەمەسیحیە خاچ پەرستەکان دەستی پێکرد .

## مەغۆڵەکان کێ بوون

مەغوڵەکان کۆمەڵی هۆزی دەوارنشینی ناوچەکانی لێواری صین و مەنگۆلیا بوون ، بـیروباوەڕیان وابوو کە ئەستێرەیان دەپەرست و دەیانوت یەك خوا لە ئاسمان هەیە بۆیە پێویستە یەك حاکم و دەسەڵاتداریش لەسەر زەوی هەبـێت ، وە دەیانوت خوا ئەو ئەرکەی بە ئێمە سپاردووە ، بۆیـــە لەژێر ئەم بـیرورباوەڕەدا جەنگیز خان هەڵسا بەیەك خستنەوە هۆزەکان وە وڵاتێکی لێدروستکرد کە بەتەتار ناوی دەرکرد وە خۆیشی بوو بە سەرکردە و هێرشیان بۆسەر دەوروبەر دەستپێکرد ، وە لەهەموو شەڕەکاندا سەرکەوتوو دەبوون ، تاکو وای لێهات کە

بەسوارچاك و شەڕەنگێر و بەهێز ناوبانگیان بڵاوبۆیـــەوە ، لـە دوای هاندانەکەی خاچ پەرستان ڕوویان لـە خاکی ئەهلی ئیسلام کرد هەر لـە وڵاتی ترکستان و أفغانستان و بوخارا کەوتنە کوشتن و سەربڕین و لـەناوبردنی ژن و پیاو و منداڵ و بەتەمەنی موسڵمانان وە خانووەکانیان دەسوتان بەسەریاندا و مزگەوتەکانیان دەسوتان و کاری نابەجێیان تێیدادەکرد و هەرچی ماڵ و سامانی موسڵمانان هەیە داگیریان کرد ، کە بە ملیۆنەها موسڵمان کوژرا.

پاشان هۆلاکۆ کە کوڕی جەنگیزخان بوو (نەفرەت و سزای الله لـەسەر هەردویان بـیت) بووبە دەسەڵاتدار و هەمان ڕێچکەی باوکە نەفرەتیەکەی گرتەبەر لـە زوڵم و کوشتن و بڕین و بـیرەحمیدا تاکو وڵاتی فارس و عێراق بەگشتی داگیرکران ، وە گەیشتە بەغدادی ، بەغداد بوو بە قەصابخانەیەك بۆ کوشتنی موسڵمان ، زیاد لـە یەك ملیون موسڵمان تەنها لـە شاری بەغداد بەدەستی سەگ و بەرازەکانی تەتارکوژران و سوتێنران ، وە کوشتارێکی وایان کرد کە ناتوانرێت بە نووسین وەصف بکرێت ، خەڵکی دەچوونە نێو ماڵەکانیان لـە ترسا کەس نەدەچووە دەرەوە ، کەچی وازیا لـەوانیش ناهێناو دەرگاکانیان دەشکاند و هەموویانیان دەکوشتن ، وە دەستدرێژیەکی ئێجگار زۆرکرایە سەر کچ و ئافرەتان لـە شارەکەدا، وە مزگەوتەکانیان دەسوتان و کتێبـیکی ئێجگار زۆریان سوتاند ، وە ئەوەندەی تریان خستە ناو ڕووباری دیجلـەوە ، بۆیـــە کتابـیکی زۆر فەوتا لـەو سەردەمە کە ئێستا ناویان ماوەتەوە بەڵام کتابەکان نەماون ، پاشان چوون بۆ شام و هەمان کارەساتیان بەسەر حەلـەب و شارەکانی تریان هێنایەوە ، پاشان بەرەو دیمەشق ، هەرچەندە بەڵێنی ئەمینیان دا بەخەڵك ، بەڵام کاتێك چوونە ناو شارەکەوە هەمان کارەساتی بوخارا و بغداد و حەلـەبـیان دووبارە کردووە ، پاشان نەخشەیان کێشا بەرەو میصر بڕۆن ، هۆلاکو (لـەعنەتی خوایان لـێبـیت) هەواڵی

پێگەیشت کە براکەی مردووە ، بۆیە ئەمیش لە پێناو دەستگرتن بەسەر حکومەتدا گەڕایەوە بۆ وڵاتی خۆی بە کاتی.

وە بەرازێکی لە بەرازەکانی دانا بە جێگری خۆی بەسەر هێزەکەوە ، بۆیـــە موسڵمانان خۆیان کۆکردەوە وە پێشەوای موجاهید و دڵسۆزی ئومەت (المظفر قطز) هەنگاوێکی زۆر بە پەلەی گرتەبەر و هەڵسا هۆزەکان و مەمالیکەکانـــــــیکۆکردەوە و بانگی جیهادی دا و خەڵکی بانگکرد بۆ جیهاد ، پاشان چوو بۆ هەندێ ناوچەی شام و بەهەمان شێوە بانگی جیهادیدا.

وە یەکێك لەو ئیمامە بەڕێزانەی لەم سەردەمە جێ دەستی دیابوو ، ئیمامی (عیزی کوڕی عبدالسلام) بوو (رحمەالله) ، بانگەوازێکی زۆریکرد بۆ جیهاد و حەماسەت و گیانی تۆڵەی بە گوێی موسڵماناندا، بۆیە ئەم دوو پیاوە جوامێرە بە هاوکاری زۆرێکی تر لە موسڵمانان هێزێکیان نایە یەکەوە و چوونە گژ ئەو هێزە ئاسنین و لوتبەرزەی مەغۆلدا کە تاکو ئێستا نەیانزانیوە شکست چیە ، بە هەزارەهایان لێتۆپاندن ، وە هەزارەهایان لێ بە دیلگرتن و زۆرێکیشیان ڕایان کرد ، ئەم شەڕە بە (عین جالوت) ناسراوە وە دەرگایەك بوو بۆ دووبارە هەڵسانەوەی ئومەتێکی بریندار کە خوێنی لێدەچۆڕێت ، بۆیـــە هێرشی موجاهیدان بەردەوام بوو تاکو لە شام و عێراقیش ڕیشەکێش کران و لەناوبران .

## ئەوەی ئێمە مەبەسمانە

**لەساڵی (٦٩٤ هیجری) یەکێك لە دەسەڵاتدارانی تەتار کە ناوی (قازان) بوو لەگەڵ هەزارەها سەربازی دیکەی تەتار موسڵمانبوونی خۆیان ڕاگەیاند و وازیان لە دینی پێشتریان هێنا .**

بەڵام **شیرینی دەسەڵات وای لێکرد کە واز لە حوکمەکەی نەهێنێت** وهەوڵیدا کە دەسەڵاتەکەی فراوانتر بکات و **حوکمی بەو یاسایە دەکرد کە کاتی خۆی جەنگیزخانی داینابوو،** جا دیسان کوشتاری ئەو هێزە موجاهیدانەی کرد کە داوای گەڕانەوەی خەلافەتی ئیسلامیان دەکرد و شەڕیان دژی تەتار دەکرد ، چونکە

ئەوان هێشتا مەغۆلەکانیان بە کافر دەزانی هەرچەندە شەهادەتیش بـینن و نوێژ بکەن، چونکە ئەمان هێشتا بەو کتابە حوکم دەکەن کە جەنگیزخان بۆی دانابوون ، وە ئامادەنەبوون دەستبەرداری ئەم حکومەتە بن ، بۆیـــە لـە هەموو لایەکەوە فتوای کافرێتی و حەڵاڵی خوێنیان درا ، لەم سەردەمەدا بوو کە شێخی ئیسلام إبن تیمیە دەستێکی باڵای هەبوو لـە بانگەواز بۆ جیهاد و کوشتاری ئەو بەناوموسڵمانانە ، کاتێك جەیشی میصر هاتنەوە و شام و دیمەشقان دووبارە لـە ژێر ئەم مەغۆلانە رزگار کرد ، ابن تیمیەیش وەکو موجاهیدێك بەژدار بوو لـە کوشتن و تۆڵەکردنەوە لـە سەتەمکاران .

بۆیـــە ئەوکاتیش وەکو ئێستا کۆمەڵی نەفام و خزمەتکاری کافر بوونی هەبوو بەناو زاناوە قسەیان دەکرد ، گومانی ئەوەیان بڵاوکردەوە کە دروست نیە کوشتاری مەغۆل بکرێت چونکە ئەوانە موسڵمان بوونە و (ئێستا وەلی ئەمرن بەسەرمانەوە) وە غەیری ئەم قسە هیچ و پوچانەیش ، بۆیـــە شێخی ئیسلام ابن تیمیە وە غەیری ئەو لـە زانایان و شارەزایان لـە ئەهلی سوونە بە توندی دژیان وەستانەوە ، حتی ابن تیمیە بە خەڵکی دەفەرموو : (**إذا رأيتموني في ذلك الجانب (أي في جانب التتار) وعلى رأسي مصحف فاقتلوني**)[١١٦] . واتە: ئەگەر منتان بـینی لەلای تەتاربووم و لـەگەڵیان بووم ، ئەگەر قورئانیشم لەبان سەرم دانابوو بۆ ئەوەی نەمکوژن ، ئەوا ئێوە بمکوژن! . زانایان بەم شێوازە بوون دژی ئەم کافر و ملورانە هەرچەندە خۆیشیان بە موسڵمان بزانن .بۆیە زانایان یەکدەنگ بوون لـەسەر کـــافرێتیان وە کەس جیاوازیتی لـەمەدا نەبوو ئیلا هەندێ نەخۆشی جاهیل.

**ئیمامی إبن کثیر** کە لـەهەمان کاتدا لـەو سەردەمە ژیاوە و کەسێکی شارەزای تأریخ بووە فەرمووی : (**وَمَنْ فَعَلَ ذَلِكَ مِنْهُمْ فَهُوَ كَافِرٌ يَجِبُ قِتَالُهُ، حَتَّى يَرْجِعَ إِلَى**

[١١٦] شرح العقيدة الأصفهانية / ١٥

**حُكْمِ اللَّهِ وَرَسُولِهِ)** واته جا هەرکەسێك ئەم کارە ئەنجام بکات ئەوا کافرە و پێویستە کوشتاری لەگەڵ بکرێت ، تاکو دەگێڕێتەوە بۆلای حوکمی قورئان و سونەت).

وە ئەوانەی ئەمڕۆ حوکممان بۆ دادنێن ئەوروپا و ئەمریکان کە گەورەترین دوژمنی دین و ئیسلامن ، وە ئەمان وەکو مەغۆلیش نین کە خۆیان بە موسڵمان بزانن و نوێژ و ڕۆژوو بگرن ، بەڵکـو تاغوتانی ئەوروپا و ئەمریکا یاساکە دادەنێن وەك پۆڵبلیمەرکردی بۆ وڵاتمان ، وە لە پەرلەمانە لەعینەکانیش ترش و خوێیەکی پێدادەکرێت تاکو وا نیشان خەڵکی بدەن کە یاسایەکی جوانمان بۆتان هێناوە ، حوکمی الله لادەبەن لە وڵات و کاری پێناکەن و حەددەکانی دەشکێنن ، کەچی حوکم یاسای کافران دەهێنن بۆمان و بەزۆر بەسەرماندا دەیچەسپێنن و وە هەرکەسێکیش ڕەخنەی لێبگرێت یان دەیکوژن یان زیندانی دەکەن. وە هەر لەژێر ئەم ناوی دیموکراسی و بەناوئازادییەدا هەموو ڕێگایەك لە موسڵمانان گیراوە کە داوای حوکم و دەسەڵاتی ئیسلام بکەن ، وە لە هیچ کەسێك قبوڵ ناکرێت کە پشت لەم حوکمە بکات لە کاتێکدا الله لەسورەتی النساء[١١٧] فەرمانی پێکردووین پشتی لێبکەین و کوفری پێبکەین هەروەکو فەرمووی : ﴿**وقد أُمروا أن يكفروا بــــه**﴾ ، بەڵام دەبـینین بەچاوی خۆمان وە دەبـیستین کە ئازادی تەواو بە کافران **و موڵحیدان دراوە کە چیانبوێت بـیکەن ، بەناوی بـیدین و سیکۆلارەوە کۆڕ و سیمینار دەبەستن و دژی ئیسلام قسەدەکەن بە ئاشکرا و بە ئاشکرا لەبەردەم کامێرادا سووکایەتی بە پێغەمبــــەرمان (صلی الله علیه وسلم) و دین و ڕیش و حیجاب دەکرێـت** ، هەرکەسێکیش دژی ئەمانە بوەستێتەوە چارەنووسی وەکو هەموو ئەوانەیە کە تەتار پێیانی کرد ، یان کوژران یان زیندانی کران ئینجا ئەشکەنجەدران و سوکایەتی کرایە ســەر کچ و خێزانیان ، ئەمە حوکمی ئەمڕۆیە

---

[١١٧] (الآية / ٦٠)

ئەویش حوكمی تەتار ، چ جیاوازییەك دەبـینیت ؟، ئایا هەردووكی حوكم بە كوفر ناكات ؟ ئایا هەردووكی حوكمی الله ـیان پشتگوێ نەخستە ؟ ئایا هەردووكیان حوكمی خۆیان بە زۆر ناچەسپێنن ؟ ئایا هەردووكیان خوێنرێژ نین بەرامبەر كەسانێك كە حوكمی الله ـیان دەوێت ؟ ئایا هەردووكیان نەبوونە هاوكار و هاوپەیمانی خاچ پەرستان بۆ دژایەتیموسڵمانان و بەزۆر سەپاندنی حوكمی جاهیلی بەسەرخەڵكدا ؟ بەڵكو حوكمی تەتار باشتر و نزیكتر بوو لە حوكمی ئیسلام !!.

## حوكمەكەی تەتار نزیكتر بوو لە حوكمی سەردەم بە نسبەت حوكمی ئیسلامەوە !

بزانە الله (جل وعلا) من و تۆیش هیدایەت بدات : كە ئەم یاسایەی تەتار لە یاساكەی الله ـوە (جل وعلا) زۆر نزیك بوو ، وە زۆرێك لە یاساكانی لە هاووێنەی یاسای الله بوو .

وەكو پێشتر باسمانكرد حوكمی تەتار لە چوار بەش پێكهاتبوو وەك زانا و مفسیر و مؤرخ ابن كثیر باسی كرد ، كە بەشێكی لە ئینجیل و بەشێكیشی لە تەورات و بەشێكیشی لە قورئان و ئەوی تری كە مابۆوە لە ڕەئی و بۆچوونی خۆی دانابوو ، واتا سێ بەشی یاساكەی لە یاسای الله ـوە وەرگرتبوو ! ، هەم ئینجیل هەم تەورات و قورئانیش كتابی الله ـن ، جا تەورات و ئینجیل دەستكاری كراون وە مەنسوخن ، وە قورئانیش ناسخی هەموو كتابەكانی ترە ، واتە ئینجیل و تەورات هەرچەندەش دەستكاری كراون بەڵام حوكمێكی مەنسوخی الله ـن . خوای تعالى خۆی بۆمان ڕوون دەكاتەوە و دەربارەی جولەكەكانی شاری مەدینە دەفەرمووێ : ﴿وَكَيْفَ يُحَكِّمُونَكَ وَعِنْدَهُمُ التَّوْرَاةُ فِيهَا حُكْمُ اللَّهِ ثُمَّ يَتَوَلَّوْنَ مِنْ بَعْدِ ذَلِكَ وَمَا أُولَئِكَ بِالْمُؤْمِنِينَ﴾[١١٨] واتە : جوولەكەكان چۆن دێن بۆلای تۆ و تۆ

[١١٨] (سورة المائدة / ٤٣)

دەکەنە حاکم لە نێوان خۆیاندا ئەی محمد (صلى الله عليه وسلم) ؟ لەکاتێکدا کە خۆیان تەوراتیان پێدراوە و حوکمی الله ـی تێدایە ، لەگەڵ ئەوەیشدا کە کتابەکەی خۆیان حوکمی الله ـی تێدایە و دێن بۆلای تۆیش بەڵام دواتر کە پشت هەڵدەکەن و کار بە هیچیان ناکەن ، بزانن کە ئەوانە بڕوادار نین نە بە قورئان نە بە کتابەکەی خۆیشیان .

پاشان الله (جل و علا) دەفەرمووێ : ﴿إِنَّا أَنْزَلْنَا التَّوْرَاةَ فِيهَا هُدًى وَنُورٌ يَحْكُمُ بِهَا النَّبِيُّونَ الَّذِينَ أَسْلَمُوا لِلَّذِينَ هَادُوا وَالرَّبَّانِيُّونَ وَالْأَحْبَارُ بِمَا اسْتُحْفِظُوا مِنْ كِتَابِ اللَّهِ وَكَانُوا عَلَيْهِ شُهَدَاءَ فَلَا تَخْشَوُا النَّاسَ وَاخْشَوْنِ وَلَا تَشْتَرُوا بِآيَاتِي ثَمَنًا قَلِيلًا وَمَنْ لَمْ يَحْكُمْ بِمَا أَنْزَلَ اللَّهُ فَأُولَئِكَ هُمُ الْكَافِرُونَ﴾[119] . واتە : بەڕاستی ئێمە تەوراتمان داگرتە خوارەوە کە ڕێنمایی و هیدایەت و ڕێگای خوای تعالى ـی تێدابوو ، پێغەمبەران حوکمیان پێکردووە کە بۆ الله ملکەچ بوون وە ئەوانەی الله ڕێنمووی کردبوون و خواناسان و زاناکانیشیان و ئەوانەیشیان کە ئەرکی پاراستنی کتابەکەیان پێسپێدرابوو و شایەتیش بوون لەسەری ، جا ئەی محمد لە کەس مەترسە تەنها لە من بترسە ، وە بەڵگە و دینەکەم بەبەهایەکی کەمی دونیا مەفرۆشن ، جا بزانن هەرکەسێك حوکم بەو قورئانە نەکات ئا ئەوانە کافرن .

وە هەروەها الله تعالى دەربارەی ئینجیل فەرموویەتی : ﴿وَقَفَّيْنَا عَلَى آثَارِهِمْ بِعِيسَى ابْنِ مَرْيَمَ مُصَدِّقًا لِمَا بَيْنَ يَدَيْهِ مِنَ التَّوْرَاةِ وَآتَيْنَاهُ الْإِنْجِيلَ فِيهِ هُدًى وَنُورٌ وَمُصَدِّقًا لِمَا بَيْنَ يَدَيْهِ مِنَ التَّوْرَاةِ وَهُدًى وَمَوْعِظَةً لِلْمُتَّقِينَ﴾[120] . واتە : بەدوایاندا عیسای کوڕی مەریەممان بۆ بەنی ئیسرائیل ڕەوانە کرد کە بڕوای بەو تەوراتە هەبوو لە بەردەستیدا بوو کە بۆ پێغەمبەرانی پێش خۆی نێردرابوو ، وە ئێمە

---

[119] (سورة المائدة / ٤٤)

[120] (سورة المائدة / ٤٦)

ئینجیلمان پێدا كه هیدایەت و ڕێگای حەقی تێدابوو وه ڕوناكی بوو بۆ كەسێك كه حەقی بوێ وه ئەم ئینجیله بەڕاست خستنەوەی تەوڕاتیشی تێدابوو.

بۆیـــــه حوكمی تەوڕات و ئینجیل دوو حوكمی مەنسوخــی الله ــن ، وه قورئانــیش بەهەمان شێوه حوكمێكی ناسخی الله تعالى ــیه ، كەواته یاسا و تەشریعەكەی تەتار سێ بەشی له حوكمی الله پێكهاتبوو ، وه تەنها یەك بەشی لـه بـیروبۆچوونی خۆیان دانابوو ، **كەچی لـەگەڵ ئەمەیشدا كافربوون و زانایان لـه سەرووی هەموویان (شەیخی ئیسلام ابن تیمیه و ابن القیم و ابن كثیر) خیلافیان نەبوو لـه كوفر وریدەیان .**

هەرچەنده خۆ ئەگەر هەموو حوكمەكەیشیان لـه ئینجیل یان تەوڕات پێكبهاتایه ، ئەوا ئەوكاتیش هەركـــافر دەبوون ، **هەركەسێك حوكم به ئینجیل بكات و واز لـه قورئان بهێنێت به یەكدەنگی هەموو زانایان كافر دەبـیت** لـه كاتێكیشدا ئینجیلكتابی خوای تعالى یه ، هەركەسێكیش حوكم به تەوڕات بكات و واز لـه قورئان بهێنێ دیسان به ئیجماعی هەموو زانایان كافره چونكه قورئان ناسخی هەموو كتابەكانی تره.

**الإمام ابن حزم (رحمه الله)** ئیجماع نقڵ دەكات و دەفەرمووێ :(**لا خلاف بـين المسلمين أن من حكم بحكم الإنجيل مما لم يأت بالنص عليه وحي في الشريعة الإسلام ، فإنه كافر مشرك خارج عن الإسلام**)[١٢١]. واته موسڵمانان خیلافیان لـەوەدا نیه كه هەركەسێك حوكم به حوكمی ئینجیل بكات كه لـه یاسای ئیسلامدا ئاماژەی پێنەكرابوو ، ئائەو حاكمه كافر وموشریكـه و لـەدەرەوەی بازنگەی ئیسلامــه .(دواتر به تفصیلی باسی ئەم بابەتەدەكەین خوای تعالى هاوكار بـیت.)

**گوتم**: ئەی ئەگەر حاڵی حوكم كردن به تەوڕات و ئینجیل بەم شێوازه ترسناك بـیت ، ئەی دەبـیت حاڵی حاكمێك چۆن بـیت كه حوكمی الله لادەدات و به

[١٢١] الأحكام : ٥/١٧٣

ئارەزووی خۆی حوکم دەنوسێتەوە ، بــێگومان کوفر و ڕیددەی ئەمە زۆر ڕوونتر و ئاشکراترە و هیچ گومانێکمان لـەمەدا نیە ، هەروەکو ابن کثیریش ئاماژە بەم خاڵە گرنگە دەکات و فەرموویەتی (**فَمَنْ تَرَكَ الشَّرْعَ الْمُحْكَمَ الْمُنَزَّلَ عَلَى مُحَمَّدِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ خَاتَمِ الْأَنْبِياءِ وَتَحَاكَمَ إِلَى غَيْرِهِ مِنَ الشَّرَائِعِ الْمَنْسُوخَةِ كَفَرَ، فَكَيْفَ بِمَنْ تحاكم إلى الياسا وَقَدَّمَهَا عَلَيْهِ؟ مَنْ فَعَلَ ذَلِكَ كَفَرَ بِإِجْمَاعِ الْمُسْلِمِينَ**)[١٢٢]. واته: هەرکەسێك واز لـەو حوکمە چەسپاوە بهێنێ کە الله تعالى بۆ پێغەمبــەرمان محمد (صلى الله علیه وسلم) ڕەوانەی کردو حوکمی بۆلای غەیری قورئان بردەوە لـە یاسامەنسوخەکانی تر (وەکو تەوڕات و ئینجیل) کافربووە ، ئەی دەبــێت حوکمی ئەوە چۆن بــێت کە حوکم بۆلای حوکم و یاسای دەستکردی مرۆڤەکان دەباتەوە و ئەوە دەخاتە پێشی حوکمی الله (کە حوکم بە حوکمی الله ناکات کەچی ڕوو لـە یاسای مرۆڤەکان دەکات) ، جا هەرکەسێك وابکات کافربووە بە یەکدەنگی هەموو موسڵمانان .! . **وە هەروەها تەتار زۆرێك لـە سزاکانی مطابقی حوکمی ئیسلام بوون : وەکو کوشتنی داوێن پیس و ساحیر و جاسوس و هاوڕەگەزباز و غەیری ئەمانیش** ، هەروەکو ئیمامی ابن کثیربۆمانی نقڵدەکات[١٢٣] لـە الجوینیەوە ، بەڵام لـە هەندێ بابەتدا جیاواز بوو لـە حوکمی الله وەکو کوشتنی دز هەندێ أحكام کە وەکو ئەمڕۆ لـە حوکمی الله لایدابوو لـەگەڵ ئەمەیشدا زانایان بە ڕوونی دان بە کوفروڕیددەیانا دەنێن.

**شيخ الإسلام ابن تيمية (رحمهالله)** فەرموویـــــەتی :(**بَلْ كَثِيرٌ مِنَ الْمُنْتَسِبِـينَ إِلَى الْإِسْلَامِ يَحْكُمُونَ بِعَادَاتِهِمُ الَّتِي لَمْ يُنْزِلْهَا اللَّهُ سُبْحَانَهُ وَتَعَالَى، كَسَوَالِفِ الْبَادِيَةِ، وَكَأَوَامِرِ الْمُطَاعِينَ فِيهِمْ ، وَيَرَوْنَ أَنَّ هَذَا هُوَ الَّذِي يَنْبَغِي الْحُكْمُ بِهِ دُونَ الْكِتَابِ وَالسُّنَّةِ ، وَهَذَا هُوَ الْكُفْرُ**)[١٢٤]. واته : بەڵکو زۆرێك لـەوانەی کە خۆیان داوەتەپاڵ

---

[١٢٢] البداية والنهاية لإمام ابن كثير الدمشقي (المتوفى: ٧٧٤هـ) : ب ٣ / لا ١١٩ .

[١٢٣] البداية والنهاية لإمام ابن كثير الدمشقي (المتوفى: ٧٧٤هـ) : ب ٣ / لا ١١٨.

[١٢٤] منهاج السنة النبوية : ٥/١٣٠

ئیسلامدا و خۆیان بە موسڵمان دەزانن حوکم بە داب و نەریتەکانیان دەکەن کە الله لـە قورئاندا باسی نەکردووە و داینەگرتووە ، وە ئەمرەکانی ئەوانەی کە گوێڕاییەڵیان دەکرێت لـەناو خۆیاندا ، وە ئەمە بە شیاوی ئەوە دەزانن کەببێتە حوکمی وڵات لـە غەیری قورئان و سونەت ، وە ئائەمە کوفرە[125] .

## وە هەر پرسیار لە شەیخی ئیسلام ابن تیمیە دەکرێت کە ئایا کوشتاری تەتار بکەین لە کاتێکدا کە شەهادەت دەهێنن و خۆیان بە موسڵمان دەزانن؟

شەیخی ئیسلام ابن تیمیە رحمه الله بەم شێوازە وەڵامی داوەتەوە : (**الْحَمْدُ لِلَّهِ، كُلُّ طَائِفَةٍ مُمْتَنِعَةٍ عَنْ الْتِزَامِ شَرِيعَةٍ مِنْ شَرَائِعِ الْإِسْلَامِ الظَّاهِرَةِ الْمُتَوَاتِرَةِ" مِنْ هَؤُلَاءِ الْقَوْمِ وَغَيْرِهِمْ فَإِنَّهُ يَجِبُ قِتَالُهُمْ حَتَّى يَلْتَزِمُوا شَرَائِعَهُ وَإِنْ كَانُوا مَعَ ذَلِكَ نَاطِقِينَ بِالشَّهَادَتَيْنِ وَمُلْتَزِمِينَ بَعْضَ شَرَائِعِهِ كَمَا قَاتَلَ أَبُو بَكْرٍ الصِّدِّيقُ وَالصَّحَابَةُ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمْ مَانِعِي الزَّكَاةَ. وَعَلَى ذَلِكَ اتَّفَقَ الْفُقَهَاءُ بَعْدَهُمْ بَعْدَ سَابِقَةِ مُنَاظَرَةِ عُمَرَ لِأَبِي بَكْرٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا. فَاتَّفَقَ الصَّحَابَةُ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمْ عَلَى الْقِتَالِ عَلَى حُقُوقِ الْإِسْلَامِ عَمَلًا بِالْكِتَابِ وَالسُّنَّةِ.**)[126] . واتە : سوپاس بۆ الله ، هەر جەماعەتێك ڕێبگرن لـە ملکەچ بوون و پابەندبوون بە یاسایەك لـە یاسا زاهیر و ئاشکراکانی ئیسلامەوە کە بە متەواتری پێمان گەیشتووە ، جا (لـەتەتارەکان) بـیت یان غەیری (تەتارەکان) ئەوا واجبە کوشتاریان لـەگەڵ بکرێت هەتاکو ملکەچی یاساکانی ئیسلام دەبن ئەگەر چی شەهادەتیش بـینن بە لاالـەالاالله و محمد رسول الله و ملکەچ و پابەندی هەندێك لـە یاساکانی بن ، هەروەکو چۆن ئیمامی أبوبکری صدیق کوشتاری کەسانێکی کرد کە مەنعی زەکاتیان کردبوو وە زانایان خیلافیان نیە لـە دوای گفتوگۆکەی أبوبکر و عمرەوە لـەسەر کوشتاری ئەوەی کە مافەکانی

[125] بـێگومان ئەم کوفرە کوفری گەورەیە ، چونکە هەر شەیخی ئیسلام خۆی دەفەرمووێ ئەگەر (ال) لکا بە کوفرەوە ئەوا مقصود پێی کوفری گەورەیە بڕوانە:اقتضاء الصراط المستقيم مخالفة أصحاب الجحيم / ٢٠٨

[126] مجموع الفتاوى لشيخ الإسلام احمد ابن تيمية الحراني (المتوفى: ٧٢٨هـ) : ب ٢٨ / لا / ٥٠٢.

ئیسلام پێشێل دەکات ، وە بەراستی هاوەڵان یەکدەنگ بوون لەسەر کوشتار لە پێناو مافەکانی ئیسلام و کاریان بە قورئان سونەت کرد

بۆئەم بابەتە.

گوتم : ئەگەر هەموو هاوەڵان یەکدەنگ بن لەسەر کوفر و ڕیددەی ئەوەی کە تەنها زەکات نادات ، ئەی حوکمی ئەو کەسانە دەبێت چی بێت کە حوکمی الله تعالی ـیان بەتەواوی تعطیل کردووە و کاری پێناکەن ، لە جێی ئەوە حوکمێکی لەعینی کوفری پیسی دەستکردی خۆیان لە وڵات دەچەسپێنن ، حەددەکان جێبەجێ ناکەن ودەستکارییان کردووە . ئەگەر تەتارەکان کافربن بەهۆی گۆڕینی یاساکانی ئیسلامەوە لە کاتێکدا کە زۆرێك لە حوکمەکانیان حوکمی الله ﷻ بوو، ئەی دەبێت حوکمی کەسێك چی بێت کە لەجیاتی حەدد و سزا ئازادی بە داوێن پیسان بدات و شوێن و کۆمەڵەی تایبەتیان بۆ دروست بکات ؟؟ ئەی دەبێت حوکمی کەسێك چی بێت کە لەجیاتی حەدد و سزا ئازادی بە عەرەق خۆران بدات و بە ئازادی لە وڵات بفرۆشرێت ، وە یاساکانی الله ﷻ پشتگوێ دەخات و حوکم بە حوکمی دیموکراسی کوفری دەکات ؟ ئەی دەبێت حوکم کەسێك چی بێت کە بەناوەی ئازادییەوە ئازادییەکی تەواو بە کافران و مولحیدان دەدەن تاکو دژایەتی ئیسلام بکەن و کۆڕ و کۆمەلەیشیان بۆ دروست دەکات ؟ ئەی دەبێت حوکمی کەسێك چی بێت کە یاسا پاکەکەی الله ﷻ ی فڕێ داوە و یاسایەکی ئەورووپی کوفری هێناوە کە دز لەجێی ئەوەی تەمبێ بکرێت و خەڵك پەندی لێوەربگرێت کەچی زیندانی دەکات و ماوەیەك وەکو دابەستە نانی دەدات و دواتر ئازادی دەکات ، ئەمانە هەمووی گۆڕینی حوکمی الله ﷻ ـیە بە حوکمی غەیری الله ﷻ ، جا هەرکەسێك ئەمە بکات کافرە و موسڵمان نیە ، تەنانەت زانایان خیلافیان لەوەدا نیە کە یەك یاسایش بگۆڕیت کافر دەبێت ، ئەی دەبێت حاڵی حاکمێك چیبێت کە ئەو هەموو یاسایەی گۆڕیوە کە زانایان هیچ گومانیان

نیه لـه کوفر و ڕیدەی خاوەنەکەی ، چونکە حوکم کردن بە شەرعە مبدل کوفـرە .

## سێ جۆر لە شەرعمان هەیە

**الشرع المنزل** : ئەو شەرع و یاسایەیە کە خوای تعالی بۆی ناردووین وە فەرمانی پێکردووین کە دەستی پێوەبگرین و سزای قورسی داناوە ﷻ بۆ کەسێك کە پابەندی نابـیت .

**الشرع المؤول**: ئەو بـیروبۆچونانەیە کە زانایان إجتهادی پێدەکەن و تێکەڵ بە دین دەکرێت ئەمیش مەرجە لـەسەر ئەساسی قورئان و سونەت بـینا بکرێت وە کو پێنج مەزهەبەکە، بۆ ئەمەیان نابـیت خەڵك ناچاربکرێت تاکو شوێنی یەکیان هەربکەوێت ، چونکە حجە نیە، ئەوەی حوججە بێت تەنها قورئان فەرموودەیە، غەیری ئەوە وتەی هەرکەسێك بێت لـێی وەردەگیرێت گەر مطابقی قورئان وسونەت بێت، وە ڕەت دەکرێتەوە گەر پێچەوانەی قورئان وسونەت بێت.

**الشرع المبدل**: بریتیە لـە گۆڕین و لادانی یاساکانی الله و هێنانی حوکمی غەیری ئەو ، جا ئەمەیش دووجۆرە :

أ- (تبدیل): ناونانی ئەو حوکمەی غەیری خوا بە حوکمی خوای تعالی ، واتە کەسێك حوکمی الله ﷻ ی لاداوە و حوکمێکی تری هێناوە و حوکمەکەی خۆی بە حوکمی الله ﷻ دەناسێنێت و دەڵێت ئەمەیش حوکمی الله ـە ﷻ.

ب- (استبدال): جۆری دووەم لادانی حوکمی الله ﷻ و هێنانی یاسایەکی دیکە ، جا هەریاسایەك بـێت ، خاوەنی کوفری پێشووتر حوکمەکەی دەدایە پاڵ خوای تعالی هەرچەندە حوکمەکەی الله ـیش نەبوو ﷻ ، بەڵام ئەمیان یاساکەی الله ﷻ ـی لاداوە و بە کەیف و ویستی خۆی یاسایەکی تری هێناوە و هیچ حسابـیك بۆ الله و حوکمەکەی ناکات وە ئەصڵەن هیچ لـەلای گرنگ نیە کە ئایا حوکمەکەی لـەگەڵ حوکمی الله ﷻ یەکدەگرێتەوە یان نا ، وەکو حوکمی حاکمانی سەردەم، وە حوکمەکەی مەغۆل کە ئەوە یەکەمین گۆڕینی حوکمی الله

ﷻ بوو بە حوكمی غەیری ئەو لە مێژووی موسڵمانانەدا ، **بۆیە هەموو زانایان یەكدەنگ بوون لەسەر كوفر و ڕیددەیان** ، وە هەرحاكمێكیش لەم سەردەمەدا هەمان كار دووبارە بكاتەوە و یاسای الله لابدات و یاسایەكە غەیری ئەو بهێنێت پێی كافر دەبێت و مافی بە ئیسلامەوە نامێنێت ، خوای تعالى دەفەرمووێ : ﴿**ومن لم يحكم بما أنزل الله فأولئك هم الكافرون**﴾[127] واتە : هەركەسێك حوكم بە یاساكەی الله نەكات ئەوا لە كافرانە ، لەوانەیە بوترێت إبن عباس وتویەتی ئەوە كوفری بچوكە !.

سەرەتا تێبینیەكی زۆرمان لەسەر سەنەدەكەی هەیە ، دواتر گریمان وتمان صحیحە ، ئایا ابن عباس مەبەستی چیە ، ئایا ئەصڵەن پرسیارت لە خۆت كردووە كە سەردەمی إبن عباس لادانی حوكمی الله هەرنەبووە ؟؟ .

**ئایا دەزانیت یەكەمین لادانی حوكمی الله (٦٠٠) ساڵ دوای إبن عباس لەسەردەمی مەغۆل ڕوویدا ؟ سەردەمی هاوەڵان و تابعین و دوای ئەوانیش ئەم گۆڕینی حوكمە نەبووە تا بڵێن لادانی حوكمی الله كوفری أكبرە .**

**ئیمامی عبدالرحمن بن قاسم النجدی** رحمه الله لە الدررالسنية لە بەرگی (١٦) سەرەتای بابی (١٠) سەبارەت بە دەركەوتنی ئەم یاسادەستكردانە دەفەرمووێ نە سەردەمی پێغەمبەری خواو نە ئیمامەكانی سەلەف بوونی نەبووە ، بەڵكو دواتر پەیدابووە ، هەروەكو فەرموویەتی **(لم تكن في عصر الشيخ عبد الله، ولا في عصر النبوة، ولا الأئمة المهديين" وإنما سرت إلينا من أفراخ الإفرنج المنحلين، المعرضين عن شرع رب العالمين، فجاؤوا بنظمهم يطبقونها على المسلمين)**[128] .

---

[127] (سورة المائدة / ٤٤)

[128] الدرر السنية : ١٧١/١٦

وەهەروەها فەرموویەتی (**الفصل الثالث: ما يسمى بالنظم وبالقانون لم يكن يعرف في عهد سلفنا**)[129]. واتە : فەصڵی سێیەم : ئەوەی کە ناودەنرێت بە یاسا و قانون کەلەسەردەمی سەلەف نەناسرابوو.

پاشان دەفەرمووێ : (**ما يسمونه بالنظم، وقد يسمى بالقانون، وغير ذلك، ولكل دولة فيه اصطلاح، وقد يختم كل نظام بوجوب الحكم به، وللدولة نظم عديدة، كنظام الوزراء، والمحاكم، وكنظام البنوك، ونظام العمل والعمال، وسائر الدوائر، ولم تكن تلك تعرف في عهد سلفنا، ولا في عهد السلف الصالح**)[130]. دیسان جەخت لەسەر ئەوە دەکاتەوە کە ئەم قانون و یاساتازانە کە هاتوون لەسەردەمی سەلەف بوونی نەبووە.

بۆیە جوابی ئەم شوبهە بچوکە لە شوێنی خۆی دەدینەوە بە یارمەتی الله تعالى .

ئیمامی ابن حزم رحمه الله فەرموویەتی (**فلا فرق بين جواز شرع الشريعة من إيجاب او تحريم او اباحة بالرأي لم ينص تعالى عليه ولا رسوله وبين إبطال شريعة شرعها الله على لسان رسوله بالرأي ، والمفرق بين هذين العملين متحكم بالباطل مفتر وكلاهما كفر لا خفاء به**)[131] . واتە جیاوازی نیە لە بە جائیز دانانی یاسایەك کە واجب بکات و حەڵاڵ و حەرام بکات وە بە جائیزدانانی بیربۆچونانێك کە الله و پێغەمبەرەکەی باسیان نەکردبیت ، لەگەڵ لەکار خستنی یاسایەك کە کە خوای تعالى دایناوە ، **وە هەرکەسێك کە جیاوازی بکات لە نێوان ئەم دوو کارە بکات ئەو بڕیارەکەی پڕوپوچ و درۆیە ، (چونکە) هەردوو کارەکە کوفرە و شتێکی نادیار نیە.)** . یان دەگوترێ تۆ نابێ بەو حاکمە بڵێی کافر چونکە لەوانەیە خۆی حەزی بەئەو نەبیت یان دڵی پیی ڕازی نەبیت ، ئەمە وتەی جەهمیە کافرەکانن

---

[129] (ب ١٦/لا ٢٣٣)

[130] الدرر السنية : ٢٣٣/١٦

[131] (الأحكام : ٣١/٦

ئەمڕۆ لـە ژێر ناوی ئەهلی سوونە بۆمان دێننەوە ، ئینسان کاتێك کوفرێك دەکات بێ گومان لـە دڵـیەوە دەیکات ئیللا لـە یەك حاڵـەت نەبـیت ، ئەویش ئیکرایە .

واتە بە زۆر ئەو کوفرەی پێبکرێت ، تەنها لـەم حاڵـەتەدا دڵ و زمان جیاوازن ، یان دڵ و جەستە مطابق نین ، کەسێکی ئیمانداری یەکخواپەرست بەزۆر کوفرێکی پێدەکرێت ئەگینا دەکوژرێت ، ئەم کەسە ڕێگەی پێدراوە کە کوفرەکە بکات بەڵـام لـە دڵـیەوە پێی ناخۆش بـیت ، وە لـە دڵـیدا ئیمانی الله ﷻ هەبـیت ، ئەمە تاکە شوێنە کە ئینسان کوفر دەکات بەڵـام بە ویستی خۆی نیە ، خوای تعالى ـیش دەفەرمووێ : ﴿**من كفر بالله من بعد إيمانه إلا من أُكره وقلبه مطمئن بالإيمان ولكن من شرح بالكفرصدراً**﴾[132] . خوای تعالى تەنها إكراهي كردە عوزر و غەیری ئەوە نابـیتە بـیانوو بۆ ئەوەی کە کەسێك دەبـینیت کوفر دەکات و تۆ بڵـێی کێ دەڵـێ ئەوە لـە دڵـەوە دەیکات ، یان کەسێك داوا لـە غەیری الله ﷻ دەکات یان سوجدە بۆ قەبرێك دەبات ئەمە بـیدعەیە ئەگەر بوترێت پێویستە پرسیاری لـێبکرێت ئایا تۆ ئەمە بەحەڵـاڵ دەزانیت یان نا، وەکو ئەوە وایە تۆ بڕوات بەوە نەبـیت کە کوفری عملی و قەولی هەیە کە بـیروباوەڕی جەهمی و غولاتی مورجیئەیە ، چونکە کوفر هەر کوفرە و پێویست بە إستحلالی کوفر ناکات تاکو تۆ تکفیری بکەیت ، مەسەلـەی حوکمیش هەروایە ، حوکم کردن بە یاسای دەستکرد و لادانی حوکمی الله کوفرە و پێویستی بە إستحلال ناکات تاکو بکرێت بە مەرجی کافربوونی چونکە بەڵـگەیەکی ئیجگار زۆری لـەسەرە کە تاکو ئێستا بەشێکیمان باسکردووە ، بۆیە تۆ کاتێك کەسێك دەبـینیت حوکم بەغەیری قورئان دەکات یان سوجدە بۆ قەبرێك دەبات ئەمە بە ئارەزووی خۆیان دەیکەن ، خۆ ئەگەر لـە دڵـیشەوە بڕوای پێنەبێت بەڵـام لـەبەر تەماحێکی دونیا ئەو کوفرە بکات هەرکافرە ، وەکوفرەکەی هیچی کەمتر نیە لـە کوفری یەکەم ، کەسمان نەبـینی لـە حاکمەکانی ئەمڕۆ بە زۆر

---

[132] (سورة النحل / ١٠٦)

کاری پێبکرێت ، سەرۆکی وڵاتێك کە ئەو بەڕێوبەری ئەو وڵاتەیە کێ بـینویەتی بە زۆر و لەژێر هەڕەشەی کوشتندا حوکم بکات ، ئەمە قسەی کەسانێکە کە أصڵەن خۆیان بڕوایان بە قسەکەی خۆیان نیــە .

بەڵام لە چەند بابەتێکی تایبەت و معین ـدا باسی استحلال دێتە پێشێ کە باسی دەکەین ، ئەگینا لە بابەتی تبدیل و استبدال و تشریعدا ئەم بـیانوانەی کە باسدەکرێت هیچی عوزر نیە و خاوەنەکەی لە سزای الله تعالی ڕزگار ناکات ، بۆیە کوفر کردن لـــــەم بابەتانەدا بە کاروکردەوە و زمان لەگەڵ کوفر کردن لە دڵەوە هیچ جیاوازییەکی نیە.

**شیخ الإسلام ابن تیمیة** رحمه الله فەرموویەتی : **(وبالجملة فمن قال أو فعل ما هو كُفرٌ كَفَرَ بذلك، وإن لم يقصد أن يكون كافراً إذ لا يقصد أحد الكفر إلا ماشاء الله)**[133] . واتە جا هەرکەسێك کوفرێك بلێت یان بـیکات پێی کافر دەبـێت ئەگەر ئەگەر چی مەبەستیشی کوفر نەبـێت . وە هەر ئیمامی ابن تیمیة لە الصارم[134] و ئیمامی ابن القیم ـیش لە کتابـی الصلاة[135] زۆر بە جوانی وەڵامی ئەم گومانانەیان دەداتەوە و ئێمە لێرە زیاتر درێژە بە باسەکە نادەین.

**گوتم**: جا بابەتی لادانی حوکمی الله عز وجل لە وڵاتدا کوفرە ، جا هەرناوێکی لێدەنێن گرنگ نیە ، تبدیل بـیت یان استبدال ، چونکە استبدالیش بەشێکە لە تبدیل بۆیە تەواوتر وایە بلێین تبدیل ، تبدیل زیاتر ئەوە دەگرێتەوە کە کەسێك بەناوەی دینەوە بیکات، بەڵام استبدال تەشریعێك دەگرێتەوە کە بەناویش نادرێتە پاڵ الله عز وجل کە ئەمە ترسناکترین بەشی حکم بغير ما أنزل الله ـە، بۆیە هەرکامێکیان بـیت هەر کوفرە .

---

[133] الصارم المسلول على شاتم الرسول لشيخ الإسلام ابن تيمية الحراني الحنبلي / لا (١٧٧)

[134] الصارم المسلول على شاتم الرسول لشيخ الإسلام ابن تيمية الحراني الحنبلي / لا (٥٢٤)

[135] لا (٥٣)

**شەیخی نەجدی محمد بن ابراهیم ال شێخ** رحمه الله فەرموویەتی : (**إن من الكفر المبين استبدال الشرع بالقانون اللعين فمن بدل دين الله** عزوجل **رأساً على عقب كفر**)[١٣٦] .
واتە لە جۆرەکانی کوفری ئاشکرا ئەوەیە إستبدالی حوکمی الله بە حوکمی یاسا دەستکردە لەعنەتییەکان بکەیت ، هەرکەسێك دینی الله لە سەرەوە تاکو خوار هەرچیەکی بگۆڕێت کافردەبـیت .

شەیخی بەڕێز استبدال و تبدیل بۆ یەك مەبەست بەکار هێنا .

**شەیخ عبدالعزیز الراجحی** رحمه الله لە تعقیلی لەم بابەتەدا بەهەمان شێوە لەدوای ئەوەی دەربارەی یاسادەستکردەکانی سەردەمەوە پرسیاری لێدەکرێت دەفەرمووێ : (**على كل حال الإنسان الذي يغير شرع الله ودينه رأساً على عقب فإن هذا بدل الدين كما قرر أهل العلم كالحافظ ابن كثير رحمه الله، والشيخ محمد بن إبراهيم رحمه الله مفتي الديار السعودية له رسالة في تحكيم القوانين**)[١٣٧] . واتە : بەرحاڵ ئەو کەسەی کە شەرعی الله عزوجل و دینەکەی دەگۆڕێت (بۆیاسا دەستکردەکان) لە سەریەوەبـیت یان لە کۆتای ، بەڕاستی ئەمە دینی گۆڕیوە هەروەکو زانایان وەکو ئیمامی ابن کثیر و محمد بن ابراهیم ال شیخ دانیانپیدا ناوە .واتە لادانی حوکمی الله و هێنانی حوکمی غەیری ئەو لە ژێر هەناوێکدا بـیت ئەوا تبدیلی دینی الله عزوجل ـی کردووە و پێی کافر بووە . زانایانیش بەو شێوازە فێرمان دەکەن.

**شەیخی فەرموودەناس أحمد شاكر** رحمه الله فەرموویەتی (**إن الأمر في هذه القوانين الوضعية واضح وضوح الشمس هي كفر بواح لا خفاء فيه ولا مداراة ولا عذر لأحد ممن ينتسب للإسلام -كائنا من كان- في العمل بها أو الخضوع لها أو إقرارها**)[١٣٨]واتە : ئەوەی ڕوونە دەربارەی ئەم یاسا دەستکردانە ڕووناکە وەکو

---

[١٣٦]مجموع الفتاوى الشيخ محمد بن إبراهيم : ١٢/ ٢٨٠

[١٣٧]سەرچاوەی پێشوو

[١٣٨]عمدة التفسير عن الحافظ ابن كثير لإمام المحدث أحمد شاكر : ب (٤)/ لا (١٧٤).

ڕوناکی خۆر کە کوفرێکی ئاشکرایە و ئەمە هیچ نادیار نیە ، وە هیچ کەسێك عوزری بۆ نیە کە کار بەم یاسایە بکات جا کێیە با ببـیت .

**شەیخی ئیسلام ابن تیمیە** رحمه الله هەروەکو لـە مجموع الفتاوی هاتووە فەرموویەتی : (**والإنسان متى حلل الحرام المجمع عليه أو حرم الحلال المجمع عليه أو بدل الشرع المجمع عليه كان كافراً مرتداً باتفاق الفقهاء**)[139] واتە : وەهەرکاتێك ئینسان حەرامێکی خوای تعالی ـی حەڵاڵ کرد کە بە ئیجمـــاع حەرامە ، یان حەرامێکی حەڵاڵ کرد کە بە ئیجماع حەرامە ، یان یاسایەکی الله تعالی ـی گۆڕی کە بە ئیجماع یاسای الله عزوجل بوو ، ئەوا کافر و مورتەددە بە ئیجماعی هەموو زانایان .

[139] مجموع الفتاوى لشيخ الإسلام احمد ابن تيمية الحراني (المتوفى: ٧٢٨هـ) : ب (٣) / لا / (٣٧٦)

# بەڵگەی یازدەهەم

الله تعالى فەرموویەتی ﴿وَاللَّهُ يَحْكُمُ لا مُعَقِّبَ لِحُكْمِهِ﴾[140]. واتـــه الله تعالى حوكم دەدات و پرسیاری لێناكرێت كە بۆچی ئابەوشێوازە حوكمی داوە و لـە كەسیش قبوڵ ناكات حوكمی ئەو لابدات . الحكم ناوێكە لـە ناوەكانی الله تعالى ، بۆیە ئەمە وابەستەی حاكمیەت و ئەسماء و سیفاتە ، هەروەكو چۆن حاكمیەت لـەگەڵ ئلوهیەت و ڕبوبـیەتیش پێكەوە گرێدراون ، بۆیە الله تعالى تەنها خۆی حاكمە، وە الحكم بە كەسێك دەگوترێ كە چۆن بـیەوێت ئابەوشێوازە حوكم دەدات و كەس ناتوانێ بـیـت بە ڕێگر لـێی هەروەكو ئەهلی عـــیلم فەرموویانە، بۆیە ئەم تایبەتمەندیەیش تەنها شایەنی الله تعالى یە .

تەنانەت پێغەمبــەری خوا ﷺ پێی ناخۆش بووە كە كە سێك بە حكم یان بە أبو الحكم بانگبكرێت ئەگەر تەنها ناویش بـیــت ، ئەی ئەگەر لـەم سەردەمە بوایە چی دەفەرموو ؟ ، ئیمامی أبوداود و غەیری ئەویش ڕیوایەتیان كردووە لـە شوریحەوە لـە باوكیەوە كە دەفەرمووێ : (أَنَّهُ لَمَّا وَفَدَ إِلَى رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ مَعَ قَوْمِهِ سَمِعَهُمْ يَكْنُونَهُ بِأَبِي الْحَكَمِ، فَدَعَاهُ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، فَقَالَ: «إِنَّ اللَّهَ هُوَ الْحَكَمُ، وَإِلَيْهِ الْحُكْمُ، فَلِمَ تُكْنَى أَبَا الْحَكَمِ؟» فَقَالَ: إِنَّ قَوْمِي إِذَا اخْتَلَفُوا فِي شَيْءٍ أَتَوْنِي، فَحَكَمْتُ بَـينَهُمْ فَرَضِيَ كِلَا الْفَرِيقَيْنِ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: «مَا أَحْسَنَ هَذَا، فَمَا لَكَ مِنَ الْوَلَدِ؟» قَالَ: لِي شُرَيْحٌ، وَمُسْلِمٌ، وَعَبْدُ اللَّهِ، قَالَ: «فَمَنْ أَكْبَرُهُمْ؟» قُلْتُ: شُرَيْحٌ، قَالَ: «فَأَنْتَ أَبُو شُرَيْحٍ»)[141] . واتە كاتێك هانیئ هاتە خزمەتی پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) لـەگەڵ عەشیرەت و كەس و كارەكەیدا ، پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) گوێی لـێبوو كە خەڵكەكە بە هانیئ دەڵێن (أبو الحكم) ، پێغەمبــەری خوا (صلى الله عليه وسلم) بانگی كرد و فەرمووی (خوای تعالى خۆی حاكمە و

---

[140] (سورة الرعد / ٤١)

[141] رواه أبوداود / ٤٩٥٥ و سنن النسائي / ٥٣٨٧

حوكميش هەر بۆلای خۆی دەبرێتەوە) ، بۆ چی بە أبا الحكم بانگت دەكەن (كونیەكەتبۆ أبو الحكمە؟) هانیئ وتی : قەومەكەم ئەگەر لە شتێكدا جیاوازیان تێكەوت دێن بۆلام و حوكم دەكەم لە نێوانیان و هەردوولا بە حوكمەكەم ڕازی دەبن ، پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) چەندە باشە ، ئایا كوڕت نیە ؟ هانیئ وتی شورەیح و مسلم و عبداللە ـم هەیە ، پێغەمبەی خوا (صلى الله عليه وسلم) فەرمووی (كامیان گەورەكەیانە؟) هانیئ وتی : شورەیح ، پێغەمبـەری خوا (صلى الله عليه وسلم) فەرمووی (كەواتە تۆ أبو شریحی) (نەك أبو الحكم) . وە سەنەدەكەی بەهێزە.

ئەگەر ئەمە هەڵوێستی پێغەمبەری خوا بـیت ﷺ بەرامبەر صەحابـیەك كە تەنها ئەوەیە بە أبو الحكم بانگی دەكەن ، كە نەهی لـێكرد و كونیەكەی گۆڕی ، ڕووڕەشی بۆ ئەو حاكمانەی كە خۆیان لـە جێی اللە ﷻ حوكم دەكەن و حوكمی دیموكراسی لـەعین بە زۆر دەچەسپێنن .

بۆیە هەركەسێك حوكمی اللە ﷻ ـی لاداو خۆی حوكم بدات ئەوا خۆی كردەتە شەریكی اللە ﷻ و تەحەددای اللە تعالى دەكات لـەو كارانەی كە اللە ﷻ تایبەتی كردوە بە خۆیەوە، بۆیــە خاوەنی یاسا و تەشریع تەنها اللە ﷻ ـە، هەركەسێك خۆی بكات بە هاوبەشی اللە ﷻ ، ئەوادەبـێت بە تاغوت.

## بەڵگەی دوازدەهەم

خوای تعالی دەفەرمووی ﴿أَفَغَيْرَ اللَّهِ أَبْتَغِي حَكَماً﴾[142]. واتە : ئایا لـە غەیری الله ﷻ کەسێکی ترتان دەوێ تا بۆتان بهێنم حوکمتان بکات ؟ بۆ من ڕەوا نیە لـە غەیری الله ﷻ داوا بکەم تا حوکمم بۆدانێت ؟ نەخێر تەنها الله تعالی شایەنی ئەوەیە کە بـیکەم بە حەکەم و حوکمی بۆ لا بگەڕێنمەوە .

کێ حوکمەکەی باشترە تاکو حوکمی ئینسانەکان بکات ؟ ئایا تەنها دروستکارەکەی نیە کە الله ـیە ﷻ ؟ خوای تعالی دەفەرمووێ ﴿أليس الله بأحكم الحاكمين﴾ واتە : ئایا باشترین حاکم تەنها الله تعالی نیە ؟ ، بـیگومان بەڵێ . بۆیە هەرکەسێك یاسا و حوکمەکەی الله ﷻ لابدات و خۆی یاسا بنوسێتەوە ئەوا پێی وایە کە حوکمەکەی الله ﷻ بە کەلکی ئەمڕۆ نایات ، ئەگەر چی بە زمانیش وانەڵێت ئەوا هەرکافر دەبـێت دەیەها بەڵگەمان باس کـرد.

---

[142] (سورة الأنعام / ١١٤)

## بەڵگەی سیازدەهەم

خوای تعالی دەربارەی ئەوانە باس دەکات کە شوێنی تەشریع و یاسای تاغوتان دەکەون لە حەڵاڵکردنی مردوو کە گوایـە ئەمە سەربڕاوی خوایـە ﷻ (هەروەکو فەرموویەتی) ﴿وَلَا تَأْكُلُوا مِمَّا لَمْ يُذْكَرِ اسْمُ اللَّهِ عَلَيْهِ وَإِنَّهُ لَفِسْقٌ وَإِنَّ الشَّيَاطِينَ لَيُوحُونَ إِلَى أَوْلِيَائِهِمْ لِيُجَادِلُوكُمْ وَإِنْ أَطَعْتُمُوهُمْ إِنَّكُمْ لَمُشْرِكُونَ﴾ . واتە: ئەی خەڵکینە گۆشتی ئەوسەربڕاوانە مەخۆن کە ناوی خوای لـەسەر ناهێنرێت ، چونکـە ئەمە تاوان و شکاندنی فەرمانی الله ـیە ﷻ، وە بـیشزانن کە شەیتانە جنەکان هەواڵ دەنێرن بۆ شەیتانە ئیسانەکان کە وەلی و نزیکی خۆیانن تاکو بـێن و موناقەشەی بەتاڵتان لـەگەڵ بکەن لـەسەر ئەم حەیوانە سەربڕاوانە، خۆئەگەر هاتوو گوێڕایەڵی ئەوانتان کرد ئەوا بـێگومان ئێوە لـە موشریکانن !.

کەواتە هەرکەسێك حەڵاڵـەکانی الله تعالی حەرام بکات یان بە پێچەوانەوە ئەوا تاغوتە وە شەیتان و وەلی شەیتانە ، وە هەرکەسێکیش گوێڕایەڵییان بکات یان پشتگیریان بکات ئەوا موشریك و کافرە و مورتەدد بۆتەوە (پەنا دەگرین بەخوای تعـــــــالی).

وە ئەسەرێکی زۆری سەلـەف لـەسەر ئەم ئایەتە هاتووە کە بە پشتیوانی الله هەموو باس دەکەین لـە بەشی (وتەی زانایان).

# بەڵگەی چواردەهەم

خوای تعالى دەفەرمووێ : ﴿اتَّخَذُوا أَحْبَارَهُمْ وَرُهْبَانَهُمْ أَرْبَاباً مِنْ دُونِ اللَّهِ وَالْمَسِيحَ ابْنَ مَرْيَمَ وَمَا أُمِرُوا إِلاَّ لِيَعْبُدُوا إِلَهاً وَاحِداً لا إِلَهَ إِلاَّ هُوَ سُبْحَانَهُ عَمَّا يُشْرِكُونَ﴾[١٤٣] . واتە : یەهود و نەصرانیەکان ، دەسەڵاتدار و پیاوچاکانی خۆیان دەکرد بە خوا بەسەرخۆیانەوە جگە لە الله تعالى ، وە مەسیح عیسای کوڕی مەریەمیشیان بەهەمان شێوە دەکرد بە خوا بەسەرخۆیانەوە ، لە کاتێکدا الله ﷻ فەرمانی بەوە پێنەکردبوون بەڵکو فەرمانی بەوە پێکردبوون کە تەنها یەك خوا بپەرستن کە الله تعالى کە هیچ شەریکێکی نیە ، پاك و بێگەردی بۆ ئەو خودایە لە هیچ شەریکێك کە ئەو موشریك و کافرانە دەیکەنە شەریکی الله تعالى.

لەوانەیە بوترێ جا ئەمە چ پەیوەندیەکی بە حوکمەوە هەیە ، ئەمە باسی پەرستن دەکات و ئەو کەسانە سوجدەیان بۆ دەسەڵاتدران و پیاوچاکان دەبرد و داوای هاوکاریان لێیان دەکرد .

**لەوەڵامدا دەڵێین** : ئەمە گەورەترین جەهلە بەدینی الله تعالى کە تۆ پێت وابێت کە عیبادەت تەنها ئەوەیە تۆ سوجدە بۆ کەسێك ببەیت یان دوعا یان نوێژی بۆ بکەیت ، دواتر ڕوونی دەکەینەوە کە عیبادەت چیە ، لە گەورەترینی عیبادەتەکان بۆ الله تعالى بریتیە لە گەڕانەوەی حوکم بۆلای الله تعالى و تحاكم بردن بۆلای ئەو ﷻ، وە ئەو کەسانەی کە الله تعالى باسیان دەکات دەچوون حوکمیان بۆلای دەسەڵاتداران و بەناوپیاوچاکەکانیان دەبردەوە تاکو ئەو کار و گوفتارانەی کە الله تعالى حەڕامی کردووە حەڵاڵی بکەن و حەڵاڵەکانیشیان بۆ حەڕام بکەن و یاسا و بڕیارەکانی خوایان ﷻ بۆ بگۆڕن ، بۆیە ئەو دەسەڵاتداران و پیاوچاکانەیان کرد بە خوادا بەسەرخۆیانەوە و پەرستیانن ، ئائەمە شیرك و کوفری ئەوان بوو ، وە ئەم

---

[١٤٣](سورة التوبة / ٣١)

تەفسیرە بەم شێوازە تەفسیری من نیە ، بەڵکو تەفسیری پێشەوای موەحیدان محمده ﷺ.

**عدي بن حاتم** رضي الله عنه صەحابی پێغەمبەری خوایە ﷺ ساڵی (٦٨) هیجری وەفاتی کردووە دەفەرمووێ : (**أَتَيْتُ النَّبِي صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَفِي عُنُقِي صَلِيبٌ مِنْ ذَهَبٍ. فَقَالَ: يَا عَدِيُّ اطْرَحْ عَنْكَ هَذَا الوَثَنَ، وَسَمِعْتُهُ يَقْرَأُ فِي سُورَةِ بَرَاءَةٌ: ﴿اتَّخَذُوا أَحْبَارَهُمْ وَرُهْبَانَهُمْ أَرْبَابًا مِنْ دُونِ اللَّهِ﴾، قَالَ: أَمَا إِنَّهُمْ لَمْ يَكُونُوا يَعْبُدُونَهُمْ، وَلَكِنَّهُمْ كَانُوا إِذَا أَحَلُّوا لَهُمْ شَيْئًا اسْتَحَلُّوهُ، وَإِذَا حَرَّمُوا عَلَيْهِمْ شَيْئًا حَرَّمُوهُ**) . واتە : هاتم بۆلای پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) و صەلیبیکیش لە ملمدابوو کە ئاڵتون بوو ، پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) فەرمووی : ئەی عەددی ئەم بتە بپچڕێنە ، پاشان ئیمامی عەددی دەفەرمووێ : گوێم لێبوو (پاشان) ئەو ئایەتەی خوێندەوە ﴿**اتخذوا أحبارهم و رهبانهم أربابا من دون الله**﴾ ، فەرمووی : ئەو یەهود نەصرانیەکان ئەو عیبادەتەیان بۆناکردن (کە ئێوە وادەزانن) ، بەڵکو ئەوان (حەرامەکانیان بۆیان حەڵاڵ دەکرد ، بۆیە ئەوانیش حەڵاڵیان دەکرد ، وە ئەگەر شتێکیشان لەسەر حەرام بکردنایە ئەوا ئەوانیش حەرامیان دەکرد).

ئەمیش ئیمامی الترمذي[144] و الطبراني[145] و الطبري و ابن أبي حاتم ـش لە تەفسیری ئایەتەکەدا[146] نقڵیان کردووە لە ڕێگەی : حوسەینی کوڕی یەزیدی کوفیەوە، وتی: عبدالسلامی کوڕی حەرب بۆی باسکردین لە غوتەیفی کوڕی ئەعیەنەوە لە موصعەبی کوڕی سعدەوە لە عەدی کوڕی حاتەمەوە .وە (**سەنەدەکەی بەهێز نیە**) و ناکرێت بە بەڵگە.

---

[144] سنن الترمذى / ٣٠٩٥

[145] معجم الكبير / ٩٢/١٧

[146] تفسير سورة التوبة /٣١

وه ئیمامی إبن سعد لـه طبقاتدا[147] ڕیوایەتی کردووه لـه محمدی کوڕی عمرەوه، وتی أبو مروان بۆی باسکردم، لـه أبانی کوڕی صالحەوه، لـه عامری کوڕی سعدەوه لـه ئیمامی عەددیەوه . بەڵام (**ئەم سەنەدەیش بەهێز نیه بە تەنها**) .

وەئیمامی الطبرانیش لـه جامع العلمدا[148] لـه موعەلـلەقی نقڵی کردووه لـه عەددیەوه، و ئیمامی الشوكانیش دەفەرمووێ[149] ئیمامی أحمد ڕیوایەتی کردووه هەرچەندە ئەو ڕیوایەتەم نەبـینیەوه ، بەڵام هیچ یەکێك لـه سەنەدەکان بە تەنها ناگەنە پلەی صحیح، بەڵام محدثین بە کۆکردنەوەی ڕێگاکان دەفەرموون ڕیوایەتەکان پێکەوه **دەگەن بە پلەی حەسەن** واتە زەعیف نین و پشتیان پێدەبەسترێت . وه بەشێکیش لـه شارەزایانی فەرمووده بە صحیحی دەزانن[150] ، وه لای زۆرینەی متأخرین سەنەدەکەی حسن ـه وه ئەمە ڕەئی ئەلبانیشه کە سەنەدەکەی پێ حەسەنە[151] و پشتی پێدەبەسترێ ، وه جگە لـەم فەرموودەیەش بە هەمان لفظ لـه هاوەڵان و تابعین بە صحیحی هاتووه کە :

**ئیمامی عبدالله بن عباس** رضي الله عنه ئیمامی الطبري دەفەرمووێ : (حدثني محمد بن الحسين قال، حدثنا أحمد بن المفضل قال حدثنا أسباط، عن السدي: ﴿**اتخذوا أحبارهم ورهبانهم أربابًا من دون الله**﴾ ، قال عبد الله بن عباس: **لم يأمروهم أن يسجُدوا لهم، ولكن أمروهم بمعصية الله، فأطاعوهم، فسمَّاهم الله بذلك أربابًا**)[152] .

واتە لـه السدیەوه دەربارەی ئایەتەکە کە ابن عباس فەرموویەتی : دەسەڵاتداران فەرمانیان ناکرد تاکو خەڵك سوجدەیان بۆ ببەن ، بەڵکو فەرمانی پێدەکـردن تاکو

[147] الجزء المتمم لطبقات ابن سعد : الطبقة الرابعة من الصحابة ممن أسلم عند فتح مكة وما بعد ذلك : ٦٥١/١
[148] جامع بيان العلم وفضله : ٩٧٥/٢
[149] ولاية الله والطريق إليها / ٣٠٦
[150] السنة المفترى عليها / ٣٣٠ و الفصل في علوم الحديث : ٩/٢
[151] صحيح الترمذي / ٢٤٧١
[152] جامع البيان في تأويل القرآن لإمام الطبري : ٢١٢/١٤

سەرپێچی فەرمانەکانی خوای تعالی بکەن و ئەوانیش گوێڕایەڵیان بۆیان دەکرد ، بەهۆی ئەوەوە خوای تعالی بە أرباب ناوی هێنان.

**حذيفة بن اليمان** ﷺ هاوەڵ و جێ متمانەی پێغەمبەری خوا ﷺ هەمان ئەو تەفسیری خۆشەویستەکەی ﷺ بۆ ئەم ئایەتە دەکات.

عبدالرزاق لە تەفسیرەکەیدا[153] و إبن ابي شيبة[154] و البيهقي و الخلال لە السنة[155]وە ئیمامی ابن أبي حاتم[156] و الطبري[157]و غەیری ئەوانیش ڕیوایەتیان کردووە بەم شێوازە : (**سأل رجل حذيفة فقال يا أبا عبد الله أرأيت قوله اتخذوا أحبارهم ورهبنهم أربابا من دون الله أكانوا يعبدونهم قال لا ولكنهم كانوا إذا أحلوا لهم شيئا استحلوه وإذا حرموا عليهم شيئا حرموه**) . واتە : پیاوێك پرسیاری ئیمامی حذيفة کرد و وتی ئەی باوکی عبدالله ئایە ئەو ئایەتەت بینیوە کە خوای تعالی فەرموویەتی ﴿یەهود و نەصاراکان دەسەڵات و پیاوچاکانیان دەکرد بەخوا بەسەر خۆیانەوە﴾ ؟ ئایا ئەوان دەسەڵاتداران و پیاوچاکانیان دەپەرست ؟؟ ئیمامی حذيفة لە وەڵامدافەرمووی : نەخێر (ئەو پەرستنەیان ناکرد کە ئێوە گومانی بۆدەبەن) ، بەڵکو ئەگەر شتێکیان بۆیان حەڵاڵ بکرایە ئەوانیش حەڵاڵیان دەکرد (بەبێ گوێدان بە بڕیاری خوا) ، وە ئەگەر شتێکیشیان بۆ حەرامبکرایە ئەوانیش حەرامیان دەکرد.

وە لە ڕیوایەتەکەی الطبري فەرمووی[158] : (**أَمَا إِنَّهُمْ لَمْ يَكُونُوا يَصُومُونَ لَهُمْ، وَلَا يُصَلُّونَ لَهُمْ، وَلَكِنَّهُمْ كَانُوا إِذَا أَحِلُّوا لَهُمْ شَيْئًا اسْتَحَلُّوهُ، وَإِذَا حَرَّمُوا عَلَيْهِمْ**

---

[153] (٢٧٢/٢)

[154] مصنف ابن أبي شيبة : ٩ / ٤٤١

[155] (١٣٠٦)

[156] تفسير القرآن العظيم مسندًا عن رسول الله (والصحابة والتابعين / ١٠٠٥٨

[157] تفسير الطبري : ٤٢٠/١١

[158] تفسير الطبري : ٤٢٠/١١

**شَيْئًا أَحَلَّهُ اللَّهُ لَهُمْ حَرَّمُوهُ، فَتِلْكَ كَانَتْ رُبُوبِيَتَهُمْ)** . واته : ئەوان نە بۆیان بەرۆژوو دەبوون نە نوێژیشیان بۆیان دەکرد ، بەڵام ئەگەر شتێکیان بۆیان حەڵاڵبکرایە ئەوانیش حەڵاڵیان دەرکرد ، وە ئەگەر حەڵاڵێکیان بۆ حەرامبکرایە ئەوانیشحەرامیان دەرکرد ، ئائەوەبوو هۆکارەکەی کە کردبوویان بە خوا.

عالیترین سەنەدەیان ئەوەی ئیمامی عبدالرزاقە کە لە سوفیانەوە ڕیوایەتی کردووە لە ابن أبی سابتەوە لە أبی البختریەوە لە حذیفەوە و سەنەدەکەی بەهێزە.

وەالخلالیش لە ئیمامی أحمەدەوە لە ابن مهدیەوە لە سوفیانەوە ڕیوایەتی کردووە ، ابن أبی حاتمیش لە أبو سعید الأشجەعەوە ئەویش لە وەکیعەوە لە الأعمشەوە لە حبیبی کوڕی ابن أبی سابتەوە .

وە هەمان تەفسیر لە غەیری ئەمانیش هاتووە لە سەلەف لەوانە : ئیمامی الظحاك و سعیدی کوڕی فیروزی الطائي و حەسەنی البصری و رفیعی کوڕی مهران و غەیری ئەوانیش لەسەف کە دواتر باسێکی تایبەتیش تەرخان دەکەین بۆ بۆچوونی سەلەف لەم بارەوە خوای تعالی هاوکارمان بیت.

# بەڵگەی پازدەهەم

خوای تعالی باسی جیاوازی مونافیقان و بڕوادارانمان بۆ دەکات ، کە ئەوانەی پشت لـە حوکمی الله تعالی دەکەن مونافیقن و بڕوادار نین ، هەروەکو دەفەرمووێ: ﴿وَيَقُولُونَ آمَنَّا بِاللَّهِ وَبِالرَّسُولِ وَأَطَعْنَا ثُمَّ يَتَوَلَّى فَرِيقٌ مِّنْهُم مِّن بَعْدِ ذَلِكَ وَمَا أُوْلَئِكَ بِالْمُؤْمِنِينَ * وَإِذَا دُعُوا إِلَى اللَّهِ وَرَسُولِهِ لِيَحْكُمَ بَينَهُمْ إِذَا فَرِيقٌ مِّنْهُم مُّعْرِضُونَ * وَإِن يَكُن لَّهُمُ الْحَقُّ يَأْتُوا إِلَيْهِ مُذْعِنِينَ * أَفِي قُلُوبِهِم مَّرَضٌ أَمِ ارْتَابُوا أَمْ يَخَافُونَ أَن يَحِيفَ اللَّهُ عَلَيْهِمْ وَرَسُولُهُ بَلْ أُوْلَئِكَ هُمُ الظَّالِمُونَ * إِنَّمَا كَانَ قَوْلَ الْمُؤْمِنِينَ إِذَا دُعُوا إِلَى اللَّهِ وَرَسُولِهِ لِيَحْكُمَ بَينَهُمْ أَن يَقُولُوا سَمِعْنَا وَأَطَعْنَا وَأُوْلَئِكَ هُمُ الْمُفْلِحُونَ﴾[١٥٩]. واتە : ئائەوانە دەڵێن ئێمە بڕوامان بە خوا ﷻ و پێغەمبەرەکەی ﷺ هێناوە و گوێڕایەڵیان دەکەین ، پاشان دەیان بینیت بەشێکیان دەڕۆن و پشتهەڵدەکەن ، وە ئائەوانە ڕاست ناکەن و لـە بڕواداران نین ، خۆ ئەگەر بۆلای حوکمی الله تعالی و پێغەمبەرەکەی ﷺ بانگبکرێن تاکو لـە نێوانیانا حوکم بکرێت، بەشێکیان پشت هەڵدەکەن، خۆ ئەگەر بزانن حوکمەکە لـە بەرژەوەندی دونیای ئەوانە ئەوا دێن، بەڵام بە پێچەوانەوە نایەن، ئایە لـە دڵیاندا نەخۆشی هەیە یان گومان یان ترس لـەوەی نەکا خوا ﷻ و پێغەمبەر ﷺ ستەمیان لێبکەن، نەخێر ئەمانە هیچی نیە، بەڵکو تەنها ئەوەیە خۆیان ستەم لـە خۆیان دەکەن و ناگەڕێنەوە بۆلای حوکمی الله ﷻ و پێغەمبەرەکەی ﷺ وتەی بڕواداران تەنها ئەوانەن کاتێك بانگدەکرێن بۆلای حوکمی الله ﷻ و پێغەمبەرەکەی ﷺ ، ئەوا دەڵێن حوکمەکەمان بیست و گوێڕایەڵیشی دەبین ، وە ئائەمانە سەرفراو و براوەن .

**الإمام عبدالله بن عباس** ﷺ ئیمامی ابن أبـي حاتم دەفەرمووێ : (حَدَّثَنَا أَبُو زُرْعَةَ، ثنا مِنْجَابُ بْنُ الْحَارِثِ، أَنْبَأَ بِشْرُ بْنُ عُمَارَةَ، عَنْ أَبِـي رَوْقٍ عَنِ الضَّحَّاكِ، **عَنِ**

[١٥٩](سورة النور / ٤٧-٥١)

ابْنِ عَبَّاسٍ أَفِي قُلُوبِهِمْ مَرَضٌ قَالَ: الْمَرَضُ النِّفَاقُ)[١٦٠]. واته : ئیمامی ابن عباس فەرموویەتی : ئەو نەخۆشیەی کە الله تعالی باسی دەکات نەخۆشی نیفاقە. (بەڵام سەنەدەکەی بەهێز نیە).

**الإمام رفيع بن مهران** رحمه الله هەر ابن ابی حاتم فەرموویەتی : (حَدَّثَنَا عِصَامُ بْنُ رَوَّادٍ الْعَسْقَلانِيُّ، ثنا آدَمُ، ثنا أَبُو جَعْفَرٍ الرَّازِيُّ، عَنِ الرَّبِيعِ بْنِ أَنَسٍ، **عَنْ أَبِي الْعَالِيَةِ قَوْلُهُ: وَيَقُولُونَ آمَنَّا بِاللَّهِ قَالَ: هَؤُلاءِ المنافقين**)[١٦١]. واته : بەو سەنەدە پێمان گەیشتووە لە ئیمامی أبو العالیة رفیع بن مهران (رحمه الله) کە فەرموویەتی: ئائەوانە مونافیقەکانن . (سەنەکەی باشە).

**الإمام قتاده بن دعامة** رحمه الله وەهەر ابن ابی حاتم فەرموویەتی : (حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ يَحْيَى، أَنْبَأَ الْعَبَّاسُ بْنُ الْوَلِيدِ، النَّرْسِيُّ، ثنا يَزِيدُ بْنُ زُرَيْعٍ، ثنا سَعِيدٌ **عَنْ قَتَادَةَ قَوْلُهُ: ثُمَّ يَتَوَلَّى فَرِيقٌ مِنْهُمْ مِنْ بَعْدِ ذَلِكَ قَالَ أُنَاسٌ مِنَ الْمُنَافِقِينَ أَظْهَرُوا الإِيمَانَ وَالطَّاعَةَ وَهُمْ فِيذَلِكَ يَصُدُّونَ عَنْ سَبِيلِ اللَّهِ وَطَاعَتِهِ وَجِهَادٍ فِي سَبِيلِهِ**)[١٦٢]. واته : بەوسەنەدە پێمان گەیشتووە لە ئیمامی قەتادەوە کە فەرموویەتی : کەسانێك لە مونافیقەکان وایان نیشان دەدا کە ئیماندارن و گوێڕایەڵی خوای تعالی دەکەن ، وە ئەوان پشتیان هەڵدەکرد لە ڕێگا و گوێڕایەڵی و تێکۆشان لە پێناو الله تعالی ـدا (سەنەدەکەی بەهێزە).

کەواتە زانیمان ئەوەی پشت لە حوکمی الله عزوجل بکات مونافیقە ئەگەر چی خۆیشی بە موسڵمان بزانێت .

[١٦٠] تفسير القرآن العظيم لإمام ابن أبي حاتم الرازي (المتوفى: ٣٢٧هـ) / ر.١٤٧٣١

[١٦١] تفسير القرآن العظيم لإمام ابن أبي حاتم الرازي (المتوفى: ٣٢٧هـ) / ر.١٤٧٤٣

[١٦٢] تفسير القرآن العظيم لإمام ابن أبي حاتم الرازي (المتوفى: ٣٢٧هـ) / ر.١٤٧٣٤

# بەڵگەی شازدەهەم

خوای تعالی فەرمان بە پێغەمبەرەکەی ﷺ و بەندە چاکەکارەکانی دەکات کە کوشتاری ئەوانە بکەن کە حەڵاڵەکانی الله تعالی حەڵاڵ ناکەن و حەرامەکانی حەرام ناکەن ، هەروەکو فەرموویەتی ﴿**قَاتِلُوا الَّذِينَ لَا يُؤْمِنُونَ بِاللَّهِ وَلَا بِالْيَوْمِ الْآخِرِ وَلَا يُحَرِّمُونَ مَا حَرَّمَ اللَّهُ وَرَسُولُهُ**﴾[163]. واتە : کوشتاری ئەوانە بکەن کە بڕوایان بە الله تعالی و ڕۆژی دوای نیە، وە حەرامەکانی خوای تعالی حەرام ناکەن.

بۆیە بۆمان دەردەکەوێت کە حەرام نەکردی حەرامەکانی الله تعالی وەکو (شیرك و کوفر و قەتلی بەناحەق و داوێن پیسی و دزی و ڕیبا و عەرەق و خواردنی حەرامکراوەکان و غەیری ئەمانیش..) هەرکەسێك ئەمانە یان یەکێك لەمانە حەڵاڵ بکات کافرە و پێی دەبێت بە تاغوت وە خوای تعالی فەرمانی کوشتنی داوە، ئەویش حاڵی ئەمڕۆیە لە یاسادەستکردەکان حەڵاڵەکانی الله ﷻ حەرام دەکەن و حەرامەکانیشی حەڵاڵ دەکەن.

**الإمام سعید بن جبیر** رحمه الله ئیمامی ابن ابی حاتم ڕیوایەتی کردووە بە موعەللەقی لە ئیمامی سعیدی کوڕی جبیرەوە کە فەرموویەتی (**فِي قَوْلِ اللَّهِ وَلا يُحَرِّمُونَ مَا حَرَّمَ اللَّهُ وَرَسُولُهُ يَعْنِي: الْخَمْرُ وَالْخِنْزِيرُ.**)[164]. واتە فەرموویەتی کوشتاری ئەوانە بکەن کە عەرەق و بەراز حەرام ناکەن.

ئەمە حاڵی هەموو وڵاتە بەناوئیسلامی و غەیرە ئیسلامییەکانیشە لەم سەردەمەدا کە عەرەق و بەراز و زیناو ..هتد لە تاوانە قێزونەکان حەڵاڵ کراون و بە ئاشکرا دەکرێن و بە یاسایش کراون و ئازادیان پێدراوە.

---

[163] (سورة التوبة / ٢٩)

[164] تفسير الإمام ابن ابي حاتم / ر.١٠٠٢٨

## هەرکەسێك حوکم بە یاسای الله تعالى نەکات و خۆ ی یاسا بنوسێتەوە ئەوا تاغوتە!

خوای تعالى دروستی کردووین تاکو عیبادەتی بۆ بکەین و کەسی بۆ نەکەین بە شەریك، جا هەرکەسێك لـە غەیری الله ﷻ بپەرستێت ئەوا شەرکی بۆ الله تعالى قەراردوە ، وە ئەو کەسەیش کە لـە جیاتی الله تعالى دەپەرسترێت پێی دەگوترێت (تاغوت) ، تاغوت لـە پیسترینی کافرانن وە لـە قیامەتدا خۆیان و ئەو کەسانەیش کە پەرستشیان بۆیانکردووە بەرەو دۆزەخ ڕاپێچدەکرێن .

## تاغوت کێیە ؟

**تاغوت لـە ڕووی زمانەوانییەوە** : واتا سنوربەزاندن یان شکاندنی سنورەکان کە بۆی دانراوون ، خوای تعالى باسی ئەو لافاوەمان بۆ دەکات کە دووچاری قەومی نوح بوو کە دەفەرمووێ ﴿**إِنَّا لَمَّا طَغَى الْمَاءُ حَمَلْنَاكُمْ فِي الْجَارِيَةِ**﴾[١٦٥] . واتە : کاتێك کە ئاوەکە سنوری خۆی شکاند و هەموو شوێنێکی گرتەوە باب و باپیرانی ئێوەمان ڕزگارکرد .

**الإمام قتادة بن دعامة** رحمه الله هەروەکو ئیمامی عبدالرزاق نقڵی دەکات (عبدالرزاق عن معمر عن قتادة في قول الله تعالى ﴿**إنا لما طغى الماء**﴾ ، **قال بلغنا أنه طغى فوق كل شيئ خمسة عشر ذرعا**)[١٦٦] . واتە بەسەنەدێك لـە ئیمامی قتادەوە کە دەربارەی ئایەتەکە فەرموویەتی: وا پێمان گەیشتووە (واتا لـە صەحابـیەکانەوە) کە ئاوەکە سنوری هەموو شتێکی بەزاند بە (١٥ باڵ) بەرزی . (وە سەنەدەی بەهێزە).

**تاغوت لـە ڕووی إصتیلاحیەوە**: هەرکەسێك عیبادەتی بۆ بکرێت و پێی ڕازی بـیت ئەوا تاغوتە ، هەموو پەرستراوێك لـە غەیری الله دەگرێتەوە ، **جا عیبادەت**

---

[١٦٥] (سورة الحاقة / ١١)

[١٦٦] تفسير عبدالرزاق : الحاقة / ١١

تەنها ئەوە نیە کە سوجدەی بۆ ببەیت، بەڵکو عیبادەت زۆر لەوە فراوانتر لە خۆی دەگرێت .

**عیبادەت**: هەرشتێك الله تعالی پێی خۆش بـیت و پێی ڕازی بـیت ئەوا عیبادەتە

**شەیخی ئیسلام ابن تیمیة** رحمه الله پێناسەیەکی جوان بۆ عیبادەت دەکات و دەفەرمووێ : (**العبادة إسم جامع لكل ما يحبُهُ الله من أقوال و أفعال الظاهرة و الباطنة**)[167]. واتە عیبادەت ناوێکی کۆکراوەیە بۆ هەموو ئەو کارو گوفتارانەی الله تعالی پێی خۆشە ، جا ئاشکرا بـیت یان نهێنی دڵ بـیت . (واتە هەر کارێك الله عزوجل پێی خۆش بـیت و پێی ڕازی بـیت عیبادەتە) .

**ئیمامی ابن کثیر** رحمه الله دەفەرمووێ : (**وعبادته هي طاعته بفعل المأمور وترك المحظور. وذلك هو حقيقة دين الإسلام" لأن معنى الإسلام: الاستسلام لله تعالى، المتضمن غاية الانقياد والذل والخضوع**)[168]. واتە : عیبادەت کردن بۆ الله تعالی ئەوەیە گوێڕایەڵی بکەیت بەوەی کە فەرمانەکانی جێبەجێ بەکەیت و واز لەوانەیش بهێنیت کە ئاگاداری کردوینەتەوە کە ئەنجامی نەدەین ، وە ئەوەیش ئیسلامی ڕاستەقینەیە (ئەو دینەی کە الله عزوجل لـێمانی دەوێت) ، چۆنکە ئیسلام واتە : ملکەچ بوون بۆ الله تعالی، کە ئەوپەڕی ملکەچی و خۆبەکەم زانین و ترسی لەگەڵ بـیت .

هەموو ئەوکارانەی کە الله تعالی پێی خۆشە بۆی ئەنجام بدرێت وەکو (گەڕانەوەی حوکم بۆلای قورئان و دوعا تەنها لە الله عزوجل و نوێژکردن و قوربانی و خەیر وچاکەکاری ..) غەیری ئەمانەیش عیبادەتن ، ئەگەر تەنها بۆ الله تعالی ئەنجام بدرێت ئەوا تۆ الله عزوجل ــت پەرستووە ، خۆ ئەگەر بۆ غەیری الله عزوجل کرا

---

[167] مجموع الفتاوی لشیخ الإسلام ابن تیمیة : ١٤٩/١٠

[168] فتح المجید لشیخ عبدالرحمن بن حسن / ١٨

ئەوا دەبـيت بە شيرك و خاوەنەكەى پێى دەبـيت بە موشريك ، جا حوكمى ئەو كەسەيش كە عيبادەتەكەى بۆ ئەنجامدراوە دەبـيتە دوو بەشەوە:

**ئەگەر بەو عيبادەت بۆ كردنە ڕازى بـيـت**: ئەگەر ڕازى بـيت كە خەڵك لەغەيرى الله تعالى حوكمى بۆلا ببەنەوە يان داواى لێبكەن لە غەيرى الله ﷻ لە كارێكدا كە تايبەت بـيت بە الله ﷻ ، يان حەيوانى بۆ سەرببڕێت يان غەيرى ئەمانيش ، ئەوا ئەم كەسە پێى دەگوترێ تاغوت .

**ئەگەر بەو عيبادەت بۆ كردنە ڕازى نەبـيت**: خۆ ئەگەر ڕازى نەبوو ئەوا پێى ناگوترێ تاغوت و حوكمى تاغوتى نيە ، بەڵام هەركەس بـيپەرستێت و عيبادەتى بۆ بكات ئەوا موشريكە ، وەكو ڕافيزەكان داوا لە ئيمامەكان (على و حسين و حسن و عباس ..) دەكەن ، يان صۆفيەكان داوا لە (پێغەمبەرى خوا ﷺ يان لە بدوى يان گەيلانى ..) دەكەن ، يان غەيرى ئەمانيش ، جا ئەم پەرستراوانە پێيان ناگوترێ تاغوت چونكە بەو عيبادەتەى خەڵك ڕازى نەبوون كە بۆيان دەكرێت، پێغەمبەرى خوا ﷺ (٢٣) ساڵ بانگەوازى كرد تاكو خەڵك لە پەرستنى بەندەكانەوە دەربكات بۆ پەرستنى الله ﷺ ، بۆيە هەركەسێك ئەمانە بپەرستێت موشريكە . بەڵام بە خۆيان ناگوترێ تاغوت .

**الإمام مالك بن أنس** رحمه الله كورتترين پێناسە بۆ تاغوت دەكات كە فەرموويەتى: (**كل معبود سوى الله**)[١٦٩] ، واتە : تاغوت هەموو پەرستراوێكە لە غەيرى الله تعالى، جا پەرستنش وەك باسكرا جۆرى زۆرە .

**الإمام إبن القيم الجوزية** رحمه الله جوانترين پێناسە بـينيوبـيتم بۆ تاغوت پێناسەكەى ئيمامى ابن القيم ــە كە فەرموويەتى : (**أَخْبَرَ سُبْحَانَهُ أَنَّ مَنْ تَحَاكَمَ أَوْ حَاكَمَ إلَى غَيْرِ مَا جَاءَ بِهِ الرَّسُولُ فَقَدْ حَكَّمَ الطَّاغُوتَ وَتَحَاكَمَ إلَيْهِ، وَالطَّاغُوتُ: كُلُّ مَا تَجَاوَزَ بِهِ الْعَبْدُ حَدَّهُ مِنْ مَعْبُودٍ أَوْ مَتْبُوعٍ أَوْ مُطَاعٍ" فَطَاغُوتُ كُلِّ قَوْمٍ مِنْ يَتَحَاكَمُونَ إلَيْهِ**

[١٦٩] تفسير ابن كثير : ٢/٣٣٤

**غَيْرَ اللَّهِ وَرَسُولِهِ، أَوْ يَعْبُدُونَهُ مِنْ دُونِ اللَّهِ، أَوْ يَتْبَعُونَهُ عَلَى غَيْرِ بَصِيرَةٍ مِنْ اللَّهِ**).
واته : پاشان الله تعالى هەواڵ دەدات كە هەركەسێك حوكم بباتەوە يان حوكم بكات بە غەيرى ئەو ياسايەى كە پێغەمبەر ﷺ پێى هات ، ئەوا بەڕاستى تاغوتى كردووە بە حاكم و حوكمى بۆلاى ئەو بردۆتەوە ، وە تاغوتيش هەموو ئەوانەيە كە مرۆڤ پێى لـە سنور دەريدچێـت ، پەرستراو بێت يان شوێنكەوتوو يان گوێڕايەڵى بۆ كراو بێت ، **تاغوتى هەموو قەومێك ئەوەيە حوكمى بۆلا دەگەڕيننەوە لـە غەيرى الله تعالى و پێغەمبەرەكەى ﷺ** ، يان دەيپەرستن لـەغەيرى الله ،يان شوێنى دەكەون بەڵام بەبىٚ چاوڕۆشنى ..(تاكۆتاى وتەكەى رەحمەتى الله ـى لێبێت).

**ئەوەى ئێمە مەبەستمانە**: كەواتە دەتوانين بڵێين خواى تعالى پێى خۆشە حوكم تەنها بۆلاى خۆى ببەينەوە و كەسى تر نەكەين بە شەريكى الله ﷻ ، وە لـە قورئاندا لـە دەيەها جێگا ئيشارەتى پێداوە ، كەواتە **حوكم كردن بە قورئان عيبادەتێكى گەورەيە ، بۆيە بۆلاى غەيرى الله ﷻ ببرێتەوە ئەوا شيركە و خاوەكەى پێى دەبـيت بە موشريك و ئەو كەسەيش كە حوكمى بۆلا براوەتەوە پێى دەگوترىٚ تاغوت.**

## سەلەف و بۆچوونیان لەسەر تاغوتی حوکم

لە سەلەفەوە زۆر هاتووە کە حاکم بغیر ما أنزل الله ـیان بە تاغوت ناو بردووە و خاوەنی تحکامیشیان بە موونافیق ناوبردووە .

**الإمام ابن عباس** رضي الله عنه: ئیمامی ابن ابـی حاتم و غەیری ئەویش ڕیوایەتیان کردووە لە (أبو حاتم ثنا أَبُو صَالِحٍ، حَدَّثَنِي مُعَاوِيَةُ بْنُ صَالِحٍ، عَنْ عَلِيِّ بْنِ أَبـي طَلْحَةَ، عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ **قَوْلَهُ: الطَّاغُوتِ قَالَ: كَعْبُ بْنُ الْأَشْرَفِ**) . واتە لە باوکیەوە (کە ئیمامی ابـی حاتمە) ئەویش لە أبو صالحەوە ئەویش لە معاویەی کوڕی صالحەوە ئەویش لە ابن أبـیطلحةوە ئەویش لە ابن عباسەوە کە دەربارەی تاغوت فەرموویانە کەعبی کوڕی ئەشرەفە .

**گوتم**: کەعبی کوڕی ئەشرەف کابرایەکی جوولەکەی بوو ، بەڵام هۆکاری ناونانەکەی بە تاغوت ئەوەبوو کە لە نێوان خەڵکدا حوکمی دەرکرد بە حوکمێك کە پێچەوانەی حوکمی الله تعالی بوو بۆیە سەلەف بە تاغوتی ناودەبەن.

**الإمام الضحاك** رحمه الله : ئیمامی الطبري دەفەرمووێ : (حدثني يحيى بن أبـي طالب قال، أخبرنا يزيد قال، أخبرناجويبر، عن الضحاك **في قوله:الجبت والطاغوت، قال : الطاغوت: كعب بن الأشرف**)[170] . واتە : ابن ابـیطالب بۆی باسکردم ، وتی : یزید هەواڵی پێداین ، وتی : جوبـیر هەواڵی پێداین لە ئیمامی الضحاکەوە کە دەربارەی تاغوت فەرموویەتی کەعبی کوڕی ئەشرەفە .

**الإمام مجاهد بن جبـــــر** رحمه الله ئیمامی ابن أبـی حاتم و الطبری و ابنالمنذر و غەیری ئەوانیش نقلیانکردووە لە (حَدَّثَنَا حَجَّاجُ بْنُ حَمْزَةَ، ثنا شَبَابَةُ، ثنـــــا وَرْقَاءُ، عَنِ ابْنِ أَبـي نَجِـيحٍ عَنْ مُجَاهِدٍ **قَوْلُهُ: بِالطَّاغُوتِ قَالَ: الشَّيْطَــانُ فِي**

[170] تفسير الإمام الطبري : ٨/٤٦٥

**صُورَةِ الإِنْسَــــانِ يَتَحَاكَمُونَ إِلَيْهِ، وَهُوَ صَاحِبُ أَمْرِهِمْ)**[١٧١] . واته لـه ئيمامى موجاهيدەوە كە دەربارەى تاغوت فەرموويەتى : تاغوت شەيتانە لـە وێنەى مرۆڤ (واتا مرۆڤە بەڵام لـەبەر كوفرەكەى بە شەيتان ناوى دەبات) كە خەڵك بۆ مەبەستى حوكم بۆلاى دەگەڕێنەوە و خاوەنى ئەمر و سەرۆكيانە .[١٧٢]

زياتر لـەسەر بابەتى تاغوت باسناكەين، ئەوەى گرنگە ئەوەيە كە بزانيت كە **هەموو ئەو حاكمانەى كە ياساى الله تعالى لادەدن و خۆيان ياسا دەنوسنەوە و تشريع و تبديل واستبدال دەكەن تاغوتن** وە خواى تعالى فەرمانى كردووە كوفر بە تاغوت بكەين و پشتيان لـێبكەين نەك ببـين بە هاودەست و هاوكار و پاسەوانيان ، وە خواى تعالى ئەو كەسانەى بە موشريك و مونافيق ناوبرد كە حوكـــــم بۆلاى ئەم حاكمانە دەبەنەوە و بە ياساكەيان ڕازين .

**الإمام محمد بن عبدالوهاب** رحمه الله دەفەرمووێ : **(والطواغيت كثيرة، ورؤوسهم خمسة الأول: الشيطان، الداعي إلى عبادة غير الله... ، الثاني: الحاكم الجائر، المغير لأحكام الله تعالى، والدليل قوله تعالى: ﴿أَلَمْ تَرَ إِلَى الَّذِينَ يَزْعُمُونَ أَنَّهُمْ آمَنُوا بِمَا أُنْزِلَ إِلَيْكَ وَمَا أُنْزِلَ مِنْ قَبْلِكَ يُرِيدُونَ أَنْ يَتَحَاكَمُوا إِلَى الطَّاغُوتِ وَقَدْ أُمِرُوا أَنْ يَكْفُرُوا بِهِ وَيُرِيدُ الشَّيْطَانُ أَنْ يُضِلَّهُمْ ضَلالاً بَعِيدا﴾[١٧٣].الثالث: الذي يحكم بغير ما أنزل الله، والدليل قوله تعالى: ﴿وَمَنْ لَمْ يَحْكُمْ بِمَا أَنْزَلَ اللَّهُ فَأُولَئِكَ هُمُ الْكَافِرُونَ﴾[١٧٤].الرابع: الذي يدعي علم الغيب من دون الله .. ، الخامس: الذي يُعبد من دون الله، وهو راض بالعبادة)**[١٧٥] . واتە : تاغوتان زۆرن و گەورەكانيان

[١٧١] تفسير القرآن العظيم مسندا عن رسول الله و الصحابة و التابعين لإمام ابن أبـي حاتم / ٢٦١٧ و تفسير الإمام ابن المنذر / ١٩٤٦

[١٧٢] سەبارەت بە تاغوتى حوكم لـەلاى سەلـەف دواتر بابەتێكى تايبەتمان بۆ ئامادەكردووە.

[١٧٣] سورة النساء / ٦٠

[١٧٤] سورة المائدة / ٤٤

[١٧٥] الدرر السنية في أجوبــة النجدية : ١٦٣/١

پێنجن ، یەکەمیان شەیتانە ، چونکـە بانگەواز بۆ پەرستنی غەیری الله تعالی دەکات ، دووەم : حاکمێکی ستەمکار کە یاساکانی الله ﷻ ـی گۆڕیوە ، خوای تعالی دەفەرمووێ : ﴿ئایە ئەوانەت بـینیوە کە لافی ئەوە لـێدەدەن کە بڕوایان هێناوە و وادەزانن بڕوادارن کەچی دەیانەوێت حوکم بۆلای تاغوتان ببەنەوە لـە کاتێکدا فەرمانیان پێکرابوو کە کوفر بە تاغوت بکەن﴾ . سێهەم : ئەو حاکمەی حوکم بە غەیری قورئان دەکات ، خوای تعالی فەرموویەتی : ﴿جا هەرکەسێك حوکم بەوە نەکات کە الله تعالی دایگرتووە ئەوا ئەوانە کافرن﴾ . چوارەم : ئەو کەسەی ادعای ئەوە دەکات کە غەیب دەزانێت ، پێنجەم : ئەو کەسەیە کە لـەغەیری الله ﷻ دەپەرسترێت و بەو پەرستنەیش ڕازیە.

## دانانی یاسا و پشتهەڵکردن لە یاسای الله میراتی فیرعەونە بۆ تاغوتانی دوای خۆی ماوەتەوە !

وە حوکم کردن و دانانی یاسا بە ویستی حاکم ، ئەمە کاری فیرعەونە کە بۆتاغوتانی سەردەم وەکو میرات ماوەتەوە، باوکە گەورەی تاغوتانی سەردەم، فیرعەون دەیوت ﴿مَا أُرِيكُمْ إِلَّا مَا أَرَى وَمَا أَهْدِيكُمْ إِلَّا سَبِـيلَ الرَّشَادِ﴾[١٧٦]. واتە: ئەوەی خۆم بەباشی دەزانم ئەوەتان بۆ دادەنێم و نیشانی ئێوەیشی دەدەم، وە بـیشزانن کە تەنها بۆ ڕێگەی ڕاست ڕینمویـــتان دەکەن.

**گوتم**: ئەوە فیرعەونە، یاسا دانان بە مافی خۆی دەزانێت، لـەگەڵ ئەوەیشدا یاساکەی خۆی بە باشترین دەزانێت، بە هەمان شێوەی تاغوتانی ئەمڕۆ، یاسادانان بە مافی خۆیان دەزانن و خۆیشیان بە حەق و خاوەن بۆچوونی جوان دەزانن .

---

[١٧٦](سورة غافر / ٢٩)

## حوكم كردن بە غەيرى قورئان لە دوو حاڵەتدا خۆى دەبـينێتەوە

گومانى تێدانيـە كە ئەم بابەتە فراوانە و ئەگەر بە تفصيلـەوە نەبـيت ناتوانرێت حەق وەكو خۆى بگەيەنيت، گومانمان لـەوە نيە كە حوكم كردن بە غەيرى قورئان لـەهەر بارێكدا بـيت هەركوفرە، جا ئەم كوفرەيش هەندێك جـار كوفرى گەورەيە و هەندێك جاريش كوفرى بچوكە و خاوەنەكەى پێى كافر نابـيت، ئەمە ڕاستيەكى حاشا هەڵنەگرە، خواى تعالى ئاسانى بكات بە پێى توانا تفصيلێكى پێدەدەين .

## حوكم كردن بە غەيرى قورئان لە چى كاتێكدا كوفرى بچوكـە ؟

وەكو پێشتر ئاماژەمان پێكرد حوكم كردن بە غەيرى قورئان كوفرە، جا هەندێك جار كوفرى گەورە و هەندێك جاريش بچوك، ئەگەر هاتوو حاكمێك **لـە بابەتێكدا** حوكمى بە قورئان نەكرد يان زوڵمى تێكەڵ بە حوكمەكەى كرد بە مەرجێك دەستكارى ياساكە نەكات يان إستحلال يان جحد يان تفضيل نەكات  ئەوا كافر نابـێت .

**بۆنموونە**: حاكمێك يان سەرۆكێك لـە دەوڵەتى ئيسلاميدا حوكم بە قورئان دەكات و **دەستورى ئيسلامى لانەداوە** پێچەوانەى حاكمەكانى ئەمڕۆ، بەڵكو ياساى وڵات بريتيە لـە قورئان و سونەت ، جا كەسێك دەهێنن بۆلاى كە دزى كردووە، دەبـينێت ئەم دزە خزم و دۆستى خۆيەتى، بۆيە دەستى نابڕێتەوە و ئازادى دەكات، يان دەبـينێت كوڕێكى خۆى يان كەسێكى خۆشەويستى كارێكى خراپى كردووە جا قەتل بـيت يان داوێن پيسى يان زوڵـم ، بەڵام ئەم حاكمە سزاى نادات و حەددى لـەسەر جێبەجێ ناكات، دەبـينين ئەم حاكمە حوكمى بە قورئان نەكرد بەڵكو حوكمى بغير ما أنزل الله كرد، بەڵام پێى كافر نابـيت و كوفرەكەى كوفرى بچوكە و دروست نيە تكفير بكرێت و خروجى لـێبكرێت، بەڵام پێويستە

ئەم دەسەڵاتدارە خۆی لە چەند خاڵێك بپارێزێت تاكو كوفرەكەی نەبێت بە كوفری گەورە و پێی كافر بێت .

**یەكەم**: بە هیچ شێوەیەك نابێت دەستكاری یاساكە بكات و بیگۆڕێت ، وەكو باسمان كرد دەبێت دەوڵەتی ئیسلامی بێت، واتا حوكم و یاسای وڵات قورئان بێت نەك دیموكراسی و عیلمانی و بەعسی و مەسیحی و غەیری ئەمانیش، ئەگەر تاوانی حاكمەكە تەنها ئەوە بێت كە حوكمەكەی جێ بەجێ نەكردووە ئەوا كافر نابێت بە مەرجێك نابێت دەستكاری یاسای دەوڵەت بكات وەكو داوتر تفصیلی پێدەدین .

**دووەم**: نابێت إستحلالی كارەكەی خۆی بكات ، واتا نابێت بڵێت حەڵاڵە كە دەستیم نەبڕیوە و خوای تعالی سزام نادات چونكە حەرام نیە، چونكە ئەگەر كارەكەی خۆی بە حەڵاڵ زانی ئەوا كافر دەبێت بە إجماعی هەموو زانایان.

**سێیەم**: نابێت كارەكەی خۆی بەباشتر و پێشكەوتووتر بزانێت لە دەستبڕینەوەكە، یان بڵێت ئەمەیان لەگەڵ ئەم سەردەمە دەگونجێ، ئەگینا كافر دەبێت ئەگەر كارەكەی خۆی بە باشتر یان بە یەكسانی حوكمەكەی خوای بزانێت .

**چوارەم**: نابێت جحدی حوكمەكەی خوا بكات ، واتا نابێت نكۆڵی لەو حوكمە بكات لە كاتێكدا دەیەها بەڵگەی لەسەرە ، ئەگینا كافر دەبێتبە إجماع.

**گوتم**: سەلەفی ئێمە ئەم حاكمەیان بە كافر نەزانیوە ،بەڵكو بە وەلی ئەمرو خەلیفەی موسڵمانیان زانیوە و سەمع و تاعەیان بۆیان بووە ، بۆ نمونە كەسێكی وەكو(حەجاج یان یەزید یان غەیری ئەوانیش) لە كاتێكدا ڕیوایەتێكی زۆر هاتوون كە زوڵم یان حوكمیان هەندێك جار جێبەجێ نەكردووە .

هەرچەندە دەربارەی ئەوانیش خیلاف هەیە:

**الإمام طاوس بن كيسان** رحمه الله : ئیمامی ابن أبـی شیبة ڕیوایەتی کردووە[177] و دەفەرمووێ : (حدثنا قبـیصة عن سفیان عن معمر عن ابن طاوس عن أبـیه قال ، **عجبا لاخواننا من أهل العراق یسمون الحجاج مؤمنا**) . واتە: لە ابن طاوسەوە لە باوکییەوە (کە ئیمامی طاوسە) کە فەرموویەتی : سەرم لە برایانمان سوڕماوە لە عێراق کە حەجاج بە بڕوادار ناودەبەن .

**الإمام الشعبـي** رحمه الله : ابن أبي حاتم[178] و اللالكائي[179] و غەیری ئەوانیش ڕیوایەتیان کردووە (عن أبو بکر بن عیاش عن الاجلح عن الشعبـي قال : **أشهد أنه مؤمن بالطاغوت کافر بالله – یعني الحجاج**)، واتە :لە ئیمامی الـشعبـیەوە کە فەرمووی : شایەتی دەدەم کە حەجاج بڕوای بە تاغوت هێناوە و کافرە بە خوای تعالى.!

وە ئیمامی عمر بن عبدالعزیز و الحسن البصري و ابراهیم النخعي[180] و سعـیدی کوڕی جبیر[181] و مجاهد بن جبر[182] وغەیری ئەمانیش بەهەمان شێوە تەکفیریان کرد لە کاتێکدا کە کوفرەکانی حەجاج ئەوەندەی کوفری حاکمەکانی ئەمڕۆ نابوو .

تەنانەت خروجی لێکراو شەڕی دژکرا ، هەربەهۆی خروجیشەوە بوو کە گەورەتابعی ئیمامی سەعیدی کوڕی جبـیر کوژرا[183] خوای تعالى بە شەهید قبوڵی بکات، بابەتەکە دووردرێژە ئێرە شوێنی ئەوە نیە، جا ئەگەر هەندێك لە سەلەف

[177] مصنف ابن أبـي شیبة : ٧/٢١٧.
[178] سەرچاوەکەی سەرەوە.
[179] شرح أصول إعتقاد / باب جمتع الکلام في الإیمان.
[180] مصنف الإمام ابن أبـي شیبة : ٦/١٦٤
[181] البدایة و النهایة : ٩/١٥٦
[182] البدایة والنهایة : ٩/١٥٧
[183] البدایة والنهایة : ٩/١٥٦

حەجاجیان تەکفیر کردبیت و خروجیان لەو کردبیت[184] لە کاتێکدا کوفرێکی وای لێنەبینرابوو، ئەی ئەگەر حاڵی حاکمەکانی ئەمڕۆیان ببینیایە چییان دەکرد؟.

بەڵام لەگەڵ ئەوەیشدا سەبارەت بە حەجاج ڕەئی أرجح ئەوەیە کافر نەبوو و موسڵمان بوو، بەڵام هەندێك جار حوکمیان بە قورئان ناکرد بەبێ ئەوەی دەستکاری یاساکە بکەن ، بۆیە سەلەف تەکفیریانیان نەکرد .

**بۆیە ڕیوایەتێکی زۆر هاتووە لە زانایان لەسەر ئەوەی کە ئەم حاڵەتەی پێشتر باسمانکرد کوفری بچوکە و خاوەنەکەی پێی کافر نابێت لەوانە :**

**الإمام عبدالله بن عباس** رحمه الله ڕیوایەتی لێوەهاتووە بۆ نمونە : ئیمامی الحافظ أبو عبدالله الحاكم ڕیوایەتی کردووە و فەرموویەتی : (أَخْبَرَنَا أَحْمَدُ بْنُ سُلَيْمَانَ الْمَوْصِلِيُّ، ثنا عَلِيُّ بْنُ حَرْبٍ، ثنا سُفْيَانُ بْنُ عُيَيْنَةَ، عَنْ هِشَامِ بْنِ حُجَيْرٍ، عَنْ طَاوُسٍ، قَالَ: قَالَ ابْنُ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا: إِنَّهُ (صلى الله عليه وسلم)**لَيْسَ بِالْكُفْرِ الَّذِي يَذْهَبُونَ إِلَيْهِ إِنَّهُ لَيْسَ كُفْرًا يَنْقِلُ عَنِ الْمِلَّةِ** ﴿**وَمَنْ لَمْ يَحْكُمْ بِمَا أَنْزَلَ اللَّهُ فَأُولَئِكَ هُمُ الْكَافِرُونَ**﴾(المائدة: ٤٤) **كُفْرٌ دُونَ كُفْرٍ**)[185] . واتە : ابن عباس فەرموویەتی : ئەو کوفرە ئەوە نیە کە ئێوە بۆی دەچن ، نە خێر ئەوە کوفرێك نیە خاوەنەکەی پێی کافر بیت ، ﴿**ومن لم يحكم بما أنزل الله فأولئك هم الكافرون**﴾ کوفری غەیری کوفری گەورەیە (واتە کوفری بچوکە) . سەنەدەکەی لاوازە و دواتریش ڕوونی دەکەینەوە .

**الإمام عطاء بن أبي رباح** رحمه الله ئیمامی الطبري لە تەفسیری ئایەتەکەدا و ئیمامی ابن بطة و غەیری ئەوانیش ڕیوایەتیان کردووە : (حَدَّثَنَا إِسْحَاقُ الْكَاذِيُّ ، قَالَ: حَدَّثَنَا عَبْدُ اللَّهِ بْنُ أَحْمَدَ ، قَالَ: حَدَّثَنِي أَبِي قَالَ: حَدَّثَنَا عَبْدُ الرَّحْمَنِ ، قَالَ: حَدَّثَنَا

[184] مع الخلاف

[185] المستدرك / ٣٢١٩

سُفْيَانُ ، عَنِ ابْنِ جُرَيْجٍ ، عَنْ عَطَاءٍ ، قَالَ: **كُفْرٌ دُونَ كُفْرٍ ، وَظُلْمٌ دُونَ ظُلْمٍ ،وَفُسُوقٌ دُونَ فُسُوقٍ**)[١٨٦] .

واته : لـه عطائى كورِى رِەبباحەوە كە دەربارەى ئايەتەكە فەرموويەتى : كوفر و زولـم و فيسقى بچوكە.

**وه غەيرى ئەوانيش**: وەلە غەيرى ئەمانيش لـه سفيان و ئيمامى أحمد[١٨٧] و غەيرى ئەوانيش هاتوون ، وه شەيخى ئيسلام ابن تيمية و ابن كثير و ابن القيم و غەيرى ئەوانيش لـه ئەهلى سوونه لـەسەر كافر نەبوونى ئەو حاكمامه ئەگەر چى حوكميشيان بە قورئان نەكردبـيت و حكم بغير ما أنزل الله بە كوفرى بچوك ناودەبەن . بەلام بەمەرجێك تووشى ئەو چوار خالـه نەبن كە باسمانكرد ، بەلام بـيگومان تاوانێكى گەورەيە و كوفرى بچوكە كە لـه تاوانە گەورەكان ترسناكترە و خاوەكەى موستەحەقى سزاى الله تعالى دەكات .

## تێگەيشتنى زانايان بۆ كوفردون كوفر

وتمان ئەوەى سەلـەف پێيان وتووه كوفر دون كوفر و كوفرى بچوك ئەوەيە كە حاكم نابـيت دەستكارى ياسا بكات يان إستحلال و جحد و تفضيلى نەبـيت ، بەلـكو لـه حالـەتێكدا حوكم بە قورئان نەكات بە كاتى يان جارێك يان دووجار ، ئەمەيە تێگەيشتنى زانايان لـەو بارەوە و إجماعى هەموو ئەهلى سوونەيشى لـەسەرە لـه سەلـەف و خەلـەف و معاصرينيش ، نەك حاكمێك كە بە ويستى خۆى ياساى الله تعالى لادەدات و خۆى و پەرلـەمانە كوفريەكەى ياسا دەنوسنەوە ، نەخێر ئەوە تەنها وتەى جەهميە كافرەكانن ، دوێنى شيركيان لـه تەوحيدى ئەسماء و صيفات دەكرد و ئەمرۆيش لـه حاكميەت :

**الإمام طاوس بن كيسان** رَحِمَهُ ٱللَّهُ كە لـه تابعينە و قوتابى ئيمامى إبن عباس ئامۆزاى پێغەمبـەرى خوايە ﷺ ، بـيگومان ئيمامى تاوس شارەزاترە لـه مەبەستى ابن عباس

[١٨٦] تفسير الإمام الطبري : ٣٥٥/١٠

[١٨٧] مجموع الفتاوى لإبن تيمية : ٢٥٤/٧

و سەلەف لە كفر دون كفر ، ئیمامی تاوس دەفەرمووێ : (**لیس الحكم في الفروع بغير ما أنزل الله مع إقرار بحكمه و المحبة له ينقل عن الملة**)[188] . واتە : حوكم كردن بە غەیری قورئان لە بابەتە لاوەكیەكان كوفرێك نیە كە لە دین دەری بكات ، بە مەرجێك دان بە حوكـمەكەدا بنێـت و خۆشیشی بـــوێ.

**گوتم**: ئەمە تێگەیشتنی تابعینە بۆ كوفر دون كوفر كە كاتێك حوكم نەكردن بە قورئان كوفری بچوكە كە حوكم نەكردن لە بابەتی لاوەكی و فەرعی بـیـت نەك یاسای الله تعالى لابدات و بە ویستی خۆی و ئەندامەكانی یاسا بنوسێـەوە وەكو جەهمیەكانی ئەمڕۆ لێی تێگەیشتوون .

**الإمام إسحاق بن راهويه** رحمه الله كە لە زانایانی سەلەفە و مامۆستا و هاوڕێی ئیمامی أحمدە فەرموویەتی: (**أجمع المسلمون على أن من سب الله أو سب رسوله ﷺ أو دفع شيئاً مما أنزل الله عز وجل أو قتل نبـياً من أنبـياء الله عز وجل أنه كافر بذلك وإن كان مقراً بكل ما أنزل الله**)[189].واتە : موسڵمانان یەكدەگن لەسەر ئەوەی كە هەركەسێك جوێن بە الله تعالى یان بە پێغەمبـەرەكەی ﷺ یان شتێك ڕەت بكاتەوە لەو شەریعەت و یاسای الله تعالى یان پێغەمبـەرێك بكوژێت ئائەوە كافر دەبـیت بەو كارانە ئەگەر چی بڕوایشی بە هەموو دینی الله تعالى هەبـیـت .

**الإمام أبو محمد إبن حزم** رحمه الله إجماع نقلٚ دەكات و دەفەرمووێ: (**لا خلاف بـين المسلمين أن من حكم بحكم الإنجيل مما لم يأت بالنص عليه وحي في الشريعة الإسلام، فإنه كافر مشرك خارج عن الإسلام**)[190]. واتە موسڵمانان خیلافیان لەوەدا نیە كە هەركەسێك حوكم بە حوكمی ئینجیل بكات كە لە یاسای ئیسلامدا ئاماژەی پێنەكرابوو، ئائەو حاكمە كافر و موشریكە و لەدەرەوەی بازنگەی ئیسلامە .

---

[188] التوضيح عن توحيد / ١٤٠ – ١٤٢

[189] الصارم المسلول : ١٥/٢

[190] الأحكام : ١٧٣/٥

ئەمەی ئیمام باسی کردو ئیجماعیشی لەسەر هێنایەوە ئەوەیە کە حاکمێك یاسای الله تعالی ـی لاداوە کە قورئانە بۆ یاسایەکی تری الله تعالی کە نەسخ بۆتەوە، جا ئەم لادانە یەك حوکمیش بێت یان هەموو ئەحکامەکان بێت ، ئائەو حاکمە کافر دەبێتەوە و موشریکە ، ئەگەر بۆ ئینجیل بەو شێوازە ترسناك بێت کە حوکمێکی الله تعالی یە کە نەسخ بۆتەوە ، ئەی دەبێت حوکمی ئەوە چیبێت کە یاسای قورئان لادەدات بۆ بیروبۆچوونی خۆی و ئەورووپا و کافران ؟؟.

**شەیخی ئیسلام ابن تیمیة** رحمه الله لە چەندەها جێگە حکم بغیر ما أنزل الله بەکوفری بچوك و کوفر دون کوفر ناودەبات ، بەڵام کاتێك کە باس دێتە سەر تەشریع و یاسا دانان ئەوا إجماع نقلْ دەکات لەسەر کافر و مورتەددی ئەوانەی کە یاسای الله تعالی لادەدەن .

**یەکەم**: فەرموویەتی: (**ومعلوم بالاضطرار من دين المسلمين وباتفاق جميع المسلمين أن من سوغ اتباع غير دين الاسلام أو اتباع شريعة غير شريعة محمد ﷺ فهو كافر**)[191]. واتە: شتێکی پێویست و زانراو لە ئاینی موسڵماناندا و بە یەکدەنگی هەموو موسڵمانان ئەوەیە کە هەرکەسێك ڕێگەبدات بە شوێنکەوتنی غەیری دینی ئیسلام، یان شوێنی یاسایەك بکەوێت کە غەیری یاسای محمد ﷺ بێت، ئائەوە کافرە .

**دووەم**: وە هەروەها فەرموویەتی : (**مَتَى تَرَكَ الْعَالِمُ مَا عَلِمَهُ مِنْ كِتَابِ اللَّهِ وَسُنَّةِ رَسُولِهِ وَاتَّبَعَ حُكْمَ الْحَاكِمِ الْمُخَالِفِ لِحُكْمِ اللَّهِ وَرَسُولِهِ كَانَ مُرْتَدًّا كَافِرًا يَسْتَحِقُّ الْعُقُوبَةَ فِي الدُّنْيَا وَالْآخِرَةِ**)[192] . واتە : هەرکاتێك زانا وازی لەو عیلم و زانستەی هێنا کە فێری بوبوو لە قورئان و سونەتو چوو شوێنی حوکمی حاکمێك کەوت

---

[191] الفتاوى الكبرى لشيخ الإسلام لإبن تيمية : ٣/٥٣٤

[192] مجموع الفتاوى : ٣٥/٣٧٣

که پێچەوانەی حوکمی الله تعالی و پێغەمبــەرەکەیەتی ﷺ بەوە بووە بە مورتەدد و کافرە و موستەحەقی سزای دونیا و قیامەتە .

**سێیەم**: وە فەرموویەتی : (**ومن كان ملتزماً لحكم الله ورسوله باطناً وظاهراً، لكن عصى واتبع هواه، فهذا بمنزلة أمثاله من العصاة**)[193] . واتە : وە هەر حاکمێك کە پابەند بـیت بۆ حوکمی الله ﷻ لـە ئاشکرا و لـە نهێنیەکاندا، بەڵام هەندێ جار لێی لادەدات و شوێنی هەواوئارەزووی دەکەوێت، ئائەمە لـە ریزی هاوشێوەکانیەتی لـە تاوانباران (واتا کافر نین) کوفر دون کوفرە.

**واتە ئەو حاڵەتە دەبێتە کوفری بچوك کە حاکم پێویستە ملکەچی یاسای قورئان بێت و نابێت یاسا لابدات لـە وڵات و یاسایەکی تر بێنێت ، بەڵام هەندێکجار لـە حوکمەکە لادەدات بە فعل ، ئەوا ئەوکاتە کافر نیە** ، بێگومان ئەمیش مەرجی خۆی هەیە.

**الإمام إبن القيم** رحمه الله لـە بارەی کوفر دون و کوفر و کوفری بچوك لـەم بابەتەدا دەفەرمووێ: (**أن الحكم بغير ما أنزل الله يتناول الكُفْرَيْنِ، الأصغر والأكبر بحسب حال الحاكم. فإنه إن اعتقد وجوب الحكم بما أنزل الله في هذه الواقعة، وعدل عنه عصيانا، مع اعترافه بأنه مستحق للعقوبة، فهذا كفر أصغر**)[194] . واتە : بەڕاستی (بابەتی) حوکم کردن بە غەیری قورئان هەردوو کوفرەکە کوفری بچوك و گەورەیش لـە خۆدەگرێت بە حاڵی حاکمەکە کەوتووە ، حاکم ئەگەر بڕوای وابـیت کە واجبە لـەسەری حوکم بە قورئان بکات ،بەڵام لـەو حاڵەتەدا لایدا و حوکمی پێنەکرد بەهۆی تاوانەوە و إعترافیش بەوە بکاتکە شایستەی سزایە ، ئائەمە کوفری بچوکە .

[193] منهاج السنة النبوية ٥/ ١٣١

[194] مدارج السالكين : / ٣٣٦

گوتم: بڕوانن ئەوەیە تێگەیشتنی زانایان بۆ کفر دون کفر و کوفری بچوك لەم بابەتەدا، **چونکە ئەهلی سونە یەکدەنگە کە کفر دون کفر (واتا کوفری بچوك) بابەتی تەشریع و تبدیل و یاسادانان ناگرێتەوە، بەڵکو تەنها ئەو حاکمە موسڵمانانە دەگرێتەوە کە حوکم بە قورئان دەکەن ،بەڵام هەندێك جار لە هەندێك حاڵەتدا حوکم بە قورئان ناکەن**، ئائەمە کوفری بچوك هەروەکو ئیمامی ابن القیم فەرمووی کە ئەمە لە حاڵەتێکدا ڕوودەدات نەك بیکات بە ڕێباز و یاسای خۆی و هەمیشە لە حوکمی الله لادات.

**الإمام إبن كثير** رَحِمَهُ اللهُ لە تەفسیرەکەیدا لە چەندەها جێگە حكم بغير ماأنزل الله بە کوفری بچوك ناودەبات ، بەڵام کاتێك قسە دێتە سەر تەشریع و یاسانوسین دەفەرمووێ : (**يُنْكِرُ تَعَالَى عَلَى مَنْ خَرَجَ عَنْ حُكْمِ اللَّهِ الْمُحكَم الْمُشْتَمِلِ عَلَى كُلِّ خَيْرٍ، النَّاهِي عَنْ كُلِّ شَرّ وَعَدْلٍ إِلَى مَا سِوَاهُ مِنَ الْآرَاءِ وَالْأَهْوَاءِ وَالِاصْطِلَاحَاتِ، الَّتِي وَضَعَهَا الرِّجَالُ بِلَا مُسْتَنَدٍ مِنْ شَرِيعَةِ اللَّهِ ..ثم قال.. وَمَنْ فَعَلَ ذَلِكَ مِنْهُمْ فَهُوَ كَافِرٌ يَجِبُ قِتَالُهُ، حَتَّى يَرْجِعَ إِلَى حُكْمِ اللَّهِ وَرَسُولِهِ**)[195].واتە : الله تعالى نەهی و ئینکاری لە کەسێك دەکات کە لە حوکمی الله عَزَّوَجَلَّ دەربچێت کە حوکمێکە کە پێکهاتووە لە چاکە و خەیرێك و ناهی و ڕێگر لە هەموو خراپە و شەڕێك، ڕەخنەی گرتووە لەوانەی کە وازیان هێناوە و چوونە بەرەو شتی تر (جگە لەقورئان) ، ئەمیش لە ئارائ و بۆچوونی کە خەڵك دروستیانکردووە کە هیچ بەڵگەیەکی لەسەر نەهاتووە لە دین و حوکمی الله عَزَّوَجَلَّ (پاشان فەرمووی) جا هەرکەسێك ئەم کارە ئەنجام بکات ئەوا کافرە و پێویستە کوشتاری لەگەڵ بکرێت ، تاکو دەگێڕێتەوە بۆلای حوکمی قورئان و سونەت.

**الإمام إبن أبـى العز الحنفى** رَحِمَهُ اللهُ دەفەرمووێ : (**إن اعتقد وجوب الحكم بما أنزل الله، وعلمه في هذه الواقعة وعدل عنه، مع اعترافه بأنه مستحق للعقوبة، فهذا عاص،**

[195]تفسير ابن كثير : ١٣١/٣

**ويسمى كافراً كفرا مجازياً أو كفراً أصغر.)**[١٩٦]. واته : خۆئەگەر بڕوای بە واجبیتی حوکم کردن هەبیت بە حوکمی الله تعالی و بزانیت و لەم حاڵەتەدا وازی لێبێنێت ، لەگەڵ ئەوەیشدا دان بەوەدا بنێت کە موستەحەقی سزایە ، ئائەمە تاوانبارە ، بە کافرێك ناوی لێدەنرێت کە کوفرێکی مەجازییە یان کوفرێکی بچوکە .

واتە ئەمە لە حاڵەتێکدا ڕوودەدات ، نەك بیێتە تشریع و بەیەکجاری یاسای الله لابدرێت.

**الإمام سليمان بن عبدالله ال شيخ** رحمه الله ئیمام إجماع نقلّ دەکات و دەفەرمووێ :

(**وقد انعقد إجماع أهل السنة والجماعة على خلافهم، ونحن لم نكفر إلا من لم يحكم بما أنزل الله من التوحيد بل حكم بضده وفعل الشرك ووالى أهله وظاهرهم على الموحدين**)[١٩٧]. واتە : یەکدەنگی ئەهلی سوونە لەسەر ئەوە دامەزراوە لە خیلافی ئەواندا (واتە خەواریجەکان کە هەموو حاکمێك تەکفیر دەکەن) ، وە ئێمە هیچ (حاکمێك) تەکفیر ناکەین ئیللا حاکمێك نەبیت کە لە تەوحیددا حوکم بە قورئان ناکات ، بەڵکو حوکم بە پێچەوانەی ئەوە دەکات کە شیرکە و ئەنجامی دەدات و هاوکاری کافران دەکات و سەریان دەخات دژی موسڵمانان).

ئەمە حاڵی حاکمە تاغوتەکانی سەردەمە کە نەك تەوحید ناچەسپێنن بەڵکو کوفرو شیرك و ئیلحاد بەرزدەکەنەوە و هاوکاری موڵحیدان و موشریکان دەکەن تاکو چالاکی ئەنجام بدەن، کۆڕ و سیمینار و چالاکی موڵحیدان بە ئاشکرا دەکرێت و هێزی ئەم حاکمانە دەیانپارێزن ، وە کتابەکانیان بۆ چاپ دەکرێت تا بەئاشکرا ئەوەی بیانەوێ بیڵێن، وە خۆیشیان لەناو کوفر و شیرکدان کە خۆیان کردۆتە شەریکی الله تعالی لە حوکمدا و خۆیان لەجیاتی الله عزوجل یاسا دەنوسنەوە و تەشریع

---

[١٩٦] شرح العقيدة الطحاوية / ٢٦٣

[١٩٧] التوضيح عن توحيد الخلاق في جواب أهل العراق وتذكرة أولي الألباب في طريقة الشيخ محمد بن عبد الوهاب / ١٤٢

دەکەن ، وە هاوکاری کافران دەکەن بە هەموو شێوەیەك دژی موسڵمانان، ئایا ئەمیش کوفر دون کوفرە ؟!.

**الإمام محمد بن إبراهيم ال شيخ** رحمه الله ئیمام و موفتی پێشووتری دەوڵەتی سعودیە دەفەرمووێ : (**وأما الذي قيل كفر دون كفر ، إذا حاكم إلى غير الله مع إعتقاد أنه عاص وأن حكم الله هو الحق ، فهذا الذي يصدر منه المرة ونحوهما ، أما الذي جعل قوانين بترتيب و تخضيع فهو كفر، و أن قالوا أخطأنا و حكم الشرع أعدل**)[198] . واتە : ئەوەی کە باسدەکرێت (لەسەلەفەوە) دەربارەی کفر دون کفر ئەوە ئەوەیە کە حوکمی بە غەیری قورئان کرد و لەگەڵ ئەوەیشدا پێی وابوو کە تاوانبارە و حوکمەکەی الله تعالى حەقە (نەك ئەوەی خۆی) ، ئەمیش جارێك یان چەند جارێك لێی دەربکەوێت ، بەڵام ئەوەی کە یاسا دادەنێت بە یاسایەکی ڕێکخراو و بەهێز ئائەوە کوفرە ئەگەر چی بـیشڵێن ئێمە هەڵەین و حوکمی الله ڕێك و پێکترە.)

دووەم : وە فەرموویەتی : (**وأما القسم الثاني من قسمي كفر الحاكم بغير ما أنزل الله، وهو الذي لا يخرج عن الملة.. وذلك أن تحمله شهوته وهواه على الحكم في القضية بغير ما أنزل الله مع اعتقاده أن حكم الله ورسوله هو الحق، واعترافه على نفسه بالخطأ ومجانبة الهدى. وهذا وإن لم يخرجه كفره عن الملة فإن معصيته عظمى أكبر من الكبائر كالزنا وشرب الخمر والسرقة واليمين الغموس وغيرها، فإن معصيةً سماها الله في كتابه كفراً أعظم من معصية لم يسمها كفراً**)[199]. واتە : بەڵام کۆمەڵی دووهەمیان بەو حاکمانەی کە حوکم بە غەیری قورئان دەکەن لە کاتێکدا پێی کافر نابن ، ئەویش ئەوەیە کە هەواوئارەزوو وای لێبکات کە **لە بابەتێکدا** (نەك یاسا لابدات) حوکم بە قورئان نەکات لەگەڵ ئەوەیشدا (دەبـیت) بڕوای وابـیت

---

[198] مجموع الفتاوى الشيخ محمد بن إبراهيم : ٢٨٠/١٢

[199] فتاوى الشيخ محمد بن ابراهيم، (رسالة تحكيم القوانين) ١٢/ ٢٩١

كە حوكمی الله ﷻ و پێغەمبــەرەكەی ﷺ حەقن و إعترافیش بەوە بكات كە لـە حەق لایداوە و تووشی لادان بووە ، خۆ ئەگەر ئەمە كوفرەكەی كافری نەكات ئەوا دەبــێتە تاوانێكی گەورەتر لـە تاوانە گەورەكان وەكو داوێن پیسی و خواردنەوەی عەرەق و دزی و درۆ و شایەتی درۆ گەورەترە ، وە خوای تعالی تاوانەكەی بە كوفر ناوبردووە ، (خۆ ئەگەر لـە تاوانە گەورەكان گەورەتر نەبوایە نایفەرموو كوفر) .

**خوێنەری بەڕێز** : ئەمە زانا و هەڵگری پەیامی تەوحید و شێخی نەجد بوو كە پێی وایە هێشتا بەم حاڵەیشەوە گومان وایە كە كوفری اكبر بــێت (**وهذا وإن لم يخرجه كفره عن الملة فإن معصيته عظمى أكبر من الكبائر**) ، بۆیە بابەتی یاسادانان ئەولاتر و ڕوونترە لـە كافریەتی خاوەنەكەی .

**سێیەم** : وە فەرموویەتی : (**إن من الكفر الأكبر المستبين تنزيل القانون اللعين منزلة ما نزل به الروح الأمين على قلب محمد ﷺ ليكون من المنذرين بلسان عربي مبين**)[200] . واتە : بەڕاستی لـە جۆرەكانی كوفری گەورە ئەوەیە كە كە یاسای دەستكرد دابنێی لـە جێی ئەو یاسایەی كە جبريل (عليه السلام) هێنا بۆسەر دڵی محمد ﷺ بۆ ئەوەی ببــێت بە ترسێنەرێك بە زمانێكی عەرەبی ڕوون و ڕەوان .

**الإمام أحمد شاكر** رحمه الله دەفەرمووێ : (**إن الأمر في هذه القوانين الوضعية، واضح وضوح الشمس ، هي كفر بواح لا خفاء فيه ولا مداورة، ولا عذر لأحد فيمن ينتسب للإسلام كائناً من كان العمل بها**)[201] . واتە : حوكمی حوكم كردن بەو یاسا دەستكردانە ڕوونە وەكو ڕووناكی خۆر ، كە كوفرێك ئاشكرایە و هیچ نهێنیەكی تێدانیە وە هیچ عوزرێكیش نیە بۆ هەركەسێك كەكاری پێبكات و خۆیــــشی بداتە پاڵ ئیسلام ، جا كێـــــیە بابــێت.

---

[200] رسالة تحكيم القوانين / ١

[201] عمدة التفسير : ١٧٤/٤

**الإمام الحافظ أحمد الحكمي** رحمه الله دەفەرمووێ : (وَمَعْلُومٌ أَنَّ اسْتِبْدَالَ مَا تَتْلُوهُ الشَّيَاطِينُ وَتَتَقَوَّلُهُ وَالِانْقِيَادَ لَهُ وَالْعَمَلَ بِهِ عِوَضًا عَمَّا أَوْحَى اللَّهُ تَعَالَى إِلَى رَسُولِهِ ﷺ، هَذَا مِنْ أَعْظَمَ الْكُفْرِ، وَهُوَ مِنْ عِبَادَةِ الطَّاغُوتِ الَّتِي هِيَ أَصِلُ الْكُفْرِ، وَقَدْ سَمَّى اللَّهُ تَعَالَى طَاعَةَ الْعُلَمَاءِ وَالْأُمَرَاءِ فِي تَحْلِيلِ مَا حَرَّمَ اللَّهُ أَوْ تَحْرِيمِ مَا أَحَلَّهُ، سَمَّى ذَلِكَ عِبَادَةً وَأَنَّهُ اتِّخَاذٌ لَهُمْ أَرْبَابًا مِنْ دُونِ اللَّهِ فَقَالَ تَعَالَى: ﴿اتَّخَذُوا أَحْبَارَهُمْ وَرُهْبَانَهُمْ أَرْبَابًا مِنْ دُونِ اللَّهِ﴾[202] الْآيَةَ، قَالَ عَدِيُّ بْنُ حَاتِمٍ رضي الله عنه حِينَ سَمِعَ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَتْلُوهَا: إِنَّا لَسْنَا نَعْبُدُهُمْ قَالَ: ﷺ أَلَيْسَ يُحِلُّونَ مَا حَرَّمَ اللَّهُ عز وجل فَتُحِلُّونَهُ، وَيُحَرِّمُونَ مَا أَحَلَّ اللَّهُ فَتُحَرِّمُونَهُ ﷺ؟ قَالَ: بَلَى قَالَ: ﷺ فَتِلْكَ عبادتكم إياهم ولهدا قَالَ تَعَالَى بَعْدَهَا: ﴿وَمَا أُمِرُوا إِلَّا لِيَعْبُدُوا إِلَهًا وَاحِدًا لَا إِلَهَ إِلَّا هُوَ سُبْحَانَهُ عَمَّا يُشْرِكُونَ﴾[203] فَإِذَا كَانَ هَذَا فِي طَاعَةِ الْأَحْبَارِ وَالرُّهْبَانِ فَكَيْفَ فِي طَاعَةِ الشَّيْطَانِ فِيمَا يُنَافِي الْوَحْيَ؟! فَهَلْ فَوْقَ هَذَا الشِّرْكِ مِنْ كُفْرٍ؟!)[204]. واتە : وە شتێکی زانراوە (ڕوونیشە) کە لادان و گۆڕینی ئەو وەحیەی کە خوای تعالی ناردی بۆ پێغەمبەرەکەی ﷺ ، وە گۆڕینی بۆ وتەی شەیتان و (بەرنامەی) شەیتان و ملکەچ بوون بۆی، ئەمە لە گەورەترینی کوفرە ، وە ئەمە خۆی لە عیبادەتکردنی تاغوت دەبینێتەوە کە خۆی لە خۆیدا بنچینەی کوفرە ، وە خوای تعالی ئەم کارەی بە گوێڕایەڵی مەلا وکاربەدەستان لە حەڵاڵ کردنی حەڕام و حەڕامکردنی حەڵاڵ بە عیبادەت ناوبردووە...

پاشان دووبارە دەفەرمووێ: ئەگەر ئەمە حوکمی کەسێك بێت کە گوێڕایەڵی مەلا و کاربەدەستان بکات ئاوا حوکمی بێت ، ئەی دەبێت حوکمی کەسێك چی بێت کە گوێڕایەڵی شەیتان بکات لە شتێك کە پێچەوانە و نەفی قورئان و

---

[202] (سورة التوبة / ٣١)

[203] (سورة التوبة / ٣١)

[204] معارج القبول بشرح سلم الوصول إلى علم الأصول: ٢/٥٥٠

سونەت بكات ، ئایا كوفرێك هەیە لەم شیركە گەورەتر بـیت و لە سەروی ئەمە بـیت ؟؟ .

**صالح الفوزان** خوای تعالی هیدایەتی ئێمە و ئەویش بدات ، ئەم زانایە لـە زۆر شوێن بەهەمان شێوە حوكم بە غەیری قورئان بە كوفـــری بچوكـ ناودەبات و خاوەنەكەی بە كافرنازانێت و بە كفر دون كفر ناویدەبات ، بەڵام كاتێك دێتە سەر یاسادەستكردەكان ئەوا بە كافر و تاغوت ناویان دەبات و ڕوونی دەكاتەوە كە لـەم حاڵـەتەدا كفر دون كفر ناگرێتەوە ، هەروەكو وتوویەتی : (**منهم الحكام الذين يسنون القوانين و يلغون الشريعة و يجعلون القوانين محلها ، هؤلاء طواغيت ، الذي يحكم بغير ما أنزل الله** ﷻ**، هذا طاغوت بنص القرآن ﴿يريدون أن يتحاكموا إلى الطاغوت وقد أمروا أن يكفروا به﴾**[205] ، **فمن حكم بغير ما أنزل الله متعمدا ذالك فإنه يكون طاغوتا.أما من حكم بغير ما أنزل الله مجتهدا يتحرى الحق ولكنه أخطأ ، فهاذا ليس طاغوتا**)[206]. واتە : هەیشیانە لـە دەسەڵاتداران كە یاسادادەنێن و یاسای الله تعالی لادەدەن و لـەوڵات و بڕیارەكانی هەڵدەوەشێننەوە و یاساكەی خۆیان لـەجێگاكەی دادەنێنەوە، ئائەوانە تاغوتن، ئەوەی حوكم دەكات بە غەیری قورئان تاغوتە بە نەصی (دەق) ـی قورئان ، ﴿دەیانەوێ حوكم بۆلای تاغوتان ببەنەوە لـە كاتێكدا كە فەرمانیان پێكرابوو كە كوفری پێبەك و پشتی لـێبكەن﴾، هەركەسێك حوكم بە غەیری قورئان بكات بە ئارەزووی خۆی ئابەوە دەبـیت بە تاغوت.بەڵام ئەوەی حوكم بە غەیری قورئان دەكات بەڵان بە إجتهاد (واتە خۆی وادەزانێت ئەمە حوكمی خوایە بەڵام هەڵەدەكات) حەقی دەوێ بەڵام هەڵـەدەكات ، ئائەمە تاغوت نیە.

---

[205] سورة النساء / ٦٠

[206] شرح معنى الطاغوت / ٩ (دارالمأثور).

**پاشان دەڵێت**: (**إنما الطاغوت الذي تعمد مخالفـــة الشــرع، و تعمد الحكم بغير ما أنزل الله، يجلب القوانين و المحاكم القانونية يجعلها محل الشريعة، هذا لاشك أنه طاغوت، ليس طاغوتا عاديا بل من رءوس الطواغيت الخمسة**). واتە: بەڕستی تاغوت ئەوەیە کە بە مەبەستیەتیپێچەوانەی یاساى ئیسلام بکات ، وەخۆی یاسائامادەدەکات و دەینوسێتەوە لـە شوێنی یاساکەی الله تعالى دایدەنات ، هیچ گومانی تێدا نیە کە ئەمە تاغوتە ، تاغوتێکی ئاسای نیە بەڵکو لـە گەورەکانی پێنج تاغوتەکەیە.وە لـە شوێنی تریش هەمان بابەت باس دەکات کە دواتر هەندێکـــــی نقلّ دەکەین.

زانایانی سەردەم لـە ئەهلی سوونە وتە و ڕوونکردنەوەیان زۆرە لـەم بابەتە کە خوای تعالى هاوکار بـیت دواتر یەك یەك دێینە سەری بە تایبەت وتەی زانایان:(شێخ سلیمان ناصر العلوان وە شێخ على الخضير وە شێخ ناصر الفهد و غەیری ئەمانیش لـە زانایانی سەردەم خوای تعالى إستقامەیان پێبدات).

## حوكم كردن بە غەيرى قورئان لە چ حاڵەتێكدا كوفرى گەورەيە؟

خواى تعالى لـە دەيەها ئايەتدا حوكمى كافر[٢٠٧] و تاغوت[٢٠٨] و مونافيق[٢٠٩] و موشريكى[٢١٠] لـەو كەسانەدا كە ڕوولـەحوكمى غەيرى الله تعالى دەكەن جا حاكم بن يان محكوم ، ئايا ئەم تاغوت و ملوڕانە كێن كە ئاوا الله تعالى بە خراپترين و بەددترين مرۆڤ باسى كردوون ؟.

## حاڵەتى يەكەم : لادانى ياساى الله تعالى

حاكم يان دەسەڵاتدار ئەگەر دەستى بۆ ياساى الله تعالى برد و لايدا ، دواتر خۆى يان پەرلـەمانەكەى ياسايەكى ديكەيان نوسيەوە ئەوا خۆى و هاودەستەكانيشى كافر دەبن وە الله تعالى بە تاغوت ناوى بردووە ، وە بەهيچ شێوەيەك بەشى بە ئيسلامەوە نيە ، وە هەركەسێكيش بە حوكمەكەى ڕازى بـيت موشريك و مونافيقە ، خواى تعالى دەفەرمووێ ﴿ومن لم يحكم بما أنزل الله فأولئك هم الكافرون﴾[٢١١] . واتە جا هەركەسێك حوكم بەو قورئانە نەكات كە الله تعالى بۆى ناردووين ئەوا ئەوانە كافرن ، خواى تعالى بە جەمع باسى كرد كە حاكم و دارودەستە مەلعونەكە دەگرێتەوە بەيەكجار ، وە خواى تعالى دەفەرمووێ : ﴿ألم تر إلى الذين يزعمون أنهم آمنوا بما أنزل إليك وما أنزل من قبلك يريدون أنيتحاكموا إلى الطاغوت﴾[٢١٢] . واتە ئەى محمد ﷺ ئايا ئەو مونافيقانەت بـينيوە كەخۆيشيان بە بڕوادار دەزانن كەچى حوكم بۆلاى تاغوتان دەبەنەوە ؟ ، خواى تعالى حاكم بەغەيرى قورئانى بە تاغوت و مەحكوميش بەو حوكمە كە پێى ڕازيە بە موشريك

---

[٢٠٧]سورة المائدة / ٤٤

[٢٠٨]سورة النساء / ٦٠

[٢٠٩] سورة النساء / ٦١

[٢١٠]سورة الأنعام / ١٢١ و الكهف / ٢٦

[٢١١]سورة المائدة / ٤٤

[٢١٢]سورة النساء / ٦٠

و مونافیق و بیٚ باوەڕ ناوبرد ، وە فەرموویەتی: ﴿**وإن أطعتمهم أنكم لمشركون**﴾ واتە: خۆ ئەگەر بە گوێی ئەو کافر و تاغوتانەتان کرد لـە گۆڕینی یاساکانی الله تعالی ئەوا ئێوە لـە موشریکانن .

## ڕەنگە بوترێ سەلەف تەکفیری ئەمانەیان نەکردووە، تۆ بۆ ئەم صنفە بە کافر دەزانیت ؟؟

لـە وەڵامدا دەڵێن : ئەمە چەواشەکاری و درۆیە و لـە چەند ڕوویەکەوە وەڵام دەدرێتەوە :

**یەکەم** : پێش هەموو شتێك سەردەمی سەلـەف ئەم دەستکاری کردنەی یاسای الله تعالی هەرنەبوو تاکو تەکفیری بکەن، بەڵکو زیاد لـە (٦٠٠) ساڵ دوای هاوەڵان بۆ یەکەم جار دەستکاری کردنی یاسای ئیسلام ڕوویدا لـەسەردەمی تەتار کە پێشتر باسمانکرد کە زانایان چۆن یەکدەنگ بوون لـەکافربوونیان، بۆیـە سەردەمی سەلـەف ئەم جۆرە کوفرە لـەلایان نامۆبوو وە ئەوان لـە دەوڵەتی ئیسلامی دەژیان و حوکمی وڵات هەمووی قورئانبوو .

**الإمام عبدالرحمن بن قاسم** رحمه الله لـە الدررالسنية لـە بەرگی (١٦) سەرەتای بابی (١٠) سەبارەت بە دەرکەوتنی ئەم یاسادەستکردانە دەفەرمووێ نە سەردمی پێغەمبەری خواو نە ئیمامەکانی سەلـەف بوونی نەبووە ، بەڵکو دواتر پەیدابووە، هەروەکو فەرموویەتی (**لم تكن في عصر الشيخ عبد الله، ولا في عصر النبوة، ولا الأئمة المهديين" وإنما سرت إلينا من أفراخ الإفرنج المنحلين، المعرضين عن شرع رب العالمين، فجاؤوا بنظمهم يطبقونها على المسلمين.**)[٢١٣] .

**دووەم**: سەلـەف ئەو حاکمانەیان بە موسڵمان ناوبرد کە دەستکاری یاسای الله تعالی ـیان نەکردووە ، بەڵام هەندێك جار لـە چـــەند واقعەیەکدا حوکمیان بە قورئان ناکرد وەك پێشتر ڕوونکرایەوە ، وەکو خەلیفەکان لـە دەوڵەتی ئیسلامیدا.

[٢١٣] الدرر السنية : ١٧١/١٦

## حاڵی دەسەڵاتدارانی سەردەم

ئەوەی ئەمڕۆ دەگوزەرێ لە حاڵی دەسەڵاتداران لە لادانی حوکمی الله ﷻ و هێنانی یاسای کوفری و ئەورووپی، ئەمە کوفر و شیرکە وە خاوەنەکی لە بازنگەی ئیسلامەتی دەباتە دەرەوە، جا هیچ جیاوازیەکی نیە ئەم لادانی حوکمی قورئانە بە گشتی بـێت یان تەنها یەك حوکمیش بـیت ، بۆ نمونە لـە حوکمەکانی ئیسلام ئەوەیە کە دەبـیت تەوحید و ئیسلام بە خەڵك بگەیەنرێت ، بەڵام ئەگەر حاکمێك هات و تەنها ئەو بەشەی لـە یاسای ئیسلام لابرد و ڕێگەی نەدا کە تەوحید بڵاوبـیتەوە ئەوا کافر دەبـیت ئەگەر چی دەستی دزیش ببرێتەوە و حەدد و قصاصەکانی تریش جێبەجێ بکات .

وە خوای تعالی لـە یاساکەی خۆیدا عەرەق خواردنەوەی حەرامکردووە و ڕێگەی پێنەداوە، بەڵام ئەگەر حاکمێك هات و تەنها ئەوەندەی لـە یاساکەی الله ﷻ گۆری و ڕێگەی بە خواردنەوەی عەرەقدا بەیاسا ئەوا کافر دەبـیت ئەگەر چی هەموو حوکمەکانی تری ئیسلامیش جێبەجێ بکات، بەڵام ئەگەر خۆی خواردیەوە یان بۆ کەسێك یان حاڵـەتێك ڕێگەیدا ئەوا کافر نابـێت بە مەرجێك دەستکاری یاسای الله تعالی نەکات ئائەمە کوفر دون کفرە . بەڵام ئەگەر وەکو ئەمڕۆ بە ویستی خۆی یاسا و بڕیارەکانی الله ـی ﷻ گۆڕی، زینا و داوێن پیسی بە یاسای کرا و عەرەق بە پێی یاسا ڕێگەی پێدرا و ڕیباکرایە مەرجی عەقارات و دەستی دز نەبڕایەوە بەڵکو گۆڕیان بە سجن و بکوژ نەکوژرایە و بەڵکو یاساکەی کرا بە سجن و یاساکەی الله تعالی ـیان گۆڕی و بەپێی یاسا ئازادی درا بە کافر و موحید تا چیان پێخۆشە بـیکەن و بـیڵێن و موسڵمان بە پێی ئەو یاسایە لـەسەر بڵاوکردنەوەی تەوحید سجن کراو و کوژراو هەربەپێی ئەو یاسایە هاوکاری کافران کرا دژی موسڵمانان و لـە ژێر سایەی ئەو یاسایەدا ئیڤۆلـەیشن کرا بە مەنهەج و بە خەیاڵی خۆیان قورئانی پێبەدرۆخرایەوە و ئازادی ڕەها هەیە کێ چیپێخۆشە بابـیکات ، بە پێی یاسا گروپ و کۆمەڵەی داکۆکیکاربۆ ئەتایست و

هاوڕەگەزبازان دروست کرا و ڕێگەیان پێدرا و ئەوەی الله تعالى پێی ناخۆشه لەم یاسایەدا کرا بە ئازادی ، ئەوا کافره وه هەرکەسێك پێی ڕازی بـێت وەکو ئەو کافره . خۆ ئەگەر یەك حوکمیش بگۆڕیت کافر ببـیت ئەی ئەگەر ئەم هەموو یاسایەی الله ﷻ بگۆڕیت و لەجیاتی ئەوه یاسای کوفر و نەتەوه یەکگرتووەکان بچەسپێنیت، ئەوا لاشك کە ئەمە کوفرەکەی ڕوونتر و ئاشکراتره و لە سەرانی تاغوته .هەربۆیە الله تعالى دەفەرمووێ : ﴿اتَّخَذُوا أَحْبَارَهُمْ وَرُهْبَانَهُمْ أَرْبَابًا مِنْ دُونِ اللَّهِ﴾[٢١٤] . واته یەهود و نەصرانیەکان کاربەدەستان و بەناوخواناسانیان دەکرد بە خوا بەسەر خۆیانەوه ، ئەم پەرستنه بریتی بوو لە گوێڕایەڵی بۆکردنیان لە گۆڕینی حوکمەکانی الله تعالى ، ئەوەی خوای تعالى لە یاساکەیدا ڕێگەی پێنەدابوو وه حەڕامی کردبوو ئەمان حەڵاڵیان دەکرد و ڕێیان پێدەدا وەکو ڕیبا یان عەرەق یان زینا یان غەیری ئەم کاره بەدانه ، لەسەرووی هەموویەوه ڕێگەدان بە کوفر و شیرك و ڕێگەنەگرتن لـێی و ئازادی ڕەها ، ئەمه بەتەنها بۆخۆی دەبـێته کوفرێکی بەواح .خوای تعالى ئاگادارمان دەکاتەوه کە لە حوکمدا شەریکی بۆ قەرارنەدەین چونکە الله تعالى لە حوکمدا شەریکی نیه ، ﴿وَلَا يُشْرِكُ فِي حُكْمِهِ أَحَدًا﴾[٢١٥] . واته خوای تعالى لە حوکمدا کەسی نەکردووه بە شەریکی خۆی لە حوکمدا ، بۆیە هەرکەسێك شوێنی حوکمی غەیری الله تعالى بکەوێت ئەوا شەریکی بۆ الله ﷻ قەراردادەوپێی دەبـیت بە موشریك، خوای تعالى دەفەرمووێ﴿وإن أطعتموهم إنكم لمشركون﴾ . واته : خۆ ئەگەر گوێڕایەڵی ئەو کافر و تاغوتانەتان کرد لە گۆڕینی یاسا و شەریعەتی الله ئەوا ئێوه لە موشریکانن ، وه خوای تعالى فەرموویەتی : ﴿فَلَا وَرَبِّكَ لَا يُؤْمِنُونَ حَتَّى يُحَكِّمُوكَ فِيمَا شَجَرَ بَيْنَهُمْ﴾[٢١٦]. واته: سوێندبـیت بە پەروەردگاری تۆ ئەی محمد ﷺ ئائەوانه بڕوادار نین تاکو تۆ نەکەن

[٢١٤] سورة التوبة / ٣١

[٢١٥] سورة الكهف / ٢٦

[٢١٦] سورة النساء / ٦٥

به حەکەم، جا ئەم بیٚ ئیمانیەی کە خوای تعالی لیٚرە باسی دەکات ئەصلی ئیمانە کە بە نەبوونی خاوەنەکەی کافر دەبـیتەوە، ئائەمە بڕیاری الله تعالی ـیە لـەو کەسانەی کە حوکمی غەیری الله تعالی ـیان دەویٚـت ، وە خوای تعالی بە مونافیق ناوی بردوون خوای تعالی دەفەرموویٚ ﴿وَإِذَا قِيلَ لَهُمْ تَعَالَوْا إِلَى مَا أَنْزَلَ اللَّهُ وَإِلَى الرَّسُولِ رَأَيْتَ الْمُنَافِقِينَ يَصُدُّونَ عَنْكَ صُدُودًا﴾[217] . واتە ئەگەر بەو خەڵکە بلیٚێ وەرن بۆلای حوکمی خوا و پیٚغەمبـەرەکەی ﷺ، دەبـینیت مونافیقەکان پشت هەڵدەکەن و نایەن بەدەم حوکمی الله ـوە ﷻ ، کەواتە ئەوەی کە حوکمی خوای تعالی ـی ناویٚ ئەوا مونافیقە جا پیٚی خۆش بـیت یان نا ، وە سەلـەف لـەم بارەوە دواون :

الإمام عبدالله بن عباس رضي الله عنه دەربارەی ئایەتەکە دەفەرموویٚ : (كَانُوا إِذَا دُعُوا إِلَى مَا أَنْزَلَ اللَّهُ وَإِلَى الرَّسُولِ لِيَحْكُمَ بـينَهُمْ، قَالُوا: بَلْ نَتَحَاكَمْ إِلَى الطَّاغُوتِ وَقَدْ أُمِرُوا أَنْ يَكْفُرُوا بِهِ، وَيُرِيدُ الشَّيْطَانُ أَنْ يُضِلَّهُمْ ضَلالا بَعِيداً)[218] واتە : (ئەو مونافیقانە) ئەگەر بۆلای حوکمی قورئان و سونەت بانگت بکردنایە دەیانوت : بەڵکو دەچین حوکم بۆلای تاغوتان دەبەینەوە ، لـەکاتیٚکدا خوای تعالی فەرمانی پیٚکردبوون کە کوفر بە تاغوت بکەن ، وە شەیتانیش دەیەویٚت گومڕاییەکی دوور گومڕایان بکات .

## شەریکدانان لە حوکمدا جیاوازی نیە لەگەڵ شەریکدانان لە جۆرەکانی تری عیبادەت

شیٚخ محمد بن إبراهیم ال شیخ دەفەرموویٚ (ولعلك ان تقول : لو قال من حكم القانون انا اعتقد انه باطل ، فهذا لا أثر له ، بل هو عزل للشرع ، كما لو قال أحد أنا اعبد الأوثان وأعتقد انها باطل)[219]. واتە : لـەوانەیە بلیٚێ ئەو کەسانەی حوکم

---

[217] سورة النساء / ٦١

[218] تفسير ابن ابـي حاتم / ر . ٦٩١٤

[219] مجموع الفتاوى الشيخ محمد ال شيخ :٦/١٨٩

به یاسادەستکردەکان دەکەن ، بلّێت من حوکمی پێدەکەم بەڵام پێم وایە پڕوپوچە، ئەوە سوودی بۆی نیە ، بەڵکو دەرچونە لەدین ، وەکو ئەوەی کەسێ: بلّێت من بت (پەیکەر) دەپەرستم بەڵام پێموایە پڕوپوچە.!.

**ئیمامی محمد الأمين الشنقيطي** رحمه الله فەرموویەتی (**الإشراك بالله في حكمه كالإشراك به في عبادته ، قال في حكمه ﴿ولا يشرك في حكمه أحدا﴾**[220] **وقال في الإشراك به في عبادته ﴿فمن كان يرجوا لقاء ربه فليعمل عملا صالحا ولا يشرك بعبادة ربه أحدا﴾ فالأمر سواء**)[221]. واتە: شەریکدانان بۆ خوای تعالى لە حوکمدا وەکو شەریکدانان وایە لە عیبادەتەکانیدا، خوای تعالى دەربارەی شیرکی حوکم فەرموویەتی ﴿خوای تعالى لە حوکمیدا کەسی نەکردۆتە شەریکی خۆی﴾ ، وە لە شیرکی عیبادەتدا فەرموویەتی : ﴿جا هەرکەسێك ڕەجائی ئەوەی هەیە کە بگات بە لیقای خوای تعالى و ببینێت ئەوا با کار و کردەوەی چاك بکات و لە عیبادەتەکانیدا شەریکی بۆ قەرار نەدات﴾ ، هەردوو شیرکەکە وەکو یەکوان.

**الإمام أحمد شاكر** رحمه الله فەرموویەتی (**إن الأمر في هذه القوانين الوضعية ، واضح وضوح الشمس ، هي كفر بواح لا خفاء فيه ولا مداورة ، ولا عذر لأحد فيمن ينتسب للإسلام كائناً من كان العمل بها**)[222]. واتە: حوکمی حوکم کردن بەو یاسا دەستکردانە ڕوونە وەکو ڕووناکی خۆر ، کە کوفرێکی ئاشکرایە و هیچ نهێنیەکی تێدانیە وە هیچ عوزرێکیش نیە بۆ هەرکەسێك کەکاری پێبکات و خۆیشی بداتە پاڵ ئیسلام ، جا کێیە بابێت.

**شێخ سليمان العلوان** دەفەرمووێ (**كذلك الذي يحكم بغير شرع الله ويبطل شرع الله ، ويضع موضع ذلك القوانين الوضعية ويحكم بآراء اليهود والنصارى**

---

[220] سورة الكهف / ٢٦

[221] أضواء البيان : ٤٨/٧

[222] عمدة التفسير : ١٧٤/٤

وبآراء العلمانيين ويرفض الحكم بشرع الله ﷻ ويبطش بمن طالبه بذلك ، فلا ينفعه حينئذٍ أن يقول: أنا اعتقد أن حكم الله ﷻ أحسن من حكم الطاغوت.

إذا كنت تعتقد أن حكم الله ﷻ أحسن من حكم الطاغوت لماذا تحكم بغير شرع الله ؟ كالذي يقول أنا اعتقد أن عبادة الأصنام باطلة ويعبد الأصنام ، لا فرق بين هذا وهذا .فالله ﷻ سمى هذا مشركاً وسمى هذا مشركاً ، فقال تعالى ﴿ولا يشرك في حكمه أحداً﴾[223] سماه الله ﷻ مشركاً ، ﴿ومن لم يحكم بما أنزل الله فأئلك هم الكافرون﴾[224] الكفر إذا عُرِّف بالألف واللام فلا يحتمل إلا الأكبر)[225]. واته : وه ئەوەی کە حوکم بە غەیری یاسای الله ﷻ دەکات و یاسای الله تعالى کە قورئانە لە وڵات هەڵدەوەشێنێتەوە ، وە لەشوێنی حوکمەکەی خوای تعالى حوکم بە یاسا دەستکردەکان و بیروبۆچوونی یەهو و نەصرانی و عیلمانیەکان دەکات و حوکمی خوای تعالى ڕەتدەکاتەوە و ئەوەیش داوای حوکمی خوابکات پەلاماری دەدات، ئەوا هیچ سوودی بۆی نابێت ئەگەر بیشلێت حوکمی خوا لەو حوکمە تاغوتیە باشترە .

ئەگەر تۆ پێتوایە حوکمی الله تعالى باشترە لە حوکمی تاغوت ئەی بۆچی حوکمی پێناکەیت، بەڵکو حوکم بە پێچەوانەکەی دەکەیت؟ (ئەمە) وەکو کەسێك وایە کە بڵێت بپ پەرستی خراپە کەچی خۆی بپ بپەرستێت، هیچ جیاوازی نیە لە نێوان ئەمە و ئەوە ، الله ﷻ هەردووەکی بە موشریك ناوبردووە ﴿ولا يشرك في حكمه أحدا﴾ خوای تعالى ناوینا مشريك ، ﴿ومن لم يحكم بما أنزل الله فأولئك هم الكافرون﴾ ، کوفر ئەوە بە (ال) معرفكرا ئەوا مەبەست پێی کوفری گەورەیە).

[223] (سورة الكهف / ٢٦)

[224] (سورة المائدة / ٤٤)

[225] شرح تجريد التوحيد المفيد / ٢٥٧

**گوتم** : خوای تعالی وایگێڕاوه كه به هیچ جۆرێك شەریكی بۆ قەرار نەدەین، وه هەموو پێغەمبــەرانی ناردووه تاكو خەڵكی ئاگادار بكەنەوه لـه شیرك قەرداردان، وه هەڕەشەی ترسناك لـەو كەسانه دەكات كه شەریكی بۆ قەرار دەدەن، جا ئەم شیركه هیچ جیاوازیەكی نیه كه كام جۆری شیركه ، ئایا شیركی دوعایه یان المحبة یان الطاعة یان هەرجۆرێكی تر لـه جۆرەكانی شیرك . خوای تعالی ڕێگەنادات كەسێك بڵێت كەسێكی تر لـەگەڵ الله ﷻ ئەم گەردوونەی دروست كردوه، ئەم كەسه موشریكه چونكه كەسێكی كرده شەریكی الله تعالی لـه خالقیێتیدا، وه هەركەسێك بڵێت غەیری الله ـیش ﷻ غەیب دەزانێت ئەوا شەریكی بۆ الله تعالی قەرارداوه و موشریكه ، هەركەسێك داوا لـه غەیری الله تعالی بكات ئەوا موشریكه و كافره ، چونكه كەسێكی كرده شەریكی الله تعالی لـه تایبەتمەندیەك كه تایبەته به الله ﷻ ، وه هەركەسێك كەسێكی تری خۆش بوێت كه بگاتەئاستی خۆشەویستی بۆ الله تعالی ئەوا موشریكه و كافره چونكه كەسێكی كرد به شەریكی الله تعالی لـه شتێكدا كه تایبەتمەندی الله تعالی ـه ، وه بۆ هەر یەكێك لـەمانه بەڵگەی لـەسەر هاتووه و غەیری ئەمانیش زۆرن لـه جۆرەكانی شیرك. بۆیـه حوكمیش هەروایه، ئەگەر تۆ كەسێكت كرده شەریكی الله تعالی و به یاسای غەیری خوای تعالی ڕازی بووی ئەوا موشریكیت وه موحید نیت ، چونــكه كەلێن كەوته تەوحیـــدەكەتەوه كه تەوحیدیحاكمیەتت لـه خۆتدا نەچەسپاند .

## تەوحید و جۆرەكانی

خوای تعالی تاك و تەنهایه وكەس شەریكی نیه ، وه لـه قورئاندا ئاماژەی بەم وەحدانیەتەی خۆی داوه، وه پێغەمبــەری خوا ﷺ بەهەمان شێوه بۆی ڕوونكردووینەتەوه، پاشان زانایان هاتوون به كۆكردنەوەی ئەم بەڵگانه تەوحیدیان دابەشكردووه بۆ چەند جۆرێك .

پێغەمبــەری خوا ﷺ زۆرترین جار بانگەوازی بۆ تەوحیدی ڕوبوبیـەت دەكرد لـه سەرەتای بانگەوازەكەی ، هەرچەنده زۆرێك لـه كافران بڕوایان به خوای تعالی

هەبوو بەڵام شەریكیان بۆ قەرار دەدا لە عیبادەتدا، بەڵام زۆرێكیان أصڵەن بڕوایان بە الله تعالى نەبوو.

ئایا دەزانیت هۆكاری دابەزینی سورەتی الإخلاص چیە ؟ سورەتی قل هو الله أحد ؟ ، كافران هاتن بۆلای پێغەمبەری ﷺ و داوایان لێكرد و وتیان (صف لنا ربك)[226] . واتە ئەی محمد بۆمان باس بكە خوایەكەی تۆ چۆنە ؟ جا خیلاف هەیە كە ئەم كافرانە كێ بوون ؟ ، ئیمامەكان قتادة و الضحاك و كەلە تابعینن دەفەرموون ئەوانە جوولەكەكان بوون[227].

بەڵام ئەمە بەهێز نیە چونكە جولەكە بڕوای بە خوای تعالى هەیە و دەیشی پەرستن ،بەڵام بڕوایان بە پێغەمبەری خوا محمد ﷺ نەبوو، بەڵام جابری كوڕی عبدالله و عكرمەی قوتابی ابن عباس دەفەرموون[228] : موشریكان هاتن بۆلای پێغەمبەری خوا ﷺ داوایان لێكرد كە خوایەكەی خۆی پێیان بناسێنێت وە ئیمامی أبو العالیة رفیع بن مهران كە ئەمیش لە تابعینە دەفەرمووێ : موشریكان هاتن بۆلای پێغەمبەری خوا ﷺ [229] . وە ئەم ڕەئیە بە هیزترە كە ووتەی هاوەڵ و بەشێكە لە تابعین كە ئەو كەسانەی هاتن بۆلای پێغەمبەری خوا ﷺ موشریكانی قوڕەیش بوون نەك جوولەكە ، چونكە هاوەڵان شارەزاترن بە قورئان وەك لە تابعین ، وە جوولەكەیش بڕوایان بە الله ﷻ هەیە و دەیناسن و خۆیان لەوە بە دیندارتر دەزانن وەك لەوەی بێن بپەسن الله كێیە، چونكە تەنانەت ئەوان خۆیان بە خواپەرست دەزانی .

**كەواتە**: ئەم موشریكانە أصڵەن خوای تعالى ناناسن كەواتە پێویستە سەرەتا خوای تعالى ــی پێناسێنرێت و تەوحیدی ڕبوبیەتیان بۆ ڕوون بكرێتەوە ، هەركات

---

[226] أسباب النزول للواحدي / ٣٠٩

[227] أسباب النزول للواحدي / ٣٠٩

[228] جامع البيان في تأويل القرآن لإمام الطبري : ٧٨٧/٢٤

[229] جامع البيان في تأويل القرآن لإمام الطبري : ٦٨٧/٢٤

بڕوایان بە ڕبووبــیەت هێنا ئەوکات باسی ئلوهیەت و أسماء و صفاتیان بۆ دەکرێت، کەواتە پێغەمبـــەری خوا ﷺ بانگەوازی ئەم کەسانەی بۆ ڕبوبــیەت دەکرد، چونکە ئەمانە کێشەیان لـە ڕبوبــیەتی الله تعالی هەبوو ، وە پاشان موشریکانی تر لـە قوڕەیش ئەوانەی کە بڕوایان بە خوا ﷻ هەبوو بەڵام لە عیبادەتدا شەریکیان بۆ قەراردەدا ، پێغەمبــەری خوا ﷺ بانگەوازی بۆ ئلوهیەت دەکرد ، چونکە ئەم کافرانە کێشەیان لـە بەتاکدانانی خوای تعالی هەبوو لـە ئلوهیەتدا و داوا و هانایان بۆ غەیری الله تعالی دەبرد .

وە سەردەمی سەلـەفیش چونکە زۆرترین شیرك لـە بابەتی أسماء و صفات ڕوویدەدا بۆیە دەبــینین سەلـەف زۆرترین جار باسی أسماء و صفاتیان دەکرد بەهۆی فیتنەی جەهمی و هاو وێنەکانیان لـەو سەردەمە ، چونکە ئەوان کێشەیان لـەم تەوحیدە هەبوو بۆیە سەلـەفیش زۆرتر باسی ئەم تەوحیدەیان دەکرد .

خۆ ئەگەر سەردەمێك هات و خەڵکی غەیری خوای تعالی ـیان خۆش ویست ئەوا ئێمەیش کە شوێنی خۆشەویستمان ﷺ و سەلـەف دەکەوین و تەوحیدی المحبة بۆ خەڵك ڕوون دەکەینەوە چونکە الله تعالی دەبــیت بە تاك ڕابگیرێت لـە خۆشەویستیدا ، خوای تعالی فەرموویەتی : ﴿ومن الناس من يتخذوا من دون الله أندادا يحبونهم كحب الله﴾[230] . واتە : هەن لـەناوخەڵکیدا کە کەسانێکیان کردۆتە شەریکی الله، کە کەسانێکیان وەکو خوای تعالی خۆش دەوێت .

**بۆیە حاکمیەتیش هەروایە** ، هەرکات حاکمیەتی خوای تعالی لـە بــیروبڕوای خەڵك نەما و خەڵك لـە حوکمدا شەریك بۆ الله تعالی قەراردا ئەوا ئێمە دێین و ئەو ئایەت و فەرموودانە کۆدەکەینەوە و ناویدەنێین تەوحیدی حاکمیەت، چونکە الله تعالی فەرموویەتی : ﴿إن الحكم إلا لله﴾[231] واتە : حوکم بۆ کەس نیە الله تعالی

[230] سورة البقرة / ١٦٥

[231] سورة يوسف / ٤٠

نەبـیت ، وە فەرموویەتی : ﴿ولا یشـرك في حكمـــه أحدا﴾[232] . واتە خوای تعالی لـە حوكمدا كەسینەكردووە بە شەریكی خۆی . وە سەروەرمان ﷺ فەرموویەتی : (إن الله هو الحكم و إلیه الحكم)[233] واتە الله تعالی خۆی حاكمە و حوكمیش هەربۆلای خۆی دەبرێتەوە . واتە : تەنها ئەو شـایەنی بردنەوەی حوكمە (سەنەدەكەی بە هێزە).

كەواتە خوای تعالی لـە حوكمدا شەریكی نیە ، كەواتە ئەمە تەوحیدە و كەس شەریكی نیە لـە حوكمدا ، وە هەركەسێك شەریك بۆ الله تعالی قەراربدات كافر و موشریكە وەك پێشتر بەڵگەكانمان باسكرد .

## پوختەی قسە لەم بارەوە

ئەمە حاڵەتی یەكەم بوو كە هەركەسێك حوكم بە قورئان نەكات بە شێوازێك كە دەستكاری یاسا بكات و بـیگۆڕێت و خۆی یاسا بنوسیت و تشریع بكات ئەوا كافرە وە تاغوتە وە هیچ یەكێك لـە ئەهلی سوونە لـەم بابەتەدا خیلافی نیە هەر لـە سەردەمی تەتارەوە كە یەكەمین گۆڕینی یاسای ئیسلامی ڕوویدا لـەو سەردەمە تاكو ئەمڕۆ زانایان یەكدەگن لـەسەر كافرێتی خاوەن و هاوكارانی .

---

[232] سورة الكهف / ٢٦

[233] أخرجه أبو داود في سنن / ٤٩٥٥ و البخاري في الأدب المفرد / ٨١١ و غةیرى ئةمانیش

## حاڵەتی دووەم : حاکم نابێت جحدی حوکمەکەی الله ﷻ بکات

واتە: نابـێت نکۆڵی لـە حوکمی دەست بڕینەوەکە یان هەر حوکمێکی تر بکات، ئەگینا کافر دەبـێت ئەگەر چی تووشی حاڵەتی یەکەمیش نەبوبـێت و دەستی بۆ یاسایش نەبردبـێت و تشریع و تبدیلیشی نەکردبـێت . چونکـە نکۆڵی کردن لـە هەربەشێك لـە دین کوفری و ڕیددەیە و خاوەنەکەی لـە بازنگەی ئیسلامەتی دەباتە دەرەوە مورتەد دەبـیـتەوە و خوێنی و ماڵی حەڵاڵ دەبـیت ، خۆ ئەگەر حاکم بـیت دەبـیتە کافرو تاغوت و واجبـە لـەسەر تەخت لابدرێت و لـە ملی بدرێت ، الله تعالی فەرموویـەتی : ﴿وَمَا يَجْحَدُ بِآيَاتِنَا إِلَّا الْكَافِرُونَ﴾[234]. واتە: هیچ کەسێك نیـە نکۆڵی لـەو شەرع و دینـە بکات کە دامانگرتووە ئیللا کافران نەبـیت .

جحود و نکۆڵی کاتێك دێتە جیٚ کەسێك حەق دەناسێت بەڵام نکۆڵی لێدەکات ، بۆیە وەیل و تیاچوون بۆ ئەوانەی نکۆڵی لـەوە دەکەن کە الله تعالی دایگرتووە ، سەرۆکێکی بەناو موسڵمان کە خۆی بە حاکمی موسلمان دەزانی نکۆڵی لـەوە دەکرد کە الله تعالی حوکمی دەستبڕینەوەی دانابـیت، ئەمە کافرە وتاغوتە و وەلی ئەمری موسڵمان نیە و گوێڕایەڵی واجب نیە ، بەڵکو واجب ئەوەیە دژی بوەستیتەوە .

وە هەروەها الله تعالی فـەرموویـەتی :﴿وَمَا يَجْحَدُ بِآيَاتِنَا إِلَّا الظَّالِمُونَ﴾[235] واتە: کەس نیــە نکۆڵی لـەوە بکات کە الله بۆی داناوین لـە دین و شەرعئیللا ستەمکاران نەبـیت ، واتە ئەو کەسانەی ستەمیان لـە نفس خۆیانکردووە و کوفریان ئەنجامداوە .

---

[234] سورة العنكبوت / ٤٧

[235] سورة العنكبوت / ٤٩

**الإمام عبدالله بن عباس** ﷺ فەرموویەتی زاڵم واتا موشریك[٢٣٦]. واتە هەرکەسێك نكۆڵی لە هەر حوکمێك یان یاسایەکی الله تعالی بکات موشریکە .

**الإمام أبو جعفر الطبري** رحمه الله فەرموویەتی: (**يعني: الذين ظلموا أنفسهم بكفرهم بالله عزّ وجلّ**)[٢٣٧]. واتە : ئەوانەی زوڵمیان لە نەفسی خۆیانکرد بە هۆی کوفری خۆیانەوە لە بەرامبەر الله تعالی.

ئایا محمد ﷺ حوکمی الله تعالی ـی بۆی نەهێناوین؟ ، بـێگومان بەڵێ،کەواتە نكۆڵی کردن لێی کافر بوونە.نکۆڵی کردن لە حوکمەکانی الله تعالی سێ جۆرە :

**یەکەم** : نکۆڵی کردن لە دین بە گشتی ، ئەمە خاوەنەکەی کافرە بە إجماعی سەلەف و خەلەف ، وە هەرکەسێکیش بە کافری نەزانێت وەکو ئەو کافرە .

**دووەم** : نکۆڵی کردن لە بەشێك لەدین یان نکۆڵی کردن لە حوکمێك نەك بە گشتی ، ئەمیش بەهەمان شێوە کافـرە و مافی بەئیسلامەوە نەماوە ، الله تعالی فەرموویـەتی : ﴿**أَفَتُؤْمِنُونَ بِبَعْضِ الْكِتَابِ وَتَكْفُرُونَ بِبَعْضٍ فَمَا جَزَاءُ مَنْ يَفْعَلُ ذَلِكَ مِنْكُمْ إِلَّا خِزْيٌ فِي الْحَيَاةِ الدُّنْيَا وَيَوْمَ الْقِيَامَةِ يُرَدُّونَ إِلَى أَشَدِّ الْعَذَابِ وَمَا اللَّهُ بِغَافِلٍ عَمَّا تَعْمَلُونَ**﴾[٢٣٨] . واتە بڕوا بە بەشێك بەوە دەهێنن کە الله ناردوویەتی و بڕوا بە هەندێکی ناهێنن ؟ ، پاداشتی ئەوانە نیە ئیللا ژیانێکی سەرشۆڕانەی دونیانەبێت و لە قیامەتیش ڕیپێچی بە ئێشترین سزا دەکرێن ، بزانن کە الله بـێئاگا نیە لـێتان کاتێك فەرمانەکانی الله دەشکێنن .

جا هەردوو حاڵەتەکیش کوفرە، خۆ ئەگەر کەسێك نكۆڵی لە هەموو دین بکات یان کەسێك کە نكۆڵی لە حوکمێك یان بابەتێك بکات لە دین کە بەڵگەی صەریحی لەسەر بـێت هەردووکی کوفرە و خاوەنەکەی پێ لە ئیسلام هەڵدەگەڕێتەوە (پەنابەخوا) .

---

[٢٣٦] زاد المسير في علم التفسير لإمام ابن الجوزي : ٣/ ٤١٠

[٢٣٧] جامع البـيان في تأويل القرآن: ٢٠/ ٥٢

[٢٣٨] سورة البقرة / ٨٥

**سێیەم** : هەرکەسێك نکۆڵی لە بابەتێك بکات کە بابەتێکی قورس یان خەفیە و بابەتێکی لاوەکییە لە شەرعدا. یان بابەتێکە کەمێك لە خەڵك لێی تێدەگەن وەکو بابەتی میرات یان هەندێك لە بابەتەکانی أسماء و صفات ، هەرکەسێك نکۆڵی لەمانە بکات بە هۆکاری جەهل یان تأویل ئەوا کافر نابێت وە پێویستە إقامە الحجە بکرێت و ئاگاداربکرێتەوە .

بەڵام بابەتەکانی تری دین کە ڕوون و ئاسانن وە خەڵکی بە عام دەزانن وەکو تەوحید یان پایەکانی ئیسلام یان حوکم یان هەرشتێکی تر ئەوا هەرکەسێك نکۆڵی لە بچوکترین بەشی بکات کافر و مورتەددە و بەشی بە ئیسلامەوە نەماوە.

**ئیمامی عبداللە بن مسعود** ﵁: ئیمامی أحمد لە مسند[239] وەئیمامی أبو جعفرالطبري بە سەنەدێکی بەهێز لە تەفسیرەکەیدا نقلی کردووە[240] لە ئیمامی عبداللە کوڕی مەسعود کە فەرموویەتی : (**من جحد بآیة جحد به کله**) واتە: هەرکەسێك نکۆڵی لە یەك ئایەت بکات ئەوا نکۆڵی بە هەمووی کردووە .

وە سەلەف و خەلەف جیاوازییان لەوەدا نەبووە لەوەی کە هەرکەسێك نکۆڵی لە هەربەشێکی دین بکات بەبێ هۆکار کافرە [241].

ئیمامی ابن ماجة لە سنن[242] و غەیری ئەویش : (**عن ابْنِ عَبَّاسٍ** ﵁ **قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ** ﷺ **مَنْ جَحَدَ آيَةً مِنَ الْقُرْآنِ فَقَدْ حَلَّ ضَرْبُ عُنُقِهِ**) . واتە : لە ئیمامی عبداللە کوڕی عەباسەوە ﵁ لە پێغەمبەری خواوە ﷺ کە فەرموویەتی: (هەرکەسێك نکۆڵی ئایەتێکی لە ورئان کرد ئەوا حەڵاڵە لە ملی بدرێت).هەرچەندە سەنەدەکەی بەهێز نیە .

---

[239] ٣٨٤٥

[240] ٢٨/١

[241] مراتب الإجماع لابن حزم ص: ١٧٤

[242] ٢٥٣٩

**الإمام ابن عباس** رضي الله عنه: ابن أبـي حاتم[243] و الطبري[244] لـه تەفسیرەکانیاندا نقلّیان کردووه: قال إبن أبي حاتم: (حدثنا أبـي، ثنا أبو صالح، حدثني معاوية بن صالح، عن علي بن أبـي طلحة، **عن ابن عباس** رضي الله عنه**، قوله : ﴿ومن لم يحكم بما أنزل الله﴾ يقول: من جحد شيئا من حدود الله فقد كفر ، ومن أمر بها ولم يحكم بها فهو ظالم فاسق)** .واته : أبو حاتم بۆی باسکردوون لـه أبو صالـحەوه لـه علی کوڕی ابـی تەڵحەوه لـه ابن عباسەوه کە دەربارەی ئايەتی (٤٤) لـه سورِتی (المائدة) فەرموويەتی : هەرکەسێك نکۆڵی شتێك بکات لـه حوکمەکانی الله ئەوا کافر بووه، بەڵام هەرکەسێك فەرمان بە جێبەجێ کردنی حوکمەکە بکات بەڵام خۆی کاری پێنەکات ئەوا زاڵـم و فاسقە.

**سەنەدەکەی لاوازە** ، إنقطاع هەيە لـه نێوان ابن عباس و علی ، وەأبو صالح و علی کەسێکی بەهێز نین ، وه مخالفی لـەخۆی بەهێزتری کردووه کە دواتر بە تفصيل لـەسەری دەوستين، بەڵام بەشی يەکەم لـه مەتنی ئەسەرکە تەواوە کە: هەرکەسێك نکۆڵی لـه ئايەتێك يان حەددێك بکات کافر بووه.

**ئيمامی قاضي عياض** رحمه الله إجماع نقڵدەکات لـەسەر کافريەتی هەرکەسێك کە نکۆڵی يەك حەرفيش بکات لـه قورئان.[245]

**گوتم** : بزانه الله تعالى هيدايەتی من و تۆيش بدات ، ئەم حاکمەی کە باسمانکرد کە دەستی کابرای خزمی خۆی نەبڕيوه کافر نەبوو چونکە ياسای خوای تعالى ــ لانەدابوو لـه وڵات بەڵام بە هۆی هەواوئارەزووەوە حوکمی بە قورئان نەکرد لـەم بابەتە ، بەڵام کافريش نابـيت چونکە نکۆڵی لـه حوکمی دەستبڕينەوە نەکرد .ئەمەندە بەس نيـە ، بەڵکو چەند خاڵێکی تريش هەن کە دەبـيت ئەم حاکمە خۆی‌لێبپارێزێت ، ئەگينا کافر دەبـيت.

---

[243] المائدة / ٤٤

[244] سەرچاوەی سەرەوە

[245] جزء فيه ذكر اعتقاد السلف في الحروف والأصوات لإمام النووي /٧٢

## سێهەم حاڵەت : إستحلال

یەکێکی تر لەو حاڵەتانە کە پێویستە حاکم خۆی لێ بپارێزێت تاکو تووشی کوفری گەورە نەبێت ئەوەیە کە ئەم حاکمە نابێت إستحلالی کارەکەی خۆی بکات ، واتە نابێت کارە چەپەڵەکەی خۆی بە حەڵاڵ بزانێت و خۆی بە تاوان بار نەزانێت ، إستحلالی تحاکم بۆلای غەیری قورئانیش دوو جۆرە :

**یەکەم** : یان ئەوەتا لە بابەتێکدا حوکم بە قورئان ناکات ، بەڵام ئەو کارەی خۆی بە حەڵاڵ دەزانێت .

**دووەم** : ئەمەیان حاڵی هەموو دەسەڵاتدارانی سەردەمە کە حوکم کردن بە غەیری قورئان بە گشتی بە حەڵاڵ دەزانن و خۆیان بە تاوانبار نازانن لە کاتێکدا کە تشریعیان کردووە و لە جیاتی الله تعالی یاسا دەنوسنەوە ، بەڵکو شانازی پێوە دەکەن وە ئەوە بە حوکمی پێشکەوتن و گەیشتن بە مافەکان ناو دەبەن ، ئەصڵەن لەلای گرنگ نیە خوا ﷻ پێی خۆشە یان نا ، بەڵکو ئەوە لەلای ئەو گرنگە کە نەتەوە یەگرتووە کافرەکان لێی ڕازی بن و سبەی ڕخنە لە چۆنیەتی حوکمەکەی نەگرن . ئەمە حاڵی تاغوتانی سەردەمە ، نەك جارێك بەڵکو هەمیشە پشتیان لە حوکم و بڕیارەکانی الله کردووە بەڵام وەکو ئەوە وان کە هیچیان نەکردبێت ، بەڵکو شانازی بە حوکمەکانی خۆیا دەکەن و بە پێشکەوتن و مافی مرۆڤی دەزانن، وە پێیان وایە ئەم حوکمەی خۆیان باشترە بۆ ئەم سەردەمە ، ئەمە کوفرە و خاوەنەکەی پێی کافر دەبێت .

هەرکاتێك حاکم حوکمێکی الله ی ﷻ شکاند و کارەکەی خۆی بە باش زانی و خۆی بە موجریم نەزانی وکارەکەی بە حەڕام نەزانی ئەوا کافرە و تاغوتە ، الله تعالی حوکمی کوفری داوە بەسەر ئەم کافرە پیسەدا و فەرمانی بە کوشتاریان داوە هەروەکو فەرموویەتی : ﴿**قاتلوا الذين لا يؤمنون بالله ولا باليوم الآخر ولا يحرمون**

**ما حرم الله ورسوله**﴾[٢٤٦] . واتە كوشتاری ئەوانە بكەن كە ئیمان بە الله ﷻ و بە ڕۆژی دوای ناهێنن ، وە ئەوانەیش كە ئەوە حەرام ناكەن كە الله ﷻ و پێغەمبـەرەكەی ﷺ حەرامیان كردووە .

گوتم : ببیـــنە الله تعالى هیدایەتی من و تۆیش بدات : الله تعالى فەرمانی بە كوشتنی ئەوانە داوە كە حەرامەكانی الله تعالى بە حەرام نازانن و حەڵاڵی دەكەن و هیچ حسێبـیك بۆ بڕیاڕی الله ﷻ ناكەن ، وە الله تعالى باسی ئەم صنفـە پیسەی لـەگەڵ ئەو كەسانە كرد كە بڕوایان بە الله ﷻ نیــە ، بۆیــە هەركەسێك حوكم بە قورئان نەكرد ئەگەر بۆ جارێكیش بـیت ، ئەگەر ئەو كارەی خۆی بە حەرام نەزانی ئەوا كافرە وە الله تعالى فەرمانی كوشتنی داوە .

وە هەروەها حوكمی شیركی داوە بەسەر كەسێكدا كە گوێڕایەڵی تاغوتان بكات لـە حەرامكردنی حەڵاڵ و حەڵاڵكردنی حەرام ، تەنانەت ئەم حوكمی خاوەنی تاوانی گەورەیش دەگرێتەوە ئەگەر حەڵاڵی بكات .

واتە: هەركەسێك تاوانێك بكات و ئەو تاوانەی خۆی بە حەرام و تاوان نەزانی ئەوا شیركە چونكە ئەو حەرامەی حەڵاڵ كرد بۆ خۆی. بۆیە الله ﷻ فەرموویـەتی: ﴿**وَلَا تَأْكُلُوا مِمَّا لَمْ يُذْكَرِ اسْمُ اللَّهِ عَلَيْهِ وَإِنَّهُ لَفِسْقٌ وَإِنَّ الشَّيَاطِينَ لَيُوحُونَ إِلَى أَوْلِيَائِهِمْ لِيُجَادِلُوكُمْ وَإِنْ أَطَعْتُمُوهُمْ إِنَّكُمْ لَمُشْرِكُونَ**﴾[٢٤٧] . واتە ئەی موسڵمانان ئەو حەیوانانە مەخۆن كە ناوی خوای تعالى ـی لـەسەر نەهێنراوە ، چونكە ئەوە تاوانێكی گەورەیە ، وە شەیتانەكان هەواڵ دەنێرن بۆ ئەولیا و خزمەتكارانی خۆیان لـە بەنی ئادەم بۆ ئەوەی بـیت و موناقەشەتان لـەگەڵ بكەن لـەسەر خواردنی گۆشتی گیانداری مردارەوە بوو ، بزانن خۆ ئەگەر هاتوو گوێڕایەڵی ئەونتان كرد ئەوا ئێوە لـە كەسانی موشریكن !.

---

[٢٤٦] سورة التوبة / ٢٩

[٢٤٧] سورة الأنعام / ١٢١

ئەم ئایەتە سبب نزولی هەیە ، جوولەکەکان هاتن بۆلای پێغەمبــەری خوا ﷺ و پێیان وت ئایا ئەوە دەخۆی کە خۆت دەیکوژیت کەچی ئەوە ناخۆی کە الله ﷻ کوشتویەتی ــ واتا مردارەوە بوو ــ ؟

بۆیە ئەم ئایەتە هاتە خوارەوە کە چەند سوودێکی لێوەفێر دەبـین :

١–هەر گیاندارێك مردارەوە بوو گۆشتی ناخورێت مەگەر کاتی زەرورەت .

٢– هەر گیاندارێك ناوی الله ﷻ ـی لەسەر نەهێنرا لەکاتی سەربڕیندا گۆشتی ناخورێت .

٣– هەرکەسێك خواردی تاوانی گەورەی کردووە .

٤– ئەو کەسانەی کە گومان لە نێو موسڵمانان بڵاو دەکەنەوە و دەیانەوێ دینی الله ﷻ ناشرین بکەن ئا ئەوانە دۆست و هاوکاری شەیتانن وە شەیتان ڕایاندەسپێرێت بۆ بڵاوکردنەوەی مونکەرات .

٥– گوێڕایەڵی ئەم دۆستانەی شەیتان و تاغوتان شیرکە و خاوەنەکەی پێی دەبـیت بە موشریك ، ئەمیش چەند حاڵە تێکی هەیە :

**یەکەم** :ئەگەر گوێڕایەڵی کافر و تاغوتانی کرد لە تاوانێك کە تاوانی بچوك یان گەورە بـیت ئەوا کەسێکی فاسیقە بەڵام تەکفیر ناکرێت ، بەڵان بە تەفصیلەوە :

أ–ئەگەر ئەو تاوانەی بە حەڕام زانی و إستحلالی نەکرد بەڵام هەواو ئارەزوو تاوانەکەی پێی کرد ئەوا کافر نیـە.

ب– بەڵام حاڵەتی دووەم کە ئێمە مەبەستمانە بریتیە لە إستحلالی تاوانەکە . واتە هەرکەسێك گوێڕایەڵی کافران بکات لە تاوانێك وە تاوانەکەیش بە حەڕام نەزانێت واتا إستحلالی حەڕامەکە بکات ئەوا کافر دەبـیت ، ئەمیش سێ حاڵەتی دیکەی لێدەبـیتەوە :

١–ئەگەر ئەو تاوانە تاوانێك بوو کە خیلافی لەسەر بوو کە ئایا حەڕامە یان نا ، ئەگەر وتی حەڵاڵە ئەوا کافر نابـیت ئەمیش بە دوو مەرجی تر :

أ–كه دەبـيت تأويلێكی هەبـيــت كه بلێت ئەمە حەڕام نيە ، بۆ نموونە مەسەلـەی مۆسيقا ، مۆسيقا حەڕامە وە بەڵگەی صەريح هەيە لـەو بارەوە ، بەڵام دەبـينين خيلافيش لـە بابەتەكە دروست بووە بە هۆی تأويلـەوە . ئەمە كافر نابـيت.

ب– يان ئەگەر بە هۆی جەهلـەوە وتی فلان كار حەرام نيـە ئەوا ئەويش كافر نابـيت ديسان لـە بابەتی خەفی مەبەستمانە .

٢– ئەگەر تاوانێك بوو كە هە موو ئومەت لـەسەر كۆك بوو كە حەرامە وە هيچ جێگای قسە و ڕەئی تێدا نابـيتەوە ، ئەگەر هەركەسێك حەرامێكی لـەوانە حەڵاڵكرد ئەوا كافر دەبـيتەوە بە يەكدەنگی هەموو ئەهلی سوونە ، بۆ نموونە : زينا يان خواردنەوەی عارەق يان غەيری ئەوانە .

**دووەم** : ئەگەر گوێڕایەڵی تاغوتانی كرد لـە كوفر و ئيلحاد و شەڕكردن لـە پێناو تاغوت و ڕێگا و دەسەڵاتی تاغوت ئەوا خاوەنەكەی كافر دەبـيت ئەگەر چی إستحلالـيشی نەكات .

**سێيەم** : خاڵی سێيەم ترسناكترين باوترينی جۆری ئەم كوفرەيە پەنابەخوا ، ئەويش ئەوەيە كە كەسێك حەرامێك حەڵاڵ دەكات كە هيچ گرنگی بە بڕيارەكانی خوا نادات و حسێبی بۆ ناكات ، وە بە ناوەی خوای تعالی ـەوە كارەكە ناكات ، بەڵكو خۆی دەكات بە موشەريع و ياسا نووس كە بە كەيفی خۆی حەڵاڵ و حەرام دەكات .

بۆنموونە حاكمێك دەستوری الله تعالی لابدات و حوكمەكانی الله ﷻ پەك بخات ، وە خۆی بـيت بە كەيفی خۆی حەڵاڵ و حەرام بكات و بە كەيفی خۆی بڕياربدات ئەوا حەڵاڵەكـانی الله ﷻ ی حەرام كردووە و حەڵاڵە كانی الله ـی حەرام كردووە و دەبـيت بە تاغوت و لـە بازنگەی ئيسلامەتی دە چێتە دەرەوە .

بۆنموونە : حەڵاڵكردنی عارەق و ڕيبا و ڕێگەدان بە زينا و تەنانەت وەكو ئەمرۆ ڕێگەدان بە لـيوات و هاوڕەگەزبازی (پەنابەخوا) ، لـە كاتێكد الله ﷻ ئەمانەی

حەڕامکردووە، وە ئەم حاکمەیش باش ئەوە دەزانێت کە الله ئەو کارانەی حەڕام کردووە لـە یاساکەی خۆیدا ، بەڵام هیچ گرنگیـــەك بەو بڕیارەی الله ﷻ نادات ، ئەمەکافرە وە هەرکەسێکیش بە کافری نەزانێت ئەوا کوفری بە تاغوت نەکردووە و بڕوای نیــە.

گوتم : الله تعالى لـە قورئانەکەیدا وە خۆشەویستمان لـە سوننەتی پاکیدا حاڵیئەم کەسانەیان بۆ ڕون کردوینەتەوە ، الله تعالى فەرمانی کوشتنیانی داوە هەروەکو فەرموویەتی ﴿**قاتلوا الذين لا يؤمنون بالله ، ولا باليوم الآخر ولا يحرمون ما حرم الله ورسوله**﴾[248] . واتە کوشتاری ئەوانە بکەن کە ئیمان بە الله ﷻ و بە ڕۆژی دوای ناهێنن، وە ئەوانەیش کە ئەوە حەڕام ناکەن کە الله ﷻ و پێغەمبــەرەکەی ﷺ حەڕامیان کردووە .

وە حوکمی موشریکی داوە تەنانەت بەسەر ئەو کەسانەیشدا کە شوێنیان دەکەون، ئەی دەبـیت حوکمی خۆیان چیبـیت؟ ، الله ﷻ فەرموویــەتی ﴿**وَإِنْ أَطَعْتُمُوهُمْ إِنَّكُمْ لَمُشْرِكُونَ**﴾[249]. واتە: خۆ ئەگەر هاتوو گوێڕایـەڵی ئەولیای شەیتان و تاغوتان بکەن لـە حەڵاڵکردنی حەڕام و حەڕامکردنی حەڵاڵ ، ئەوا ئێوە لـە موشریکان .!

وە الله ﷻ بە پەرستراوی غەیری خۆی ناوی بردوون وە ئەوکەسانەیش کە شوێنیان دەکەون بە موشریك ناوی بردوون هەروەکو فەرموویــەتی ﴿**اتَّخَذُوا أَحْبَارَهُمْ وَرُهْبَانَهُمْ أَرْبَابًا مِنْ دُونِ اللَّهِ وَالْمَسِيحَ ابْنَ مَرْيَمَ وَمَا أُمِرُوا إِلَّا لِيَعْبُدُوا إِلَهًا وَاحِدًا لَا إِلَهَ إِلَّا هُوَ سُبْحَانَهُ عَمَّا يُشْرِكُونَ**﴾[250]. واتە: جوولـەکە و نەصرانییــەکان حاکم و پیاوچاکانیان دەکرد بە خوا بەسەر خۆیانەوە!!، ئایا سوجدەیان بۆ دەبردن

---

[248] سورة التوبة / ٢٩

[249] سورة الأنعام / ١٢١

[250] سورة التوبة / ٣١

نەخێر !. ، ئایا نوێژیان بۆ دەکردن و تەوافیان بەدەوردا دەکرد ؟؟ نەخێر !.ئایا دەیانوت ئەمانە ئێمەیان دروست کردووە ؟ دیسان نەخێر !

بەڵکو ئەم بەناو پیاوچاك و حاکمانە بە کەیفی خۆیان حەڵاڵ و حەرامیان بۆ خەڵك دەکرد ، یاسایان بۆ خەڵك دادەنا .هەروەکە هاتووە بەسەنەدی باش ئەگەر حوکم لەسەر هەموو تورقەکانەوە بدرێت .

بە مەرفوعی هاتووە لە پێغەمبەری خوا ﷺ عەدی کوڕی حاتم کە صەحابی بوو دەفەرمووێ : (**أَتَيْتُ النَّبِيَّ ﷺ وَفِي عُنُقِي صَلِيبٌ مِنْ ذَهَبٍ. فَقَالَ: «يَا عَدِيُّ اطْرَحْ عَنْكَ هَذَا الوَثَنَ» ، وَسَمِعْتُهُ يَقْرَأُ فِي سُورَةِ بَرَاءَةٌ: ﴿اتَّخَذُوا أَحْبَارَهُمْ وَرُهْبَانَهُمْ أَرْبَابًا مِنْ دُونِ اللَّهِ﴾ ، قَالَ: «أَمَا إِنَّهُمْ لَمْ يَكُونُوا يَعْبُدُونَهُمْ، وَلَكِنَّهُمْ كَانُوا إِذَا أَحَلُّوا لَهُمْ شَيْئًا اسْتَحَلُّوهُ، وَإِذَا حَرَّمُوا عَلَيْهِمْ شَيْئًا حَرَّمُوهُ»**)[٢٥١] . واتە:هاتم بۆلای پێغەمبەری خوا ﷺ ، لەو کاتەدا صەلیبێکی ئاڵتونم لە ملدا بوو، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی ئەی عەدی ئەو پەرستراوەی ملت فڕێ بدە، گوێم لێبوو ئەو ئەو ئایەتەی سورەتی (التوبة) ـی دەخوێندەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی بەڕاستی ئەوان ئەو حاکمانەیان ناپەرست (بەو پەرستنەی ئێوە لێی تێگەیشتون) ، بەڵام ئەوان وابوون ئەگەر حاکم و قەشەکانیان ئەگەر شتێکیان بۆ حەڵاڵ بکردایە ئەمانیش حەڵاڵیان دەکرد ، وە ئەگەر شتێکیان لەسەر حەرام بکرایە ئەمانیش حەرامیان دەکرد . (سەنەدەی حەسەنە (باشە) هەروەکو پێشتر ڕونمانکردەوە).

وە بە ڕیوایەتی تر هاتووە کە عەدی ﵁ فەرموویەتی : ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئێمە قەشە و حاکمەکانمان ناپەرست، پێغمبەری خوا ﷺ فەرمووی ئایا حەڵاڵەکانی خوایان بۆ حەرام ناکردن ؟ ، ئایا حەرامەکانی خوایان بۆ حەڵاڵ

---

[٢٥١] سنن الترمذي /٣٠٩٥ و معجم الكبير للطبراني / ٢١٨ و ابن ابي حاتم في تفسيره / سورة التوبة /الآية ٣١

ناكردن؟ عەدی ﷛ فەرمووی بەڵێ، پێغەمبــەری خوا ﷺ فەرمووی ئائەوە عیبادەتەکەیانە بۆیان .

**الإمام حذيفه اليمان** ﷛ دەفەرمووێ : هەروەکو ئیمامی عبدالـرزاق نقلّی دەکات: (عَنِ الثَّوْرِيِّ ، عَنْ حَبِيبِ بْنِ أَبِي ثَابِتٍ ، عَنْ أَبِي الْبَخْتَرِيِّ ، قَالَ: سَأَلَ رَجُلٌ حُذَيْفَةَ ، فَقَالَ: يَا أَبَا عَبْدِ اللَّهِ أَرَأَيْتَ قَوْلَهُ تَعَالَى: {**اتَّخَذُوا أَحْبَارَهُمْ ، وَرُهْبَانَهُمْ أَرْبَابًا مِنْ دُونِ اللَّهِ**} أَكَانُوا يَعْبُدُونَهُمْ؟ ، قَالَ: «لَا وَلَكِنَّهُمْ كَانُوا إِذَا أَحَلُّوا لَهُمْ شَيْئًا اسْتَحَلُّوهُ ، وَإِذَا حَرَّمُوا عَلَيْهِمْ شَيْئًا حَرَّمُوهُ»)[٢٥٢].

واتە : ئیمامی عبدالـرزاق دەیگێڕێتەوە بەسەنەدێك لـە أبـی البخترییەوە کە فەرموویەتی : پیاوێك پرسیاری لـە هاوەڵی خۆشەویست حذیفة کرد ئایا ئەو ئایەتەت بـینیوە ﴿نەصرانی و جولـەکوکان حاکم و زانایانی خۆیان دەکرد بە خوا﴾ ، ئایا نەصرانی و جولـەکەکان عیبادەتیان بۆ حاکم و قەشەکان دەکرد (وەکو نوێژ و ڕۆژوو؟؟) ، حذیفة فەرمووی : نەخێر بەڵکو ئەگەر شتێکیان بۆ حەڵاڵ بکردایــە ئەوانیش حەڵاڵیان دەرکرد ، وە ئەگەر شتێکیان لـەسەر حەرام بکرایــە (لـەلایەن حاکم و قەشەکانەوە) ئەوا ئەمانیش حەرامیان دەرکرد . (سەنەدەکەی بەهێزە و صحیحە).

واتا گرنگیان نادا بە حەڵاڵ و حەرامەکانی الله تعالی ، بەڵکو ئەوان گوێڕایەڵی قەشە و حاکمان بوون .وە هاتووە بە سەنەدی تر کە حذیفة پرسیاری لـە أبو البختری کردووە دەربارەی ئایەتەکە وە هەرخۆیشی بۆی ڕوون کردۆتەوە .

## پوختەی قســە لەم بارەوە

هەر حاکمێك حوکم بە غەیری قورئان بکات لـەکەم بـیت یان زۆر جا تەشریع

---

[٢٥٢] تفسير القرآن لإمام عبدالرزاق الصنعاني/ر. ١٠٧٣ و تفسير ابن ابي حاتم : سورة الوبة / ٣١ تفسير من السنن سعيد بن منصور / ر.١٠١٢ و شعب الإيمان / ٨٩٤٨.

بکات یان نا ، ئەگەر کارەکەی خۆی بە حەڵاڵ زانی و خۆی بە تاوانبار نەزانی ئەوا تاغوتە و لـە پیسترینی کافرانە وە خوای تعالى فەرمانی کوشتاری کردووە نەك خزمەتکرد و گوێڕایەڵی بۆ کردنی وەکو ئەمڕۆ کەسانێك بەناوی دینەوە دەیڵێن ، بەڵگەیش لـەم بارەوە باسکرا بە فەزڵی الله تعالى .

## حاڵەتی چوارەم : بەباشتر زانینی حوكمی جاهیلی

هەرحاكمێك حوكم بە غەیری قورئان بكات، لەگەڵ ئەوەیشدا ئەگەر كارەكەی خۆی بە باشتر زانی یان پێی وابوو كارەكەی خۆی باشتر نیە لە حوكمی الله تعالی بەڵام وەكو یەك ناویان دەبات و دەڵێت حوكمەكەی من وەكو حوكمەكەی خوا ﷻ باشە ئەوا ئەمیش دیسان كوفرێكی ترە و خاوەنەكەی پێی كافر دەبێت ئەگەر چی دەستكاری یاسا و تەشریعیشی نەكردبێ و إستحلال و جحدیشی نەكردبێت، چونكە هەریەكێك لەمانە كوفرێكی سەربەخۆیە بۆ خۆی، جا هەر حاكمێك حوكم بە غەیری قورئان بكات و حوكمەكەی خۆی وەكو حوكمەكەی الله تعالی بە باش بزانێت ئەوا كافرە ، چونكە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی : (**فإن خير الحديث كتاب الله، وخير الهدي هدي محمد**)[٢٥٣]. واتە : (بەڕاستی باشترین وتە كتابەكەی الله تعالی یە ، وە باشترین شەرع و بەرنامە بەرنامەكەی محمدە ﷺ) . پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرمووێ باشترین بەرنامە ئیسلامە كەچی ئەم تاغوتە بەرنامەكەی خۆی بە باشترین دەزانێت كە ئەمە كوفری تكذیبە و خاوەنەكەی پێی كافر دەبێت. خوای تعالی دەفەرمووێ : ﴿**ومن أحسن حكما من الله لقوم يوقنون**﴾ واتە : باشە حوكمی كێ باشترە بۆ كەسێك كە گومانی لە دین و شەرع نەبێت ؟ وە هەروەها فەرموویەتی : ﴿**أليس الله بأحكم الحاكمين**﴾ واتە ئایا خوای تعالی باشارینی حاكمەكان نیە ؟؟ ، بۆیە خوای تعالی حوكمی كوفری داوە بەسەر هەركەسێكدا كە غەیری الله ﷻ بە الله ﷻ و دینەكەی یەكسان بكاتەوە، خوای تعالی دەفەرمووێ ﴿**والذين كفروا بربهم يعدلون**﴾[٢٥٤]. واتە : ئائەوانەی كافربوون كەسێك یان شتێكیان كردە هاوتای الله تعالی یان هاوتای شەرعی الله تعالی، بۆیە زانایان بەهەمان شێوە تەكفیری هەركەسێكیان

---

[٢٥٣] صحيح مسلم شرح النووي : ١٥٣/٦

[٢٥٤] سورة الأنعام / ١

کردووە کە حوکم بە قورئان ناکات و لەگەڵ ئەوەیشدا حوکمەکەی خۆی بە باشتر دەزانێت.

**الإمام محمد بن عبدالوهاب** رحمه الله لە ڕیسالە بەناوبانگەکەی خۆی نواقض الإسلام خاڵی چوارەم دەفەرمووێ : (**من اعتقد أن غير هدي النبي ﷺ أكمل من هديه ، أو أن حكم غيره أحسن من حكمه ، كالذي يفضل حكم الطواغيت على حكمه فهو كافر**) . واتە : هەرکەسێك پێی وابێت کە بەرنامە و شەرعی غەیری پێغەمبەری خوا ﷺ تەواوتر و بێ کەموکوڕیتر لە بەرنامەی پێغەمبەری خوا ﷺ یان حوکم غەیری ئەو باشترە ، وەکو ئەوەی پێی وابێت حوکمی تاغوتان باشترە و هەڵیبژێرێت بەسەر حوکمی پیغەمبەری خوادا ﷺ ئائەوە کافرە.

وە زانایان زیاتریان وتووە بەڵام چونکە ئەمڕۆ لەم بابەتە خیلاف کەمترە بۆیە ئەوەندە بەسە لەسەری بڕۆین .

**ئاگاداربن** : ئەم حاڵەتە تووشی تاغوتانی سەردەم و بەڵکو زۆرێك لەو مورتەددە بەونائیسلامیانەیش بووە کە دەڵێن: ڕاستە حوکمی خوا باشترە، بەڵام بۆ ئەم سەردەمە بەشێك لە حوکمەکانی ناگونجێت و حوکمەکانی سەردەم باشترە بۆ ئەم سەردەمە و غەیری ئەم قسانەیش کە ڕۆژانە دەیبیستین، ئەمە کوفر و ڕیددەیە و خاوەنەکەی پێی کافر دەبێت و مافی بە ئیسلامەوە نابێت و حوکمی مورتەدد بەسەریدا دەچەسپێت .

## پوختەی قسە لەم بوارەوە

هەرکەسێك حوکم بە قورئان نەکات لە بابەتێکدا، ئەگەرچی دەستکاری یاسای ئیسلامیشی نەکردبێت و تشریعی نەکردبێت و إستحلال و جحدیشی نەبێت، بەڵام ئەگەر هاتوو کارەکەی خۆی بە باشترزانی لە حوکمەکەی الله تعالى یان وەکو سەیریانی کرد ئەوا خاوەنەکەی کافر دەبێت وە حوکمی کافر و تاغوت

بەسەریدا دەچەسپێت، نەك گوێڕایەڵی کردنی واجب نیە بەڵکو واجبــە دژایەتی بکرێت .

## إجماع (یەکدەنگی) موسڵمانان لەسەر کافربوونی حاکم بەغەیری قورئان

سەرچاوە و مەصدەری دینەکەمان قورئان و فەرموودەیە، پاشان إجماعە پاشان قیاسی صحیح، پێشتر باسی بەڵگەکانمان کرد لە قورئان و سونەت لەسەرکافربوونی حاکم بغیر ما أنزل الله ، جا لەپێش ئەوەی بێمە سەر وتەی زانایان پێم باشبوو باسی إجماعەکان بکەین کەلەم بارەوە چەسپاوە :

**إجماعی یەکەم**: ئیمام و سەلەفی ئوممەت أسحاقی کوڕی راهویە رحمه الله دەفەرمووێ : (**أجمع المسلمون على أن من سب الله أو سب رسوله ﷺ أو دفع شيئاً مما أنزل الله ﷻ أو قتل نبـياً من أنبـياء الله ﷻ أنه كافر بذلك وإن كان مقراً بكل ما أنزل الله**)[255]. واتە : موسڵمانان یەکدەنگن لەسەر ئەوەی کە هەرکەسێك جوێن بە الله یان بە پێغەمبەرەکەی ﷺ بدات ، یان شتێك لەوە ڕەت بکاتەوە کە الله ﷻ ناردوویەتیە خوارەوە یان پێغەمبەرێك بکوژێت، ئەوا کافر و کافربۆتەوە بەهۆی ئەوکارەوە ئەگەر چی دان بە هەموو دینەکەی الله ـیش بنێت.[256]

---

[255] الصارم المسلول : ٢/١٥

[256] ئەوەی شاهدە لەم وتەیە ئەوەیە کە فەرمووی (یان شتێك ڕەتکاتەوە لەوەی کە الله ناردوویەتی ... ئەوا کافرە) ، ئەگەر حاکمێك تەنها یەك شت لە دینەکەی الله ڕەتکاتەوە جا بەهەر هۆکارێك بێت ، بڕوای پێنەبێت یان بە خراپی بزانێت یان بەکۆن و بەسەرچووی بزانێت و بڵێت بۆ ئەم سەردەمە ناگونجێت ، هەموو ئەمانە دەچنە ژێر باری ئەم هەڕەشەیەوە ، جا بەداخەوە حاکمانی ئەمڕۆ نەك شتێك بەڵکو چەندەها بەشی دین ڕەت دەکەوە و بەکۆنەپەرستی و وەحشیگەریش ناوی دەهێنن (پەنابەالله) وەکو بڕینەوەی دەستی دز یان ڕەجمی زانی محصن ، تەنانەت باسی ڕەجمیان لەلا بکەیت بە وەحشیگەر ناوت دەهێنن ، حوکمەکان و حەددەکانی دز و زانی محصن و غیر محصن و قصاص یان حەددی مورتەد و غەیری ئەمانیش بە دواکەوتووی دەزانن و ڕەتی دەکەوە، بەڵکو لەجێی ئەوە بۆ ئەوەی کافرانیان لێ ڕازی بێت ئازادی تەواو بەکوفر و کافر و مولحید و زەردەشتی .. دەدەن تاکو بانگەواز بۆ دینیان بکەن و کوفر بڵاوبکەنەوە ، کۆمەڵەی سەربەخۆ بۆ ئەتایست و موڵحیدان دروست دەکەن ، ئازادی بە داوێن پیسان دەدەن ، بەڵکو ڕیکخراو بۆ هاوڕەگەزبازان دروست دەکەن، ئەمەیە ڕەتکردنەوەی یاسای الله، لەوەیش ترسناکتر هەموو پەیوەندیەکانی ئیسلام بە دەوڵەتدارییەوە ڕەتدەکەنەوە ، بەڵکو دەڵێن ئیسلام تەنها و تەنها پەیوەندی نێوان خوێت و خوایە و بەس ، واتە هەموو ئەو ئایەت و فەرموودانەی هاتوون بۆ دەوڵەتداری هەمووی بەسەرچووە ، پەنابەالله ، ڕاستە

**إجماعی دووەم**: ئیمامی ابن حزم رحمه الله دەفەرمووێ (**لا خلاف بـين اثنين من المسلمين.... وأن من حكم بحكم الإنجيل مما لم يأتِ بالنص عليه وحي في شريعة الإسلام فإنه كافر مشرك خارج عن الإسلام**)[٢٥٧]. واتە : خیلاف لـە نێوان دوو موسڵماندا نیە .. هەرکەسێك حوكم بكات بە حوكمێكی ئینجیل، كە ئەو حوكمە لـە شەریعەتی ئیسلامیدا نەبـێت، ئائەوە كافر و موشریكە و مافی بە ئیسلامەوە نەماوە .[٢٥٨]

**وە هەر ئیمامی ابن حزم** رحمه الله إجماع نقلّ دەكات و دەفەرمووێ (**لما كان اليهود والنصارى يحرمون ما حرم أحبارهم ورهبانهم، ويحلون ما أحلوا، كانت هذه ربوبـية صحيحة، وعبادة صحيحة، وقد دانوا بها، وسمى الله تعالى هذا العمل اتخاذ أرباب من دون الله وعبادة، وهذا هو الشرك بلا خلاف**)[٢٥٩]. واتە : كاتێك كە یەهود و نەصرانیەكان ئەو شتانەیان حەرامدەكرد كە پێشەواكانیان بۆیان حەرام كردبوون، وە ئەوانەیشیان حەڵاڵ دەكرد كە پێشەواكانیان بۆیان حەڵاڵ دەكردن، ئائەمە بەخوادانانی پێشەواكانیان بوو، وە پەرستش بۆكردنیان بوو، بۆیـە خوی تعالی ئەم كارەی بە خوادانانی ئەوان و عیبادەت بۆكردنیان لـە غەیری خودا ناوبرد ، وە ئەمە شەریك بۆ خودا قەراردانە بەبێ خیلاف و جیاوازی .

**إجماعی سێهەم** : شەیخی ئیسلام ابن تیمیة رحمه الله فەرموویەتی (**وَالْإِنْسَانُ مَتَى حَلَّلَ الْحَرَامَ الْمُجْمَعَ عَلَيْهِ أَوْ حَرَّمَ الْحَلَالَ الْمُجْمَعَ عَلَيْهِ أَوْ بَدَّلَ الشَّرْعَ الْمُجْمَعَ عَلَيْهِ**

---

هەموویان ئەمە بەزمان و بەئاشكرا نالێن ، بەڵكو بە شێوازێك دەیكەن تاكو ئەو موشریكانەی كە دیانپەرستن لێیان زویر نەبن و هەروەكو خوا بیانپەرستن (والله المستعان).

[٢٥٧] الإحكام في أصول الأحكام : ١٧٣/٥ ، دار الآفاق الجديدة، ط١

[٢٥٨] پێشتر ڕوونمان كردەوە كە ئینجیل وتە و حوكمی الله ـیە بەڵام نەسخ بۆتەوە ، ئەگەر بۆ ئەمە كافر ببێت بەبێ خیلاف ئەوا حوكمی دەستكردەكان لـەپێشترە بۆ ئەوەی خاوەنەكەی كافر ببێـ ، هەروەكو دواتر ئیمامی ابن كثير ئەم بابەتەمان بۆ ڕوون دەكاتەوە.

[٢٥٩] الفصل ٣/ ٢٦٦

كَانَ كَافِرًا مُرْتَدًّا بِاتِّفَاقِ الْفُقَهَاءِ)[٢٦٠]. واته : هەركاتێك مرۆڤ حەرامەكانی حەڵاڵكرد و حەڵاڵەكانی حەرامكرد كە إجماعیان لەسەر بوو، یان یاسایەكی گۆڕی كە إجماعی لەسەربوو، ئەوا بووە بەكافر و مورتەدد بەیەكدەنگی شەرعناسان.

**هەر ابن تیمیة** رحمه الله **إجماع نقڵ دەكات** و دەفەرمووێ (**ومعلوم بالأضطرار من دين المسلمين ، و بإتفاق جميع المسلمين ، ان من سوغ اتباع غير دين الإسلام او اتباع غير شريعة محمد فهو كافر**)[٢٦١].واته شتێكی زانراوە (ڕوونە) بە یەكدەنگی هەموو موسڵمانان كە هەركەسێك ڕێگەی شوێنكەوتنی غەیری دینی ئیسلام یان یاسای غەیری یاسای محمد ﷺ بدات ئەوا كافرە.

**وە هەر ابن تیمیة** رحمه الله **إجماع نقڵ دەكات** و دەفەرمووێ (**ومعلوم ان من اسقط الأمر و النهي الذي بعث الله به رسله فهو كافر باتفاق المسلمين واليهود والنصارى**)[٢٦٢]. واته شتێكی زانراوە كە هەركەس هەر فەرمانێكی الله عزوجل یان نەهیەكی پەكبخات، لە كاتێكدا كە الله عزوجل بە پێغەمبەری ﷺ ناردووە، ئەوا كافرە بە یەكدەنگی هەموو موسڵمانان و یەهودی و نەسرانیەكان.[٢٦٣]

---

[٢٦٠]مجموع الفتاوى : ٢٦٧/٣

[٢٦١] مجموع الفتاوى : ٥٢٤/٢٨

[٢٦٢] مجموع : ١٠٦/٨

[٢٦٣] ئەمرۆ نەك یەك فەرمان و یەك نەی پەكخراوە ، بەڵكو كانە حكومەت ڕێگری لە شیرك دەكات ؟ نا بەڵكو ئەمرۆ پشتگیری دەكرێت، ئایا كام حكومەت دەستی دز دەبڕێتەوە؟ كام داركاری زیناكاری غیر محصن و ڕەجمە محصن دەكات؟ كامیان بكوژ دەكوژێت ؟ كام مرتد دەكوژێت؟ كام هاوڕەگەزخواز دەكوژێت؟ كەواتە نەك فەرمانێك ، بەڵكو دەیەها فەرمان پەكخراوە.

لە بەرامبەریشدا چەندە نەهی الله پەكخراوە ، بەڵكو بە پێچەوانەوە كراوە بە یاسا ! ، كام وڵام ڕیبا نەكراوە بە شتێكی ئاسای ؟ بەڵكو زۆرجار مەرجی عەقاراتە ! ، كام وڵات لەجیاتی كوشتنی ئەو كەسانەی سوكایەتی بە رسول الله دەكەن ، بەڵكو دەیانپارێزن ، وە پەنایان دەدەن ، وە هاوكاری دەكرێن تا بنێردرێن بۆ ئەوروپا تا لەوێ بەدڵ خۆی چی بوێ بیكات ، بەڵكو ئەوانە دەگیرین كە وەڵامیان داوەتەوە و بەرگریان لە پێغەمبەری خوا كردووە ، ئەمە لە هەموو وڵاتان هەیە بەبێ استثناء ، كفرنا بهم.

**إجماعی چوارەم**: ئیمامی ابن القیم رحمه الله إجماع دیسان إجماع نقڵ دەکات و فەرموویەتی (**وَقَدْ جَاءَ الْقُرْآنُ، وَصَحَّ الْإِجْمَاعُ بِأَنَّ دِينَ الْإِسْلَامِ نَسَخَ كُلَّ دِينٍ كَانَ قَبْلَهُ، وَأَنَّ مَنِ الْتَزَمَ مَا جَاءَتْ بِهِ التَّوْرَاةُ وَالْإِنْجِيلُ، وَلَمْ يَتَّبِعِ الْقُرْآنَ، فَإِنَّهُ كَافِرٌ وَقَدْ أَبْطَلَ اللَّهُ كُلَّ شَرِيعَةٍ كَانَتْ فِي التَّوْرَاةِ وَالْإِنْجِيلِ وَسَائِرِ الْمِلَلِ، وَافْتَرَضَ عَلَى الْجِنِّ وَالْإِنْسِ شَرَائِعَ الْإِسْلَامِ، فَلَا حَرَامَ إِلَّا مَا حَرَّمَهُ الْإِسْلَامُ، وَلَا فَرْضَ إِلَّا مَا أَوْجَبَهُ الْإِسْلَامُ**)[264]. واتە لە قورئاندا هاتووە وە ئیجماعی لەسەرە کە ئاینی ئیسلام هەموو ئەو دینانەی پێشی خۆی نەسخ کردۆتەوە، وە هەرکەسێك پابەندی ئەوە بیت کە تەورات و ئینجیل پێی هات و شوێنی قورئان نەکەوێت ئەوا کافرە، وە بەڕاستی خوای تعالی هەموو ئەو یاسایانەی هەڵوەشاندۆتەوە کە لە تەورات بووبیت یان لە ئینجیل یان باقی دین و بەرنامەکانی تریش، وە یاسای ئیسلامی واجبی کردووە لەسەر ئینس و جن، هیچ حەرام نیە ئیلا ئەوە نەبیت کە لە ئیسلامدا حەرامکرابیت ، وە هیچ شتێك واجب نیە ئیلا مەگەر لە ئیسلامدا واجبکرابیت.

**إجماعی پێنجەم** : ئیمامی مفسیرین إبن کثیر رحمه الله فەرموویەتی : (**من ترك الشرع المحكم المنزل على محمد خاتم الأنبياء عليه الصلاة والسلام، وتحاكم إلى غيره من الشرائع المنسوخة" كفر. فكيف بمن تحاكم إلى الياسق وقدمها عليه؟ من فعل ذلك كفر بإجماع المسلمين**)[265]. واتە : هەرکەسێك واز لەو یاسا موحکەم و چەسپاوە بهێنێت کە دابەزیوە بۆسەر محمد ﷺ خاتەمی پێغەمبەران ، بەڵکو حوکم بباتەوە بۆلای غەیری ئەوە لە یاسا مەنسوخەکان (وەکو ئینجیل و تەورات) کافربووە ، ئەی حاڵی کەسێك چیە کە حوکم بۆلای یاسق دەگێڕێتەوە و دەیخاتە پێشی حوکمی خوا ﷻ ، جا هەرکەسێك ئەمە بکات کافربووەتەوە بە یەکدەنگی موسڵمانان .

---

[264] أحكام أهل الذمة : ١/٥٣٣

[265] البداية والنهاية : ١٣/١١٩

**إجماعی شەشەم** : ئیمامی ابن غنام النجدي رحمه الله فەرموویەتی: (**فمن لم يرض بهما (القرآن و السنة) حكما عند النزاع، فهو كافر مباح الدم والمال بالإجماع**)[٢٦٦].
واتە: جا هەرکەسێك بە قورئان و سونەت ڕازی نەبیت کە بکرێت بە حەکەم لە کاتی جیاوازی و کێشەدا، ئائەوە کافرە و خوێن و ماڵی بە یەکدەنگی زانایان حەڵاڵە.

**إجماعی حەوتەم** : ئیمامی سليمان بن عبدالله ال شيخ رحمه الله فەرموویەتی (**وقد انعقد إجماع أهل السنة والجماعة على خلافهم، ونحن لم نكفر إلا من لم يحكم بما أنزل الله من التوحيد بل حكم بضده وفعل الشرك ووالى أهله وظاهرهم على الموحدين**)[٢٦٧]. واتە : یەکدەنگی ئەهلی سوونە لەسەر ئەوە دامەزراوە لە خیلافی ئەواندا (واتە خەواریجەکان کە هەموو حاکمێك تەکفیر دەکەن) ، وە ئێمە هیچ (حاکمێك) تەکفیر ناکەین ئیللا حاکمێك نەبیت کە لە تەوحیددا حوکم بە قورئان ناکات ، بەڵکو حوکم بە پێچەوانەی ئەوە دەکات کە شیرکە و ئەنجامی دەدات و هاوکاری کافران دەکات و سەریان دەخات دژی موسڵمانان).

**گوتم** : ئەمە حاڵی تاغوتانی سەردەمە ، حوکم بە تەوحید ناکەن ، بەڵکو ڕێ لە بڵاوکردنەوەی تەوحیدی ڕاستەقینە دەگرن، وە نایانەوێ بەهیچ شێوەیەك باسی حاکمیەتی الله تعالى بکرێت، یان شیرکی حوکم و إطاعة، بەڵکو حوکم بە شیرك دەکەن، هاوکاریانن تا حیزب و کۆمەڵەی سەربەخۆ بۆ کافر و شیوعی و سەردەشتی و مولحید ئەتایست هەبێت تا هەر کوفرێك پێیان خۆش بێت بیکەن، ئائەمە حوکمە بە شیرك.

حوکم بەشیرك ئەوەیە تۆ حوکم بە یاسایەك بکەیت کە کرابێتە شەریکی

[٢٦٦] العقد الثمين في شرح أحاديث أصول الدين / ١٣٩
[٢٦٧] التوضيح عن توحيد الخلاق في جواب أهل العراق وتذكرة أولي الألباب في طريقة الشيخ محمد بن عبد الوهاب / ١٤٢

**یاساکەی اللە ﷻ، نا بەڵکو یاساکەی اللە ﷻ پەکخرابێت و یاساکەی ئەورووپا و ئەمریکا کاری پێدەکرێت، ئائەمە شیرکە لە حوکمدا.**

## بیروڕای هاوەڵان و تابعین و زانایانی دواتریش لەم بارەوە

بزانە خوای تعالی هیدایەتی من و تۆیش بدات ، لـە (١٤٠) لاپەڕەی پێشوو باسی ئەو بەڵگانەکرا کە خوای تعالی ئەو حاکمانەی بە کافر و تاغوت ناوبردووە وە ئەو کەسانەیش کە حوکمیان بۆلادەبەنەوە بە بـی باوەڕ و موشریك و مونافیق ناودەبات، کە پێشتر باسی هەمووکرا وە ڕوونکرایەوە کە کام حاڵەت کوفری بچوکە لـەم بابەتە وە کام حاڵەتانە کوفری گەورەن، پاشان پێمباشـــە کە باسی بـیروڕای ئەو هاوەڵ و زانایانەی تریش بکرێت کە ئەوان چۆن لـەم ئایەتانە تێگەیشتوون و بـیروباوەڕیان چۆنە، وە باسی إجماعی زانایانمان کرد لـەم بارەوە.

سەرەتا لـە دەرەوەی ناونیشانەکەی سەرەوە ئەگەر باسی پێغەمبـــەری خوایش بکرێت باشترە ﷺ ، دیارە پێغەمبـــەری خوا ﷺ عقیدەی ئەو قورئانە بوو، وە لـە قورئاندا کە ئەم حاکمانە بە تاغوت و کافر و ملوڕناودەبات ئەوە عقیدەی پێغەمبـــەری خوایە ﷺ، هەروەکو دایکمان عائشە سەبارەت بە پێغەمبــەری خوا ﷺ فەرموویەتی : (قورئانێکی گەڕۆك بوو) وە فەرموویەتی :(خوورەوشتی قورئان بوو)، بۆیـــە ئەوەی کە هاتووە لـە قورئان لـە حوکمی کافر و تاغوت و موشریك و مونافیق هتد لـەم حوکمانە هەمان حوکمی سەروەرمانـــە، وە ئەو ئەو قورئانـــەی کردبوو بە مەنهەجی ژیانـــی، بۆیـــە پێغەمبـــەری خوا ﷺ زۆر حـەریص بوو لـە جێبەجێ کردنی حوکم و حەددەکانی قورئان .

## حەریص بوونی سەروەرمان ﷺ لە جێبەجێ کردنی حوکمەکانی الله تعالی

هەروەکو ئیمامی البخاري[268] و مسلم[269] و ئەهلی سنن[270] و غەیری ئەوانیش[271] ڕیوایەتیانکردووە لە دایکمان عائشـــەوە (خوای تعالی لە خۆی و باوکی ڕازی بـیت) کە باسی ئەو ئافرەتە قوڕەیشیە مەخزومییەمان بۆباس دەکات کە دزی کردبوو، بۆیــە قوڕەیش ئەم بابەتەیان بە گرنگەوە وەرگرت، بۆیــە هەوڵیاندا کەسێك ببیننەوە بـینێرن بۆلای پێغەمبـــەری خوا ﷺ تاکو دەستی نەبڕێتەوە، بۆیــە کەسیان نەبـینیوە ئیللا خۆشەویستەکەی پێغەمبـــەری خوا ﷺ ئوسامەی کوڕی زەید ﷺ نەبـێت ، ناردیان بۆلای پێغەمبـــەری خوا ﷺ تاکو تکای لەلابکات، پێغەمبـەری خوا ﷺ کاتێك ئوسامەی بـینیی کە هاتووە تکا دەکات بۆ ئەوەی کە پێغەمبـــەری خوا ﷺ دەستی دزێك نەبڕێتەوە، زۆر توڕەبوو وە ڕەنگی گۆڕا و فەرمووی : (**أتشفع في حد من حدود الله؟**) واتە : ئەی ئوسامە هاتوویت تاکو داوا لە شتێکدا بکەیت کە حوکمی الله تعالی ــە ؟ ئایا دەتەوێت حوکمەکەی الله ﷻ جێبەجێ نەکرێت ؟؟ ، بۆیە کاتێك ئوسامە ئەم هەڵوێستەی بـینی زۆر پەشیمان بووەوە و داوای لەپێغەمبەری خوا ﷺ کرد کە داوای لێخۆش بوونی بۆ بکات ، پاشان دەستی دزەکە بڕایەوە .

**پاشان فەرمووی** : (**و الذي نفسي بـيده لو أن فاطمة بنت محمد سرقت، لقطت يدها**) ، واتە سوێند بەو کەسەی گیانی منی بەدەستــە ئەگەر فاتمەی کچی محمد ﷺ دزی بکات دەستی دەبڕمەوە) ، ئائەمەیە هەڵوێستی خۆشەویستمان لە حەریصبوونی لەسەر جێبەجێ کردنی حوکم و حەددەکانی الله تعالی .

---

[268] (٣٢٨٨)

[269] (١٦٨٨)

[270] الترمذي / ١٤٣٠ و النسائي / ٤٨٩٨ و أبوداود / ٤٣٧٣ و ابن ماجة / ٢٥٤٧

[271] أحمد : ١٦٢/٦ و الدارمي / ٢٣٠٢

خوای تعالی ئاگاداری کردۆتەوە کە بەهیچ شێوەیەك نابیت لە حوکمی الله تعالی لابدات، خوای تعالی فەرموویەتی : ﴿وَأَنِ احْكُمْ بَيْنَهُمْ بِمَا أَنْزَلَ اللَّهُ وَلَا تَتَّبِعْ أَهْوَاءَهُمْ وَاحْذَرْهُمْ أَنْ يَفْتِنُوكَ عَنْ بَعْضِ مَا أَنْزَلَ اللَّهُ إِلَيْكَ﴾[272] . واتە : ئەی محمد ﷺ حوکم بو قورئانە بکە کە الله ﷻ بۆی ناردویتە خوارەوە، نەکەی شوێنی هەواو ئارەزووی یەهوود بکەویت ، وە ئاگاداریان بە کە تووشی هەڵەت نەکەن و لە بەشێك لەو حوکمە لات نەدەن کە الله بۆی ناردوویت .

خوای تعالی بەم شێوازە فەرمان بە خۆشەویسترین بەندەی خۆی دەکات و ئاگاداری دەکاتەوە کە نەکات لە حوکمەکەی الله ﷻ لابدات ، چونکە حوکم تەنها مافی الله تعالی ـیە و هیچ کەسێکی تر تەنانەت خۆشەویستمان ﷺناتوانیٚ لە خۆیەوە حوکم بکات .

**الإمام ابن عباس** رضي الله عنه : ئیمامی ابن أبـی حاتم (رحمهما الله) ڕیوایەتێك نقلٚ دەکات و دەفەرمووێ : (حَدَّثَنَا أَبِي، ثنا عَمْرٌو النَّاقِدُ، ثنا شَبَابَةُ بْنُ سَوَّارٍ، عَنْ أَبِي بَكْرٍ الْهُذَلِيِّ، عَنْ عِكْرِمَةَ عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ قَالَ: **إِيَّاكُمْ وَالرَّأْيَ، قَالَ اللَّهُ تَعَالَى لِنَبِيِّهِ احْكُمْ بَيْنَهُمْ بِمَا أَرَاكَ اللَّهُ وَلَمْ يَقُلْ: بِمَا رَأَيْتَ**)[273]. واتە : بەو سەنەدە لە عکرمەوە لە ابن عباسەوە رضي الله عنه کە فەرموویـەتی : (ئاگاداربن لە بـیروبۆچوونی خۆتان ، الله تعالی بە پێغەمبـەرەکەی ﷺ فەرموو حوکم بەوە بکە کە الله ﷻ دایناوە نەك ئەوەی کە خۆت بەباشی دەبـینیت).

وە ڕۆژێکیان دوو لە هاوەڵان کە یەکیان زوبەیری کوڕی عەووام بوو ئەویتر کابرایـەکی ئەنصـــاری بوو لە بارەی جۆگەیەکەوە بوو بە کێشەیان ، جۆگە ئاوێك هەبوو سەرەتا بەناوباخەکەی زوبەیرەوە تێدەپەڕی پاشان دەچووە ناو باخەکەی ئەنصاریەکە ، کابرای ئەنصاری دەیوت دەبـیت ئاوەکە بەربدەیتەوە

---

[272] سورة المائدة / ٤٩

[273] تفسير القرآن العظيم مسندا عن رسول الله و صحابة و التابعين لإمام ابن أبـي حاتم – سورة النساء /١٠٥

سەرەتا من لـە ئاوەکە باخەکەم ئاو بدەمەوە نەك تۆ ، بۆ دادوەری چوون بۆلای پێغەمبــەری خوا ﷺ ، پێغەمبــەری خوا ﷺ دادوەری بۆکردن و لە بەرژەوەندی زوبەیر شکایەوە، چونکــە بەحەق بـیت ئەوا سەرەتا حەقی زوبەیری چونکە سروشتی ئاوەکەوابوو کە سەرەتا دەهاتە ناو باخەکەی زوبەیرەوە ، بۆیــە کابرای ئەنصاری بە حوکمەکە ڕازی نەبوو وتی : بۆیە ئەم حوکمەت بەم شێوازەدا چونکە زوبەیر پورزای خۆتە (پەنابەخوا) ، بۆیــە خوای تعالی ئەم ئایەتەی ناردە خوارەوە ﴿**فلا وربك لا يؤمنون حتى يحكموك فيما شجر بـينهم**﴾ .واتە : نەخێر سوێند بە پەروەردگاری تۆ ئەی محمد ئەوانە ئیمانیان نیــە تاکو تۆ نەکەن بە حەکەم لـە نێوان خۆیاندا ، ئەمیش زۆرینەی هەرە زۆری زانایان نقڵیان کردووە ، هەریەك لـە ئیمامی بوخاری[٢٧٤] و مسلم[٢٧٥] لـە صحیحەکانیاندا وە ئەهلی سنن[٢٧٦] و غەیری ئەوانیش[٢٧٧] ڕیوایەتیانکردووە. ئەمە بڕیاری پێغەمبــەری خوایە لـەسەر هەرکەسێك کە بە حوکمی الله ﷻ ڕازی نەبـیت ئیمانی نیە خوای تعالی ئیمانمان پارێزراو بکات .

وە هەروەکو پێشتر باسمانکرد عەددی کوڕی حاتم هاتە خزمەتی پێغەمبــەری خوا ﷺ و ملوانکەیەکی ئاڵتونی لـە ملدا بوو کە خاچ (صلیب) ـی لـەسەر بوو، پێغەمبــەری خوا ﷺ ئەو ئایەتەی خوێندەوە ﴿**اتخذوا أحبارهم و رهبانهم أربابا من دون الله و المسيح ابن مريم وما أمروا إلا ليعبدوا إلها واحدا لااله الا هو سبحانه عما يشركون**﴾[٢٧٨]. واتە: یەهود و نەصرانیەکان، دەسەڵاتدار و پیاوچاکانی خۆیان دەکرد بە خوا بەسەرخۆیانەوە جگە لـە الله تعالی، وە مەسیح عیسای کوڕی

---

[٢٧٤] (٢٣٥٩)

[٢٧٥] (٢٣٥٧)

[٢٧٦] سنن الترمذي / ١٣٦٣ ابن ماجة / ١٥ و النسائي في سنن الكبرى / ٥٩٦٤

[٢٧٧] المروزي في قدر الصلاة / ٧٠٦ و صحيح ابن حبان / ٢٤ و المعجم الكبـير للطبراني / ١٤٨٤٣

[٢٧٨] (سورة التوبة / ٣١)

مەریمیشیان بەھەمان شێوە دەکرد بە خوا بەسەرخۆیانەوە ، لـە کاتێکدا الله ﷻ فەرمانی بەوە پێنەکردبوون بەڵکو فەرمانی بەوە پێکردبوون کە تەنھا یەك خوا بپەرستن کە الله تعالی کە ھیچ شەریکێکی نیە ، پاك و بـێگەردی بۆ ئەو خودایە لـە ھیچ شەریکێك کە ئەو موشریك و کافرانە دەیکەنە شەریکی الله تعالی .

عەددی فەرمووی : ئەی پێغەمبـــەری خوا ﷺ ئێمە ئەوانمان ناپەرست و (نامانکرد بە خوا) ، پێغەمبـــەری خوا ﷺ فەرمووی ئایا حەڵاڵەکانیان بۆتان حەرام ناکرد ؟ ئایا حەرامەکانیان بۆتان حەڵاڵ ناکرد ؟؟ عەدی فەرمووی بەڵێ ئەی پێغەمبـــەری خوا ﷺ ، بۆیـە فەرمووی : ئائەوە عیبادەت کردنەکەبوو بۆیان.

ئەو حاکمانەی کە یاساکانی الله تعالی دەگۆڕن و ئەو کارانەی الله تعالی لـە یاساکەیدا حەرامی کردووە وەکو (داوێن پیسی یان دزی یان عەرەق یان ڕیبا یان کوفر وئیلحاد یان اللواط) ھتد .. ئەم کافری تاغوتە دێت و یاساکەی الله تعالی لادەدات و ئەم حەرامانە لـە یاساکەیدا حەڵاڵ دەکات ، ئەمڕۆ لـە چ وڵاتێکی بەناو ئیسلامیش تەنانەت شوێنی تایبەت بۆ داوێن پیسی نەکراوەتەوە ؟ لـە چ وڵاتێك ئازادی ڕادەربڕین نیە کە ھەرکەسێك چی پێخۆش بـیت بـیکات و بـیڵێت ؟ ، لـە وڵاتان موڵحیدان ئازادن و بە کەیفی خۆیان کوفر دەکەن ، ئائەمە ڕێگەدانە بە کوفر ، ئائەمانە ھەر ھەمووی کوفر و ڕیددەن ، تانانەت ئەگەر یەك یاسایش بگۆڕێت کافر دەبـیت و دەبـیت بە تاغوت ، وەیل بۆ حاڵی ئەوەی کە یاساکانی ھەمووی گۆڕیوە .

## ئەوەی حوکمی بە قورئان نەکرد وەلی ئەمری شەرعە نیە

**ھاتووە** لـە صحیح مسلم[279] و مسند ئیمام أحمد[280] و مصنف ابن ابی شیبة[281] و السنة الخلال[282] و مسند اسحاق بن راھویە[283] و سننەکانی ابن

---

[279] ر. ١٨٣٨

[280] ٢٧٢٦٩ و ٢٧٢٦٥ و ٢٧٢٦٣

[281] ر. ٣٢٥٣٧ و ٣٢٥٣٨

ماجة[284] و الترمذي[285] و ابو داود[286] وغەیری ئەوانیش لـه أم الحصين (رضي الله عنها) که فەرموویەتی (**سَمِعَتِ النَّبِيَّ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَخْطُبُ فِي حَجَّةِ الْوَدَاعِ، وَهُوَ يَقُولُ: «وَلَوِ اسْتُعْمِلَ عَلَيْكُمْ عَبْدٌ يَقُودُكُمْ بِكِتَابِ اللهِ، فَاسْمَعُوا لَهُ وَأَطِيعُوا»**).

واته گوێم لـه پێغەمبەری خوا ﷺ بوو لـه حەجی ماڵ ئاوایدا وتاری دەدا و دەیفەرموو : **ئەگەرعەبدێك بەسەرتانەوە بووە کاربەدەست و بە کتابەکەی الله ڕابەرایەتیتانی کرد ، ئەوا گوێی بۆ بگرن و گوێڕایەڵی بن.**

هەرگیز نابینین جەهمیەکانی سەردەم باسی ئەم فەرموودەیە بکەن ، کە مەرجی وەلی ئەمری شەرعی کە گوێ بۆگرتن و گوێڕایەڵیە دەبەستێتەوە بە **کارکردن بە قورئان** ، خۆ ئەگەر حوکمی بە قورئان نەکرد نە گوێی بۆ دەگیرێتنە گوێڕایەڵی دەکرێت ، چونکە وەلی شەرعی نیە ، بەڵکو تاغوتە ، خۆ ئەگەر وەلی ئەمری شەرعی بوایە ئەوا دەبوو گوێڕایەڵی بکرێت و بۆ ملکەچ بوینایە.

---

[282] ر. ٥٢

[283] ر. ٢٣٩١

[284] ر. ٢٨٦١

[285] ر. ١٧٠٦

[286] ر. ١٨٣٤

## سەبارەت بەوەی کە هاتووە لە سەلەفەوە لەم بارەوە

دیارە شارەزاترین کەسانێك بە دین و قورئان بریتی بوون لـە هاوەڵان ، هاوەڵان (الله لێیان ڕازی بـیت) قوتابی خۆشەویستمان بوون ﷺ وە ئاگاداری دابەزینی قورئان و سبب نزول و هۆکاری دابەزینەکانی بوون، وە ئامادەی وتار و موحازەرەکانی خۆشەویستمان بوون ﷺ ، بۆیـە ئەوان تێگەیشتوترین کەسانێك بوون بە دین وەك لـە غەیری خۆیان، دوای ئەوایش تابعی دواتر لـە زانایانی سەلەف .

## هاوەڵان بە کەعبی کوڕی أشرفیان دەگوت تاغوت!

لـە سەلـەف و بەتایبەتر هاوەڵانەوە هاتووە کە کەعبی کوڕی ئەشرەفیان بە تاغوت ناوبردووە ، ئەمیش هۆکارەکەی ئەوە نـەبوو کە جوولـەکە بوو ، وەکو یەکێك لـەو جەهمیانەی سەردەم دەیڵێ.

**لەوەڵامدا پێیان دەگوترێ:** ئەم قسەیە چەواشەکارییـە، باشـە خۆ بە هەزارەها جوولـەکە لـە شاری مەدینـە هەبوون، هۆکار چیبوو بە کەعبی کوڕی ئەشرەف ـیان دەوت تاغوت؟، ئەگەر هۆکاری ئەوە بـیت کە جوولـەکە بووبـێتن، ئەوا بە هەموو جوولـەکەیان دەوت تاغوت، بەڵام نەخێر تەنها بەو کەسە بەتایبەتر بە کەعب دەگوترا تاغوت چونکـە لـە نێوان خەڵکیدا حوکمی بە غەیری حوکمی الله تعالی دەکرد، بۆیـە هاوەڵان وە بە دوای ئەوانیشدا تابعین و غەیری ئەوانیش دەفەرموون کەعب تاغوت بوو، ئەمیش لـە ژمارەیەکی زۆر لـە هاوەڵان و تابعی هاتووە ، ئەمیش لـە ابن مسعود[287] و ابن عباس[288] موجاهید[289] و الضحاك[290] و

[287] فتح القدير لإمام محمد الشوكاني : ١ / ٥٥١

[288] تفسير الطبري : ٨/٥١١

[289] تفسير الطبري : ٨/٥١٣

[290] هەمان سەرچاوەی سەرەوە

الربيع بن أنس[291] و غەیری ئەوانیش هاتووە کە فەرموویانە : کەعبی کوڕی ئەشرەف تاغوتە !!!چونکە عەکعب حوکمی لەنێوان خەڵکی دەکرد بە جگە لەوەی الله تعالى دیگرتۆتە خوارێ ، بڕوانە با هاوەڵی خۆشەویست ابن عباس بۆمان ڕونبکاتەوە.

**ئیمامی عبدالله بن عباس** ﷺ: ئیمامی ابن أبـی حاتم لـە تەفسیرەکەیدا[292] ڕیوایەتی کردوە لـە ئیمامی ابن عبـــاسـەوە کە فەرموویەتی : (**كَانُوا إِذَا دُعُوا إِلَى مَا أَنْزَلَ اللَّهُ وَإِلَى الرَّسُولِ لِيَحْكُمَ بـينَهُمْ قَالُوا:بَلْ نُحَاكِمُكُمْ إِلَى كَعْبِ بْنِ الْأَشْرَفِ**). واتە: واتە ئەگەر بانگی (مونافیقەکان) بکرایە بۆلای خوا ﷻ و پێغەمبــەرەکەی ﷺ بۆ ئەوەی حوکمیان لـە نێواندا بکات، دەیانوت: بەڵکو حوکم بۆلای کەعــبی کوڕی ئـــەشرەف دەبەینەوە .

**وە فەرموویەتی** : (﴿**يريدون أن يتحاكموا إلى الطاغوت وقد أمروا أن يكفروا به**﴾، **والطاغوت رجل من اليهود كان يقال له: كعب بن الأشرف، وكانوا إذا ما دعوا إلى ما أنزل الله وإلى الرسول ليحكم بينهم قالوا، بل نحاكمكم إلى كعب! فذلك قوله ﷺ يريدون أن يتحاكموا إلى الطاغوت**).واتە : دەبارەی ئەو ئایەتە ، تاغوت پیاوێك بوو لـە جووەکان پێیان دەگوت کعب (بۆچی؟؟) چونکە مونافیقەکان بۆ حوکم دەگەڕانەوە بۆلای.

بۆیـــە هاوەڵان (خوای تعالى لێیان ڕازی بـیت) لـە هەموو کەس توندتر بوون دژی ئەو کەسانەی پشت لـە حوکمەکانی الله تعالى دەکەن ، وە من کەمێك لـەو نمونانەتان بۆ باس دەکەم خوای تعالى هاوکاربـیت .

---

[291] تفسير الطبري : ٥١٢/٨

[292] ( ر / ٦٩١٤)

هەریەك لە ئیمامی إبن أبـی حاتم[293] و البغوي و إبن بشران[294] و غەیری ئەویش ڕیوایەتیان كردووە كە : لـە سەردەمی پێغەمبـــەری خوا ﷺ دووكەس بوو بە كێشەیان ، چوون بۆلای پێغەمبـەری خوا ﷺ بۆ ئەوەی دادوەری لـێنێوانیان بكات و كێشەكەیان بۆ چارەسەر بكات ، پێغەمبـەری خوا ﷺ دادوەری لـە نێوان كردن ، بەڵام دواتر یەكیان بەو حوكمەی خۆشەویستمان ﷺ ڕازی نەبوو ، وتی با بچین بۆلای أبوبكری صدیق ، چوون و ئەویش ﷺ بەهەمان شێوەی پێغەمبـــەری خوا ﷺ حوكمی بۆدان ، دیسان كابرای یەكەمجار بەو حوكمەی ئیمامی ابوبكریش ڕازی نەبوو ، بۆیە وتی بابچین بۆلای عمری كوڕی خطاب با ئەو حوكمان بۆ بدات ، كە چوون بۆلای ، ئەوی تریان وتی ئەی عمر پێشتر چوینە بۆلای پێغەمبـەری خوا و أبوبكریش بەڵام ئەم كابرایە ڕازی نەبوو بە حوكمیان ، بۆیە عمر ﷺ چووە ژوورەوە یان لـە ڕیوایەتێكدا چووە ژوورێكی تر، پاشان هاتەوە و شمشێرێكی بە دەستەوە بوو و پێی لـە ملی كابرای دا و كوشتی، ئەوی تریان چووەوە بۆلای پێغەمبـــەری خوا ﷺ پێی وت كە عمر هاوەڵەكەمی كوشتووە ، پاشان ئەو ئایەتە دابەزی كە خوای تعالى فەرموویەتی : ﴿**فلا وربك لا يؤمنون حتى يحكموك فيما شجر بـينهم**﴾. واتە: نەخێر سوێند بە پەروەردگاری تۆ ئەی محمد ﷺ ئەوانە بڕوادارنین تاكو تۆ نەكەن بە حەكـــەم لـە نێوان خۆیاندا . واتە ئەوەی ئیمامی عمر كردی ناحەقی نەبوو وە بڕواداری نەكوشتووە بەڵكو مونافیقێكی كوشتووە چونكـە بە حوكمی الله تعالى ﷺ ڕازی نەبووە .

## لایەنی سەنەدەكەیشی خیلاف لەسەر بەهێزیەكەی هەیە :

ئیمامی ابن ابی حاتم دەگێڕێتەوە لـە یونس بن عبدالأعلى ، لـە عبدالله بن وهب ،

---

[293] تفسير القرآن العضيم مسنداً عن رسول الله و الصحابة و التابعين لإمام ابن أبـي حاتم : ج٣/ص٩٩٤.

[294] أمالي ابن بشران – الجزء الأول / ١٧ .

لـه ابن لهيعة لـه أبى الأسود ..الخ

ئەگەر زاهیری سەیری سەنەدەکەی بکەین دەڵێین لاوازە ، چونکە ابن لهيعة بوونی هەیە کە حفزی خراپە، بەڵام گەر بڕوانینە ئەوەی کە لـە ابن لهیعەی دەگێڕێتەوە ابن وهب ـە کە لـە قوتابیەکانی زووی ابن لهیعەیە ، چونکە ڕیوایەتی قدماء لـە ابن لهیعەوە جیاوازی هەیە . ابن وهب ـیش لـە قدمایە لـە قوتابیەکانی ابن لهیعە کە فەرموودەکانی لـە ابن لهیعەوە لـە نێوان حسن و صحیحدایە ، ئەمیش وتەی ئیمام أحمد بن حنبل[295] و ابن حبان[296] و أبو زرعة الرازي[297] و الدارقطني[298] و إبن حجر[299] و الذهبـي[300] و عبدالغنى بن سعيد[301] و غەیری ئەوانیشە ، واتە سەنەدەکەی حسن ـە ، بەڵام مرسلـە ، چونکە أبي الأسود تابعیە و لـەو ڕووداوە ئامادەنەبووە.

وە ئیمامی الحافظ إبن دحيم ـیش ڕیوایەتی کردووە[302] لـە شعيب بن شعيب لـە أبو المغيرة ، لـە عتبة بن ضمرة ، لـە باوکیەوە (أبو عتبة ضمرة بن حبيب) ..الخ ، وە سەنەدەکەی بەهێزە ، بەڵام دیسان مرسلـە ، چونکە ضمرة بن حبيب تابعیە.

وە ئیمامی البغوي[303] و الثعلبـی[304] ڕیوایتیان کردووە لـە ڕێگەی الکلبـی لـە أبی صالح عن ابن عباس ..الخ ، وە القرطبیش[305] هەمان ڕێگەی نقڵکردووە کە

[295] المجروحين لإمام ابن حبان : ١١/٢

[296] المجروحين لإمام ابن حبان : ١١/٢

[297] مختصر تاريخ دمشق : ٢٦٥/١٣

[298] المختلطين لأبو سعيد العلائي / لا ٦٨

[299] تقريب التهذيب : ٣١٩/١

[300] سير اعلام النبلاء : ١٧٤/٧

[301] الكواكب النيرات : ٤٨٣/١

[302] تفسير ابن كثير : ١٥٣/٢

[303] تفسير البغوي : ٦٥٥/١

[304] تفسير الثعلبي : ٣٣٧/٣

[305] تفسير القرطبي : ٢٦٤/٥

سەنەدەکەی زۆر لاوازە .

وە البيضاويش[306] بەهەمان شێوە دەیداتە پاڵ ابن عباس.

وە ابن ابي طالب ڕیوایەتی کردووە[307] لە ابن جريج کە فەرموویەتی هۆکاری دابەزینی ئایەتەکە[308] ئەو ڕووداوەیە .

وە الطبرانيش دەیداتە پاڵ الكلبي[309] و السمرقنديش[310] بەڵام بەبێ سەنەد.!

وە حكيم الترمذيش نوادر ڕیوایەتی کردووە کە دیسان جێگەی اعتماد نیە.

گوتم : هیچ یەکێك لەم ڕێگایانەی هاتوون بەتەنها ناگەنە پلەی صحيح ، بەڵکو هەموویان لاوازن جگە لە ڕێگەکەی ابن دحيم و ابن ابى حاتم کە صحيح ـن ، بەڵام مرسلن، مرسلیش خیلافێکی زۆری لەسەرە هەر لە سەلەفەوە تا ئەم سەردەمەیش کە ئایا مقبولە یان نا.

**بۆچوونی یەکەم :-**

ئیمامی أحمد بن حنبل و مالك و أبو حنيفه و الأوزاعي و سفيان الثوري و دواتریش ابن القيم و ابن كثير وغەیری ئەوانیش دەفەرموون مرسل کاری پێدەکرێت .

تەنانەت ئیمانی ابن جرير الطبري دەفەرمووێ : (ڕەتکردنەوەی مرسل دوای ساڵانی (٢٠٠) داهێنراوە.!).

**بۆچوونی دووەم :-**

وە بەشێك لە زانایانیش لەوانە ئیمامی ابن معين و ابن القطان و ابن مهدى و البخاري و مسلم و ابن ابى شيبة و ابو زرعة و أبوحاتم و غەیری ئەوانیش

---

[306] تفسير البيضاوي : ٨٠/٢

[307] الهداية الى بلوغ النهاية : ١٣٧٣/٢

[308] (سورة النساء / ٦٥)

[309] تفسير القرآن العظيم للإمام الطبراني ٤/٢

[310] تفسير السمرقندي : ٣١٣/١

دەفەرموون مرسل كاری پێناكرێت.

**بۆچوونی سێهەم** :-

وە بەشێكیش لە زانایان لەوانە ئیمامی الشافعي و الذهبي و دواتر و غەیری ئەوانیش دەفەرموون مرسلی كباری تابعین وەردەگیرێت و صغار وەرناگیرێت.

تەنانەت ئیمامی الذهبي دەفەرمووێ مرسل ـی ئەو تابعینانەیش كە لە طبقةی ناوەڕاستن وەردەگیرێت وەكو مجاهد و ابراهیم النحعي و الشعبی.

**بۆچوونی چوارەم** :-

وە بەشێك لە زانایان دەفەرموون مرسل ـی ئەو تابعینانەی كە تەنها ڕیوایەت لە سیقە وەردەگرن مقبولن و غەیری ئەوان لاوازە .

**پوختەی قسە** : وەك وتمان خیلافەكە زۆرە ، بەڵام ئەم ڕیوایەتەی كە باسمانكرد ، نەك لە تابعینێك ، بەڵكو بەسەنەدی بەهێز گەیشتۆتەوە بە دوو تابعین كە (أبوالأسود و ضمرة بن حبیب) بوون ، كەواتە یەك بەهێز دەكەن و مقبولن

پێش ئەوەی بـبینە سەر وتەکەی ئیمامی علی پێویســـتە بزانیت کە هەرکەسێك کە دەسەڵاتدار بـێت و موسڵمان بـێت پێویستـە لـەسەر خەڵکی کە گوێڕایەڵی بکەن و ملکەچ بن بۆ فەرمانەکانی ، وە بۆ هیچ کەس نیە کە خروجی لـێبکات و گوێڕایەڵی نەکات مەگەر کوفری لـێبـبـینرێت ، هەروەکو پێغەمبـەری خوا ﷺ ئاماژە بەوە دەکات کە **تاکو کوفرێکی ئاشکراتان لـە حاکمان نەبـینی دروست نیە دژایەتی و خروجی لـێبکرێت**[311] . واتە هەرکات کوفرێکی ئاشکراتان لـێبـینی ئەو کات ڕێگەدراوە بەڵکو پێویستە گوێڕایەڵی حاکمان نەکرێت[312] ، بۆیە دەبـینین ئیمامی عەلی حوکم کردن بە غەیری قورئان بە کوفری ئاشکرا (بەواح) دەزانێت بۆیە دەفەرمووێ: (**حَقٌّ عَلَى الْإِمَامِ أَنْ يَحْكُمَ بِمَا أَنْزَلَ اللَّهُ ، وَأَنْ يُؤَدِّيَ الْأَمَانَةَ ، وَإِذَا فَعَلَ ذَلِكَ فَحَقٌّ عَلَى النَّاسِ أَنْ يَسْمَعُوا وَأَنْ يُطِيعُوا وَأَنْ يُجِيبُوا إِذَا دُعُوا**).واتە پێویست و حەقە لـەسەر پێشەوایانی موسڵمانان کە حوکم بە قورئان بکـــەن و ئەو ئەرك و ئەمانەتەی لـەسەریانە وەکو خۆی بـیدەن ، خۆ ئەگەر ئەمەیان کرد ئەوا

---

[311] صحيح البخاري / ٧٠٥٥ و صحيح مسلم / ٤٨٧٧ و مسند الإمام أحمد / ٢٢٦٧٩ و مصنف الإمام ابن أبـي شيبة / ٣٨٤١١ و مسند أبـي عوانة / ٧١٢٤.

[312] زۆرکەس لـێرەدا تێناگات ، یان نایەوێ تێبگات ، کاتێك دەڵێین فلان حاکم کوفری بەواحی هەیە، کەسێك لـەولاوە دەڵێت کاکە وازبهێنن ئەمرۆ ئەوان دەسەڵاتیان هەیە و ئێوە هیچتان پێناکرێـت ، وەکو ئەوەی داوای شتێکی ئەستەمی لـێکرابێت .

ئێمە پێویستە دوو شت لـە یەك جیابکەینەوە ، یەکیان تەکفیری هەموو کافرێك بە حکامیشەوە کە تووشی کوفری بەواح بوونە ، دووهەمیان خروج و گۆڕینی ، تەکفیری تاغوت مانای ئەوە نیە دەبێـت ئیللا تۆ خروجی لـێبکەیت ، نا : بەڵکو تەکفیرەکە پێویستە ، وە کوفر بەتاغوت (لـەنێویشیدا تەکفیری تاغوت) لـە ئەصڵێ دینە ، وە ئەوەی نەیکات بڕوادارنیە ، بەڵام بابەتی خروج بەم شێوازە نیە ، بەڵکو کاتێك دەکرێت کە توانا هەبێت ، ئەگەر نەبوو ئەوا صەبر دەگیرێـت هەروەکو چۆن پێغەمبەری خوا لـە مەککە صەبری گرت.

پێویسته لەسەر موسڵمانان کە گوێیان بۆ بگرن و گوێڕایەڵیان بکەن و بەدەمیانەوە بچن و وەڵامیان بدەنەوە .

**ئەمە زۆر ڕوونە:** ئەگەر حوکمی بە قورئان نەکرد نە گوێی لێدەگیرێت نە گوێڕایەڵی دەکرێت نە وەڵامیشیان دەدرێتەوە ، کەواتە وەلی ئەمری شەرعی نیە ، چونکە وەلی ئەمر پێویستە گوێی بۆ بگیرێت و گوێڕایەڵی بکرێت ، چونکە حوکم کردن بە غەیری قورئان کوفر و ڕیددەیە و خاوەنەکەی پێی کافر دەبێتەوە و چیتر نابێتە وەلی ئەمری شەرعی ، بۆیە نە گوێی بۆ دەگیرێت و نە گوێڕایەڵیشی دەکرێت ، ئەمەیە بیروباوەڕی هاوەڵانی خۆشەویستمان ﷺ ، **ئەم ڕیوایەتەیش** هەریەك لە ئیمامی ابن أبی شیبة لە مصنف[313] و ابن أبی حاتم لە تەفسیرەکەیدا[314] و ئیمامی الطبري[315] و ئیمامی ابن المنذر[316] و غەیری ئەوانیش ڕیوایەتیان کردووە ، ئیمامی ابن ابی شیبة لە وەکیعی کوڕی جراحەوە و الطبریش لە أبو کریبەوە ئەویش لە ابن إدریسەوە وە ابن أبی حاتمیش لە حەسەنی کوڕی صالحەوە هەرسێکیان لە إسماعیلی کوڕی ابی خالدەوە ئەویش لە مصعبی کوڕی سەعدی کوڕی أبی وقاصەوە ئەویش لە ئیمامی عەلیەوە خوای تعالی لە هەموویان ڕازی بێت. وە سەنەدەکەی بەهێزە (صحيحه).

[313] ج٦/ص٦١٨ ر./ ٣٢٥٣٢ .

[314] تفسير القرآن العظيم مسندا عن رسول الله و الصحابة و التابعين لإمام ابن أبي حاتم الرازي : ج٣/ص٩٨٦ .

[315]جامع البيان في تأويل القرآن : ج٨/ص٤٩٠ ر. / ٩٨٤١ .

[316]تفسير الإمام ابن المنذر : ج٢/ص٧٦٣ .

ئیمام و زانای هاوەڵانی پێغەمبــەری خوا ﷺ عبدالله ی کوڕی مەسعود خوای تعالی لێی ڕازی بـیت ئەو ئایەتەی خوای تعالی کە فەرموویەتی : ﴿ومن لم يحكم بما أنزل الله فأولئك هم الكافرون﴾ فەرموویەتی ڕیشوە وەرگرتن لـە حوکمدا کوفرە . ئەی ئەگەر تەنها وەرگرتنی ڕیشوەی لـە حوکمدا بە کوفر ناوبردبـیت ئەی دەبـیت یاسالادانەکەی بە چی ناوهێنابـیت ؟ .

ئیمامی الطبري[317] و ابن أبـي حاتم[318] و الخلال[319] و البـيهقي[320] و سعيد بن منصور[321] و ابن بطة[322] و الطبراني[323] و غەیری ئەوانیش بۆمانی نقلّ دەکەن لـە مسروق و علقمەی کوڕی قیسەوە کە (أَنَّهُمَا سَأَلَا ابْنَ مَسْعُودٍ عَنِ الرِّشْوَةِ، فَقَالَ: «هِيَ مِنَ السُّحْتِ» قَالَ: فَقَالَا: أَفِي الْحُكْمِ؟ قَالَ: «ذَلِكَ الْكُفْرُ» ثُمَّ تَلَا هَذِهِ الْآيَةَ: ﴿وَمَنْ لَمْ يَحْكُمْ بِمَا أَنْزَلَ اللَّهُ فَأُولَئِكَ هُمُ الْكَافِرُونَ﴾). واتە : هەردووکیان کە تابعین پرسیاریان لـە ابن مسعود کردووە دەربارەی ڕیشوە فەرموویەتی : ئەوە سوحتە ، (واتە معاملاتێکی حەرامە)، پاشان لـێیان پرسیوە ئەی لـە حوکمدا ؟ ، هاوەڵی پێغەمبـــەری خوا (صلى الله عليه وسلم) فەرمووی‌ئائەوە کوفرە .

وە کوفرەکەی معرّف کراوە بە (الـ) کە کوفری بچوك ناگرێتەوە هەروەکو شەیخی ئیسلام ابن تيميه دەفەرمووێ .

ئەمیش بە چەند ڕێگەیەك هاتووە کە بەهێز و صحیحن. ئیمامی الطبري لـە یەعقوبی کوڕی ابراهیمی العبدیەوە دەیگێڕێتەوە ئەویش لـە هشيم بن بشير ئەویش

[317] جامع البـيان في تفسير القرآن : ج١٠/ص٣٢١

[318] تفسير القرآن العضيم مسندا عن رسول الله و الصحابة و التابعين / ر ٦٣٧٨

[319] السنـــــة / ر١٤١٢

[320] السنن الكبرى لإمام البـيهقي /ر ٢٠٩٨٤

[321] التفســـير من السنن سعيـد بن منصور / ر٧٤١

[322] الإبانة الكبرى / ر١٠٠٢

[323] المعجم الكبـير للطبراني : من اسمه عبدالله / عبدالله بن مسعود الهذلي / ر٨٩٥٥

لە عبدالملکی کوڕێ أبـی سلیم ئەویش لـە سلـمەی کوڕی کهیلـەوە ئەویش لـە علقەمەو مسروقەوە .وە عالـیترین سەنەدەیان ئەوەندەی من بزانم ئەوەی سعیدی کوڕی منصورە کە ریوایەتی کردووە لە (ابن عیینەوە ئەویش لـە عماری الـدهنییەوە ئەویش لـە ابن أبـی جعدەوە ئەویش لـە مسروقەوە) کە ئەمیش سەنەدەکەی بەهێز و صحیحە.

ئەمە بۆچوونی هاوەڵی پێغەمبـەری خوا ﷺ بەڵکو زانای هاوەڵان ابن مسعودە کە ڕیشوەوەرگرتن لـە حوکمدا بە الکفـــر ناودەبات کە ئەمە نە دەستکاری یاسایشی تێدابوو نە تشریع و نە استبدال ، بەڵکو حاڵـەتێکە دروست دەبـیت ، وە ئایەتەکەیشی خوێندەوە چونکە ئایەتەکە لـەسەر زاهیریەتی وە هیچ دەقێك نیە نەلـەقورئان نەلـە فەرموودە کە مقیەدی بکات ، ئیلا ئەو حاڵـەتانە نەبـیت کە پێشتر لـە بابەتی کفردون کفر باسمانکرد و دواتریش باسی لـێوە دەکەینەوە کە تەنها لـەو حاڵـەتەدا کوفری بچوکە . ئەگینا دەستبردن بۆ حوکم و یاسا کوفرە وە هیچ گومانمان لـە کافربوونی پشتیوانەکانیشیان نیە ، چونکە سەلـەف و خەلـەف پشتبەستوو بە دەقەکانی شەرع چ لـە قورئان چ لـە سوونەت یەك دەنگن لـە کوفر و ڕیددەی ئەو کەسەی پشت لـە حوکمی الله تعالی بکات و یاسای تر بـینێتە جێگەی ، جا تشریع بـیت یان تبدیل و استبدال بـیت ، هەرسێکی کوفری گەورەیە و خاوەنەکەی پێی کافر دەبـیت ، بۆیە جەهمییەکان چیتر با درۆ و دەلـەسەنەدەنە پاڵ هاوەڵـانی پێغەمبـــەری خوا ﷺ.

## (الإمام عبدالله بن عباس (رضي لله عنه)

وا مەشهورە كە ابن عباس وتوويەتى حوكم كردن بە غەيرى قورئان كوفرى بچوكە وە كفر دون كفرە وەتەنانەت ناتوانى لەلاى جەهميەكانى سەردەم ئايەتەكانى حوكم و هەڕەشەكان لە حاكم بغير ما أنزل الله بخوێنيتەوە يەكسەر دەڵێن ابن عباس دەڵێ كوفرى بچوكە ، تەنانەت وايان لێكردووە ئەو هەموو ئايەت و فەرموودەيەى پێشتر باسكرا ڕەت دەكەنەوە بۆ ڕيوايەتێك كە گوايە ابن عباس وتوويەتى كوفرى بچوكە، كە دواتر باسى ئەمە بە تفصيلەوە هەم لايەنى سەنەدى هەم مەتن و ماناكەى دواتر باس دەكەين .

بەڵام ئەوەى كە ئەمرۆ كەمترين جار باس دەكرێت ئەوەيە كە لە ابن عباسەوە پێچەوانەى كفر دون كفر لێى چەسپاوە.

**يەكەم** : ئيمامى عبدالرزاق لە تەفسيرەكەيدا ڕيوايەتى كردوە لە : (معمر عن ابن طاوس عن أبيه قال سئل ابن عباس رضي الله عنه عن قوله تعالى ﴿**ومن لم يحكم بما أنزل الله فأولئك هم الكافرون**﴾[٣٢٤] قال : **هي كفر**)[٣٢٥]. واتە : پرسيار لە ابن عباس رضي الله عنه كراوە دەربارەى ئەو ئايەتە كە خواى تعالى فەرموويەتى : ﴿جاهەركەسێك حوكم بەوە نەكات كە الله تعالى دايگرتووە ئەوا ئەوانە لە كافرانن﴾ . فەرموويەتى: ئائەوە كوفرە. وە سەنەدەكەى بەهێزە.

وە الطبري[٣٢٦] و المروزي[٣٢٧] و إبن بطة[٣٢٨] غەيرى ئەوانيش هەربەم ڕێگەيە نقڵيانكردووە . بۆيە ئەمە ڕێگەى بەهێزە كە هاتووە لە ابن عباسەوە كە حوكم

---

[٣٢٤] سورة المائدة / ٤٤

[٣٢٥] تفسير الإمام عبدالرزاق الصنعاني : سورة المائدة / ٤٤

[٣٢٦] جامع البيان في تأويل القرآن لإمام الطبري : ٣٥٦/١٠

[٣٢٧] تعظيم قدر الصلاة / ٥٧٠

[٣٢٨] الإبانة الكبرى / ١٠٠٩

كردنى به كوفــر ناوبردووه نهك به كفر دون كفر . وه ئهو ڕیوایهتهى كه هاتووه كه گوایــه ابن عبــاس ﵁ وتوویهتى ئهوه كوفـرى بچووكه پاریزراونیــه و معلولـه كه دواتر به تفصیلــى باسى دهكهین.

**دووهم** : وه لێوهى ڕیوایهت كراوه كه فهرموویهتى (كعب بن الأشرف) تاغوته، چونكه حوكم بهغهیرى حوكمى الله ﷻ دهكات ، ئیمامى ابن أبى حاتم ڕیوایهتى كردووه كه ابن عباس فهرموویهتى تاغوت كعب ـه[329] ، وههر ئیمامى ابن أبى حاتم ڕیوایهتى كردووه به ڕێگهیهكى تر كه فهرموویهتى (**كَانُوا إِذَا دُعُوا إِلَى مَا أَنْزَلَ اللَّهُ وَإِلَى الرَّسُولِ لِيَحْكُمَ بَيْنَهُمْ قَالُوا: بَلْ نُحَاكِمُكُمْ إِلَى كَعْبِ بْنِ الْأَشْرَفِ**)[330] واته : ئهگهر بانگى مونافیقهكان بكرایه بۆ حوكمى قورئان و سونهت لـه نێوانیان ، دهیاوت نا بهڵكو حوكمتان دهبهینهوه بۆلاى كعب بن الأشرف.

**سێههم** : ئیمامى الحافظ وكیع الضبـي[331] ڕیوایهتى كردووه : (**حَدَّثَنَا الْحَسَن بْن أبي الربيع الجرجاني" قال: أَخْبَرَنَا عَبْد الرزاق، عَن مَعْمَر، عَن ابن طاوس، عَن أبيه" قال: سئل ابْن عَبَّاس عَن قوله: {وَمَن لَّمْ يَحْكُم بِمَا أَنزَلَ اللهُ فَأُوْلَئِكَ هُمُ الْكَافِرُون} قال: كفى به كفره.**) . واته : بهو سهنهده پێمان گهیشتووه لـه ابن عباس دهربارهى ئایهتهكه فهرموویهتى : بهسه بۆ كوفرى ئهو كهسه ! (وهسهنهدهكهى صحيحه).

**چوارهم** : وه ههر ئیمامى الأبوبكر الضبـي[332] ڕیوایهتى كردووه (**أَخْبَرَنِي علي بْن العباس الحضري" قال: حَدَّثَنَا مُحَمَّد بْن مروان القطان" قال: حَدَّثَنَا إبراهيم بْن الحكم بْن ظهير، عَن أبيه، عَن السدي" قال: قَالَ: ابْن عَبَّاس: من جار في الحكم وهو يعلم، ومن حكم بغير علمه، ومن أخذ الرشوة في الحكم، فهو من الكافرين**). واته بهو سهنهده پێمانگهیشتووه لـه السدى لـه ابن عباس كه فهرموویهتى : ههركهسێك

---

[329] تفسير ابن ابي حاتم / ر ٥٤٥٠

[330] تفسير ابن ابي حاتم / ر ٦٩١٤

[331] أخبار القضاة / ٤١

[332] أخبار القضاة / ٤١

ستەم بکات لە حوکمدا و بزانێت ، یان بە جەهل حوکم بکات ، یان ڕیشوە وەربگرێت ، ئائەوە لە کافرانە. (بەڵام سەنەدەکەی لاوازە).

## بۆچی ئەوەندە باسی کفر دون کفر دەکەن ؟

بزانــە خوای تعالى هیدایـەتی من و تۆیش بدات کە حاشا لە صەحابـیـەکانی خۆشەویستمان ﷺ کە حاکم بغیر ما انزل الله ـیان بە موسڵمان زانیبـیت ! ، ئەوەیش هاتووە لە سەلەفەوە کە ڕیوایەتکراوە ابن عبـاس و بەشێکی کەمی تابعین کە وتوویانـە ئەمە کوفـری بچوکە ، لەگەڵ ئەوەی کە زۆرێکی ئەم ئەسەرانە صحیح نین و ناگەنە پلەی بەهێز ، لەگەڵ ئەوەیشدا پێویستــە ئەوە بزانین کە ئایا مەبەستی سەلەف لەمە چیـــە ؟ ، ئایا ئەوان باسی تشـــریع و تبدیل و استبدال دەکەن ؟ ئایا باسی ئەوانە دەکەن کە یاسا ی قورئان لادەدەن و بە ویستی خۆیان حوکمەکانی الله تعالى دەگۆڕن ؟؟.

بـیگومان نەخێر چونــکە سەرەتا ئەوە بزانە کە سەردەمی سەلەف ئەم کوفرە کە بریتیە لە دەستکاری کردنی حوکمی الله تعالى بوونی نەبوو، وە سەلەف ئاشنای ئەم کارە هەرنەبوبوون ، بەڵکو زیاد لە (٦٠٠)ساڵ دوای سەلەف ئەم تبدیل و استبدال تشریعە هاتە کایەوە لە سەردەمە تەتار کە پێشتر باسمانکرد کە ئەهلی سوونە یەکدەنگ بوون لە کوفر و ڕیددەی هەموو ئەوانەی کە دەستکاری یاسای الله تعالى دەکەن ، لەو سەردەمە ئەم کارە پیسە هاتە کایەوە. وەکو چەندجارێکی تریش باسمانکرد:

**ئیمامی عبدالرحمن بن قاسم النجدي** رحمه الله لە الدررالسنية لە بەرگی (١٦) سەرەتای بابی (١٠) سەبارەت بە دەرکەوتنی ئەم یاسادەستکردانە دەفەرمووێ نە سەردمی پێغەمبەری خواو نە ئیمامەکانی سەلەف بوونی نەبووە ، بەڵکو دواتر پەیدابووە ، هەروەکو فەرموویەتی (**لم تكن في عصر الشيخ عبد الله، ولا في عصر النبوة، ولا الأئمة المهديين" وإنما سرت إلينا من أفراخ الإفرنج المنحلين، المعرضين عن**

**شرع رب العالمين، فجاؤوا بنظمهم يطبقونها على المسلمين.)**[333]بۆيــه لـەوكاتەوە إجماعی ئەهلی سوونە هەیە لـەسەر کافربوونی حاکم بغیـــر ما أنزل الله ، بۆیـــە ئەمەی کە بەشێکی کەم لـە سەلـەف وتوویانە کوفری بچووکە ئەمە تشریع و یاسادانان ناگرێتەوە چونکـــە سەردەمی ئەوان ئەم کارە بوونی نەبوو ، بەڵکو ئەوەی لای ئەوان بوونی هەبوو ئەمەبوو :

## ئەوەی لە سەردەمی سەلەف بوونی هەبوو چیبوو؟

ئەوەی سەلـەف پێیان دەوت کوفری بچوك حاکمێکە کە لـە دەوڵـەتی ئیسلامیدا حوکمی دەکرد. واتە یاسای وڵـاتەکەی دیموکراسی و عیلمانی و لیبراڵی و کوفری نەبوو، بەڵکو قورئان بوو وەکو خەلافەتی راشدین و الأموي و عەباسی . هەرسێ سەردەمەکە یاسای وڵـات هەرقورئان بوو وە دەستکاری یاساناکرا، بەڵکو هەندێك جار حاکمەکان بەهۆی هەواوئارەزووەوە لـە حوکمی الله تعالی لایدەدا بەبێ ئەوەی دەستکاری یاسا بکات ، ئەوا کافرنابـێت ئەمیش بەچەند مەرجێکی تر کە نابـیت إستحلال یان جـــحد یان تفضیل بکات ، ئائەمە لای سەلـەف کوفری بچوك بووە ئێمەیش وەکو شوێنکەوتەی سەلـەفی صالح إقرار بەمە دەکەین و بڕوامان پێی هەیە و ئەمە بەحەق دەزانین .

بەڵام دووبارە و سێبارە و سەدبارەیشی دەکەینەوە کە ئەوەی سەلـەف باسیانکردووە بابەتی تشریع و یاسا نووسین ناگرێتەوە بۆیە هەرکەسێك وتی سەلـەف ئەوحاکمانەیشیان بە کافر نەزانیوە کە دەستکاری دەستور دەکەن ئەوا پێیان دەڵێن درۆتکرد، قسەکەت هەڵەیە لـە چەند ڕوویەکەوە:

**یەکەم** :لـە سەردەمی سەلـەف لـە دەوڵـەتی ئیسلامیدا هەرگیز ڕۆژێك لـــە ڕۆژان دەستکاری دەستور نەکراوە ، وە هەرگیز تـــشریع یان تبدیل نەکراوە ،

[333] الدرر السنية : ١٧١/١٦

بۆیە ئەم قسەیە درۆیـە بەسەر هاوەڵانەوە وە بوهتانە بۆیان ، چونکە ئەمە خیانەتە لـە مێژوو.

**وە هەر ئیمامی عبدالرحمن بن قاسم النجدی** رَحِمَهُ اللَّهُ بابێکی تایبەتی لـە کتابە بەناوبانگەکەی خۆی (الـدرر السنیة) ناوناوە بە (**الفصل الثالث: ما یسمی بالنظم وبالقانون لم یکن یعرف في عهد سلفنا**)[334]. واتە : فەصـــــڵی سێیەم : ئەوەی کە ناودەنرێت بە یاســا و قانون کەلـەسەردەمی سەلـەف نەناســـرابوو.

**پاشان دەفەرمووێ** : (**ما یسمونه بالنظم، وقد یسمی بالقانون، وغیر ذلك، ولكل دولة فيه اصطلاح، وقد يختم كل نظام بوجوب الحكم به، وللدولة نظم عديدة، كنظام الوزراء، والمحاكم، وكنظام البنوك، ونظام العمل والعمال، وسائر الدوائر، ولم تكن تلك تعرف في عهد سلفنا، ولا في عهد السلف الصالح**)[335]. واتە : ئەم قانون و یاساتازانە کە هاتوون لـەسەردەمی سەلـەف بوونی نەبووە.

کەواتە شتێك کە سەردەمی سەلـەف بوونی نەبووبێت کەواتە چۆن قسەلـەبارەیەوە بکەن ، هەموو ئەمانە درۆ و ڕووڕەشی ئەهلی بیدەع و مورجیئەکان دەردەخات کە چۆن بوهتانێك دەدەنە پاڵ سەلـەف کە گوایـە ئەوان حاکم بە یاسادەستکردەکانیشیان بە کافر نەزانیوە.

**دووەم**: مەبەستی سەلـەفیش ناکرێت بە حەز و ئارەزووی خۆمان شەرحی بۆ بکەین و ئەوەی بە دڵمان بـێت باسی بکەین و ئەویش پێچەوانەی ئێمە بـێت تأویلی بکەین، بەڵکو سەیری بۆچوونی زانایان و شارەزایانی دینەکەمان دەکەین کە ئەوان چیان فەرمووەو و چۆن لـەم قسانە تێگەیشتوون ؟ پێشتر وتەی بەشێك لـە زانایانمان باسکرد کە فەرموویان سەلـەف باسی تشریع و تبدیل ناکەن ، بەڵکو باسی حاڵـەتێك دەکەن بەبێ دەستبردن بۆ قانون ، وە دواتریش دووبارە وتەی ئەو

---

[334] (ب ١٦/لا ٢٣٣)

[335] الدرر السنية : ٢٣٣/١٦

زانایانه باس دەکەینەوە خوای تعالی هاوکاربیت ، بۆیــە دەبیت بڵێین یان سەلـەف تشریعیشیان بە کوفری بچوك زانیوە یان هەموو ئەم زانایانەی تر هەر لـە طاوس کە خۆیشی هەر لـەسەلـەفە و ابن راهویە و الکنانی و ابن حزم و ابن تیمیە و ابن کثیر و ابن القیم ابن ابی العز الحنفی شەیخی ئیسلام محمد بن عبدالوهاب و نەوە و ئەحفادەکانی وە ئیمامەکان أحمد شاکرو الشنقیطي غەیری ئەوانیش خەواریجن کە تشریعیان بە کوفری گەورە ناوبردووە و شوێنە سەلـەف نەکەوتوون.

بەڵام نەخێر تێگەیشتنی تەواو بۆ ئەسەرەکان لـەسەف و تێگەیشتنی زانایان بۆیان ئەوەمان نیشان دەدات کە ئەوەی سەلـەف باسی دەکەن کە کفر دون کفرە ئەمە بەهیچ شێوەیەك یاسانوسین و تشریع و استبدال ناگرێتەوە وە هەرکەسێك یەك حوکمی الله تعالی ـیش بگۆڕێت کافر و مورتەددە وە هیچ عوزرێکی بۆ نیە ئەگەر استحلالیشی نەکردبیت ، ئەمە بۆچوونی مورجیئەیە کە کوفرەکە وابەستەی إعتقادی دڵ دەکەن و دەڵێن کافر نابیت تاکو استحلالی نەکات وەکو هەرتاوانێکی تر ، جا ئەمە چ جیاوازییەکی هەیە لـەگەڵ بۆچوونی مورجیئەکان ؟ ئەوانیش کوفر بە أعمال لـەلایان گەورە نیە تا إعتقادی لـەگەڵ نەبیت کە ئەمە تەواو پێچەوانەی عقیدەی ئەهلی سونەیە کە ئیمان و ئیسلامەتی چۆن وتە و إعتقاد و کردەوەیشە کوفریش بەهەمان شێوە هەم وتە و هەم إعتقاد هەمیش کردەوەیە ، وە هەرکەسێك کوفرە کردەوەیەکانی وابەستەی إعتقادکرد لـە بابەتی تشریع و حوکم کردن بەیاسا دەستکردەکان ئەوا هیچ گومانت نەبیت مورجیئەیە.

قوتابی ابن عباس ﵄ ، ئیمام و یەك لە زانایانی تابعین موجاهیدی کوڕی جبـــر ﵀ دەربارەی تاغوت دەفەرمووی (**الشَّيْطَانُ فِي صُورَةِ الإِنْسَانِ، يَتَحَاكَمُونَ إِلَيْهِ، وَهُوَ صَاحِبُ أَمْرِهِمْ**)[336]. واتە تاغوت:شەیتانێکە لە وێنــــــەی مرۆڤ کە خەڵکی حوکمیان بۆلادەبەنەوە و خـــاوەن هێز و دەسەڵات و فەرمـــــانیانە ، (واتە سەرۆکیانە)

**گوتم** : ئەمەی ئەم تابعی خۆشەویستە باسی دەکات تاغوتانی ئەمڕۆن ، وەکو شەیتان وان بۆ دونیا ، لەگەڵ ئەوەیشدا خۆیان حوکم دادەنێن و خەڵکیش بۆلای حوکمەکەی ئەوان دەچێتەوە، جا ئیمام ﵀ فەرمووی ئائەوە تاغوتە، تاغوتیش لە پیسترین و بەدبەخترینی کافرانە وە لەگەڵ فیرعەون و قارون و نەمرود و أبوجهل و باقی تاغوتانی تردا حەشــردەکرێت.

ئائەمە بۆچوونی تابعی و قوتابـیەکانی هاوەڵانە ، ئائەمە قوتابی هەرەناوداری ابن عباسە ﵄ ، ئەم باشتر لە من و تۆ لە بـیروباوەڕی حەق و مامۆستاکەی ابن عباس شارەزاترە ، دەزانێت ئەوەی ابن عباس باسی دەکات باسی یاسادانان ناکات و لە خۆیشی ناگرێت .

**دووەم** : وە هەر ئیمامی مجاهید کعبی کوڕی أشرف بەتاغوت ناو دەهێنێت چونکە حوکمی بەغەیری بەرنامەکەی الله ﷻ دەکرد و خەڵکیش بۆلای دەچوونەوە ، هەروەکو فەرموویەتی (**تَنَازَعَ رَجُلٌ مِنَ الْمُنَافِقِينَ وَرَجُلٌ مِنَ الْيَهُودِ فَقَالَ الْيَهُودِيُّ: اذْهَبْ بِنَا إِلَى مُحَمَّدٍ، وَقَالَ الْمُنَافِقُ: اذْهَبْ بِنَا إِلَى كَعْبِ بْنِ الْأَشْرَفِ فَأَنْزَلَ اللَّهُ: ﴿يُرِيدُونَ أَنْ يَتَحَاكَمُوا إِلَى الطَّاغُوتِ﴾ «وَهُوَ كَعْبُ بْنُ الْأَشْرَفِ»**)[337] . واتە پیاوێکی مونافیق و پیاوێك لە جوولەکەکان بووبەکێشەیان ،

[336] جامع البيان في تأويل القرآن : ٨/٤٦٢ – ٤٦٥ و تفسير ابن ابي حاتم/ ر٢٦٢١ و تفسير مجاهد : سورة النساء / ٥١

[337] تفسير مجاهد : سورة النساء / ٦٠

کابرای جوولەکە وتی بابرۆین بۆلای محمد ﷺ، وە کابرای مەنافیق (کە بەرواڵەت و زاهیری کەسێکی موسڵمانە) وتی نەخێر بابچین بۆلای کەعبی کوڕی ئەشرەف (دەیانەوێ حوکم بۆلای تاغوت ببەنەوە) کە کەعبی کوڕی أشرەفە .!!.

## الإمام طاوس بن كيسان (رحمه الله تعالى)

ئیمامی سلیمان بن عبدالله رحمه الله ڕیوایەتێکی بە معلقی نقلکردووە و دەفەرمووێ: (..وكيع عن سعيدالمكي عن طاووس قال: **ليس الحكم في الفروع بغيرماأنزل الله مع الإقرار بحكمه والمحبة له ينقل عن الملة**)[٣٣٨]. واتە وەکیع لە سعیدی مەکییەوە ئەویش لە تاوسەوە کە دەربارەی کوفر دون کفر فەرموویەتی : حوکم کرد لە بابەتە فەرعی و لاوەکیەکان ناگرێتەوە ، ئەمیش لەگەڵ ئەوەدا کە دان بە ڕاستێتی حوکمی الله ﷻ بنێت و خۆشی بوێت کوفر بـیت کە دەری بکات لە دین . واتە ئەو کوفرە نیە ئەگەر لە بابەتە فەرعیەکان بـیت نەك تەشریع و یاسا بنوسێت .

**پاشان شێخ سلیمان ال شیخ** لە تعلیقی لەسەر بابەتەکە دەفەرمووێ : (**ونحن لم نكفر إلا من لم يحكم بما أنزل الله من التوحيد بل حكم بضده وفعل الشرك ووالى أهله وظاهرهم على الموحدين**)[٣٣٩]. واتە : وە ئێمە هیچ حاکمێکمان بە کافر نەزانیوە مەگەر لە تەوحید و یەکخواپەرستیدا حوکم بە قورئان نەکات ، بەڵکو حوکم بە شیرك بکات و هاوکاری برا موشریکەکانی بکات دژی یەکخواپەرستان.

گوتم : ئەمە حاڵی دەسەڵاتدارانی سەردەمە (عاملهم الله بعدله) کە لە تەوحیدا حوکم ناکەن ، بەڵکو بە شیرك و بۆ شیرك حوکم دەکەن ، بە پرۆسەیەکی شیرکی لە بینایەك کە شەریك بۆ الله تعالى قەراردەدرێت حوکم دەکرێت ، وە بۆ شیرك دەکرێت تەوحیدی پاك و هۆکارەکانی بڵاوکردنەوەی وەکو دەرس و وتار و کتاب قەدەغە دەکرێت ، بەڵام ڕێگەی تەواو بە مولحید و زەردەشتی و ئێزیدی

---

[٣٣٨] التوضيح عن توحيد / ١٤٢

[٣٣٩] التوضيح عن توحيد /١٤٢

دەدرێت ، بەڵكو هاوكاری دەكرێن ، بەڵكو كۆمەڵە و بارەگا و پارێزەریشیان بۆ دادەنرێت ، بـــە هەزارەها كتاب و هۆكارەكانی ڕاگەیاندنیشیان بۆ تەرخان دەكرێت ، ئەمەیە حوكم بە شیرك و بۆ شیرك (والله المستعان).

## الإمام أبـي البختري سعيد بن فيروز الطائي (رحمه الله)

ئیمامی الطبري لـە تەفسیرەكەیدا[340] و ابن ابـی شیبة[341] و الخطیب البغدادي و غەیری ئەوانیش ڕیوایەتیانكردووە لـە (جریر وابن فضیل، عن عطاء، عن أبـي البختري رحمه الله ﴿اتخذوا أحبارهم ورهبانهم أربابًا من دون الله﴾، قال: **انطلقوا إلى حلال الله فجعلوه حرامًا، وانطلقوا إلى حرام الله فجعلوه حلالا فأطاعوهم في ذلك. فجعل الله طاعتهم عبادتهم. ولو قالوا لهم: اعبدونا، لم يفعلوا**) . واتە : بەو سەنەدە هاتووە لـە ئیمامی أبـی البختریەوە رحمه الله كە دەربارەی ئایەتەكە فەرموویەتی : ئەوانەی كە خەڵكی دەیانكردن بە خوا بەسەر خۆیانەوە ، دەیاوت بڕۆن حەڵاڵەكان حەرام بكەن و حەرامەكانیش حەڵاڵ بكەن ئەوانیش دەیانكرد ، بۆیـە خوای تعالی ئەم گوێڕاییەی ئەوانی بە پەرستش داناوە ، خۆ ئەگەر بە خەڵكی بلێن خەڵكینە وەرن سوجدەمان بۆ ببەن یان حەیوانمان بۆ سەر ببڕن یان هەرجۆرێكی تری عیبادەتمان بۆ بكەن ئەوا خەڵكەكە نایانكرد ،(بەڵام گوێڕایەڵیان لـە حەڵاڵ و حەرام دەكرد نایانزانی ئەمەیـــــش هەر عیبادەتە و جیاوازی نیە).

وە لـە تەفسیری ئیمامی موجاهیدیش هاتووە لـە عبدالرحمنی كوڕی الحسینەوە ئەویش لـە إبراهیمی الهمذانیەوە ئەویش لـە آدم ابن أبـی ایاسەوە ئەویش لـە ورقا ئەویش لـە عطاءوە رحمه الله .

---

[340] (ر : ١٦٦٣٧)

[341] مصنف : كتاب الزهد / ماذكر من زهد الأنبيـاء و كلامهم عليهم السلام – أبو البختري.

## الإمام محمد بن إدريس الشافعي (رحمه اللّه)

ئيمامى شافعى رحمه الله دەفەرمووێ :(**أما الذي يجتهد و يشرّع على قواعد خارجة عن قواعد الإسلام ، فإنه لا يكون مجتهدا ولا يكون مسلما ، إذا قصد إلى وضع ما يراه من الأحكام وافقت الإسلام أم خالفته**)[٣٤٢]. واته : بەڵام ئەوەى كە بۆچوون دەردەبڕێت و ياسا دادەنێت لـەسەر ئەساسێك لـە دەرەوەى ئەساسى ئيسلام ، ئەوا ئەو كەسە مجتهد نيە و موسڵمانيش نيە ، ئەگەر مەبەستى بوو ئەوەى كە خۆى بەباشى دەزانێ داينێ ، جا موافقەى ئيسلام بێت يان پێچەوانەى.

## الإمام أبو جعفــر الطبري (رحمه اللّه)

يەكەم : فەرموويەتى (**هؤلاء الذين لم يحكموا بما أنزل الله في كتابه، ولكن بدَّلوا وغيروا حكمه، وكتموا الحقَّ الذي أنزله في كتابه هم الكافرون، يقول: هم الذين سَتَروا الحق الذي كان عليهم كشفه وتبـيينُه، وغطُّوه عن الناس، وأظهروا لهم غيره، وقضوا به، لسحتٍ أخذوه منهم عليه**)[٣٤٣]. واته : ئەوانەى كە حوكم بەو حوكمەناكەن كە الله تعالى دايگرتووە لـە كتابە پيرۆزەكەى خۆيدا ، بەڵام حوكمەكەيان گۆڕى و حوكمە حەقەكەى الله تعالى ـيان لـە خەڵك شاردەوە و كاريان پێنەكرد ، ئائەوانە كافرن ، ئەوانەى كە حەق دەشارنەوە ، ئەو حەقەى كە پێويست بوو ئاشكراى بكەن و ڕوونى بكەنەوە ، بەڵكو غەيرى ئەو حەقەيان نيشان خەڵكدا و هەر بەو ناحەقەيش حوكميانكرد ، بۆ ئەوەى پارەيەكيان دەستبكەوێت بەهۆى ناحەقەوە .

**دووەم** :وە هەروەها فەرموويەتى (﴿**إن كنتم تؤمنون بالله واليوم الآخر**﴾، **يقول: افعلوا ذلك إن كنتم تصدقون بالله** ﴿**واليوم الآخر**﴾، **يعني: بالمعاد الذي فيه الثواب**

---

[٣٤٢] كتاب الرسالة / ١٧٨ بتحقيق الشيخ أحمد شاكر.

[242] جامع البـيان في تأويل القرآن لإمام الطبري : ٣٤٦/١٠

**والعقاب)**[344] . واتە : (لـە تەفسیری ئەو ئایەتەی کە خوای تعالی دەفەرمووێ لـەکاتی کێشەدا بگەڕێنەوە بۆلای خوا و پێغەمبەرەکەی ﷺ) پاشان الله تعالی دەفەرمووێ : ئەگەر ئێوە بڕواتان بە خواو ڕۆژی دوای هەیە ، دەفەرمووێ : بگەڕێنەوە بۆلای خوا و پێغەمبـەرەکەی ﷺ ئەگەر ئێوە خوا بە ڕاست دەزانن ، وە ئەگەر ئەو ڕۆژەی بەڵێنتان پێدرابوو وە یّتە دی لـە پاداشت و سزا هەیە.

زاهیری وتەی ئیمام دیار و ڕوونە هەرکەسێك نەگەڕێتەوە بۆلای حوکمی الله ﷻ و پێغەمبـەرەکەی ﷺ نە خوا بەڕاست دەزانێت نە قیامەت (پەنابەخوا) .

سێیەم : وە فەمەرموویەتی: (**ولا يجعل الله في قضائه، وحكمه في خلقه أحدا سواه شريكا، بل هو المنفرد بالحكم والقضاء فيهم،وتدبيرهم وتصريفهم فيما شاء وأحبّ)**[345].واتە : خوای تعالی لـە حوکم و قەزاوەت لـەناو دروستکراوەکانیدا کەسی دانەناوە بە شەریکـــی خۆی، بەڵکو تاك و تەنهایـە لـە حوکمدان و قەزاوەتکردن لـە نێوان بەندەکانی خۆیدا.

## الإمام أبو محمد إبن حــزم (رحمـه الله)

یەکەم :إجماع نقلّ دەکات و دەفەرمووێ : (**لا خلاف بـين اثنين من المسلمين.... وأن من حكم بحكم الإنجيل مما لم يأتِ بالنص عليه وحي في شريعة الإسلام فإنه كافر مشرك خارج عن الإسلام)**[346]. واتە : خیلاف لـە نێوان دوو موسڵماندا نیە .. هەرکەسێك حوکم بکات بە حوکمێکی ئینجیل ، کە ئەو حوکمە لـە شەریعەتی ئیسلامیدا نەبـیت ، ئائەوە کافر و موشریکە و مافی بە ئیسلامەوە نەماوە .

---

[344] جامع البـيان : ٨/٥٠٤

[345] جامع البـيان في تأويل القرآن لإمام أبو جعفر الطبري (المتوفى: ٣١٠هـ) : ب ١٧ / لا ٦٥٠ – المحقق: أحمد محمد شاكر – الناشر: مؤسسة الرسالة – الطبعة: الأولى، ١٤٢٠ هـ – ٢٠٠٠ م

[346] الإحكام في أصول الأحكام : ٥/١٧٣ ، دار الآفاق الجديدة، ط١

**دووەم** : هەروەها فەرموویەتی : (**لما كان اليهود والنصارى يحرمون ما حرم أحبارهم ورهبانهم، ويحلون ما أحلوا، كانت هذه ربوبـية صحيحة، وعبادة صحيحة، وقد دانوا بها، وسمى الله تعالى هذا العمل اتخاذ أرباب من دون الله وعبادة، وهذا هو الشرك بلا خلاف**)[٣٤٧]. واتە : كاتێك كە یەهود و نەصرانیەكان ئەو شتانەیان حەرامدەكرد كە پێشەواكانیان بۆیان حەرام كردبوون ، وە ئەوانەیشیان حەڵاڵ دەكرد كە پێشەواكانیان بۆیان حەڵاڵ دەكردن ، ئائەمە بەخوادانانی پێشەواكانیان بوو ، وە پەرستش بۆكردنیان بوو ، بۆیـە خوی تعالى ئەم كارەی بە خودا دانانی ئەوان و عیبادەت بۆكردنیان لـە غەیری خودا ناوبرد ، وە ئەمە شەریك بۆ خودا قەراردانە بەبێ خیلاف و جیاوازی .

**سێهەم** : وە هەروەها رحمه الله فەرموویەتی (**فلا فرق بـين جواز شرع الشريعة من إيجاب او تحريم او اباحة بالرأي لم ينص تعالى عليه ولا رسوله وبـين إبطال شريعة شرعها الله على لسان رسوله بالرأي ، والمفرق بـين هذين العملين متحكم بالباطل مفتر وكلاهما كفر لا حفاء به**)[٣٤٨] . واتە جیاوازی نیە لـە بە جائی دانانی یاسایەك كە واجب بكات و حەڵاڵ و حەرام بكات و بە جائیزدانانی بـیربۆچونانێك كە الله عزوجل و پێغەمبەرەكەی باسیان نەكردبـێت ، لـەگەڵ لـەكار خستنی یاسایەك كە كە خوای تعالى دایناوە ، وە هەركەسێك كە جیاوازی بكات لـە نێوان ئەم دوو كارە بكات ئەو بڕیارەكەی پڕوپوچ و درۆیە ، (چونكە) هەردوو كارەكە كوفرە و شتێكی نادیار نیە.

**چوارەم** : وە هەروەها فەرموویەتی (**حَتَّى إِذَا بـيـنَ اللَّهُ تَعَالَى أَنَّهُمْ لَا يُؤْمِنُونَ حَتَّى يُحَكِّمُوا رَسُولَ اللَّهِ ﷺ فِيمَا شَجَرَ بـينَهُمْ، وَجَبَ أَنَّ مَنْ وَقَفَ عَلَى هَذَا قَدِيمًا وَحَدِيثًا، وَإِلَى يَوْمِ الْقِيَامَةِ فَأَبَى وَعَنَدَ فَهُوَ كَافِرٌ**)[٣٤٩]. واتە : تاكو خوای تعالى ئەوەی

---

[٣٤٧] الفصل ٣/ ٢٦٦

[٣٤٨] (الأحكام : ٦/ ٣١

[٣٤٩] المحلى بالآثار : ١٢ / ١٢٩

ڕوونکردۆتەوە کە ئەوانە بڕواناهێنن تاکو پێغەمبەری خوا ﷺ نەکەن بە حەکەم لەنێوان خۆیاندا لە هەرچی کێشە و کار و باری نێوان خۆیاندا هەیە ، هەر کەسێك ئەمەی نەکردبێت یان بیەوێت نەیکات لە داهاتودا ئەوا کافرە.

**پێنجەم** : وە وەڵام ئەو کەسانە دەداتەوە کە ئایەتەکان تأویل دەکەن و ڕووی واتاکەی تێکدەدەن لەبەرژەوەندی هدخۆیان ، هەروەکو فەرموویەتی (**فهذا هو النص لا تحتمل تأويلا ، ولا جاء نص يخرجه عن ظاهره أصلا ، ولا جاء برهان بتخصيصه في بعض وجوه الإيمان**).واتە : (سەبارەت بە ئایەتی ٦٥ سورەتی النساء کة الله ﷻ نەفی بڕوای ئەوانە دەکات کە حوکم بۆلای غەیری ئیسلام دەبەنەوە) ئەوە نەصی قورئانە هیچ تأویل بەلاڕێدا بردنێك هەڵناگرێت ، وە هیچ نەصێکی تر نەهاتووە کە لە زاهیری ئایەتەکە دەریبکات، وە هیچ بەڵگەیەك نەهاتووە کە تایبەتی بکات و بڵێ ئەمە تایبەتە بەهەندێ بەشی ئیمان.

**گوتم** : واتە سەبارەت بەوەی کە مورجیئەکان دەیڵێن ئەوە مەبەستی کامڵ نەبوونی ئیمانە نەك نەمانی ئیمان ، ئەوە ئیمامی ابن حزم وەڵامی ئەوە دەداتەوە و دەفەرمووێ هیچ بەڵگەیەك نەهاتووە کە تایبەتی بکات و بڵێ ئەمە تایبەتە بەهەندێ بەشی ئیمان، کەواتە هۆکاری نەمانی یەکجاری ئیمانە والله اعلى واعلم

## الإمام أبوبكر الجصاص (رحمة الله)

وە هەروەها ئیمامی أبوبکر الجصاص رحمه الله فەرموویەتی : (**مَنْ رَدَّ شَيْئًا مِنْ أَوَامِرِ اللَّهِ تَعَالَى أَوْ أَوَامِرِ رَسُولِهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَهُوَ خَارِجٌ مِنْ الْإِسْلَامِ**)[٣٥٠].

واتە هەرکەسێك تەنها شتێك لە فەرمانەکانی الله ڕەتبکاتەوە و بۆی تەسلیم

---

[٣٥٠] أحكام القرآن لإمام أحمد بن علي أبو بكر الرازي الجصاص الحنفي (المتوفى: ٣٧٠هـ) : ب ٣ / لا ١٨١.

نەبـی ، یان فەرمانەکانی پێغەمبـــەری خوا (صلی الله علیه وسلـم) ئەوا لـە دەرەوەی میلـلــەتی ئیسلامە واتە کافرە (پەنابەخوا).

## الإمام البيضاوي (رحمه الله)

ئیمامی البـیضاوي فەرموویــەتی : (**وفي معناه من يحكم بالباطل ويؤثر لأجله، سمي بذلك لفرط طغيانه أو لتشبهه بالشيطان**)[٣٥١] . واتــــە : لـەواتای (تاغوتدا ئەوەیـــە) کە هەرکەسێك حوکم بە باتڵ بکات ... بۆیــە بەو ناوە ناودەنرێت بەهۆی زێدەڕەوی لـە سنوربەزاندنەکانیاندا ، یان وەکو تەشبـیهێك بە شەیتان) ، واتە چۆن شەیتان سنوری خۆی بەزاند ئەم تاغوتانەیش کە حوکم بە باتڵ دەکەن ئاوا سنوری خۆیان دەبەزێنن وەکو شەیتان .

## الإمام ابن الجوزي (رحمه الله)

ابن الجـوزي رحمه الله لـە تەفســیری ئایەتەکەدا فەرموویەتی : (**ولا يجوز أن يحكم حاكم بغير ما حكم به، وليس لأحد أن يحكم من ذات نفسه فيكون شريكاً لله عزّ وجلّ في حكمه**)[٣٥٢]. واتە : دروست نیــە کە حاکم حوکم بە غەیری ئەوە بکات (کە الله بۆی داناوە) ، وە بۆ هیچ کەسێکیش نیە کە لـە نەفس و بۆچوونی خۆیەوە حوکم بکات ، چونکــە ئەبــیتە (خۆی دەکاتە) شەریکی الله لـە حوکمیدا.

## الإمام شيخ الإسلام أحمد ابن تيمية (رحمه الله)

شەیخی ئیسلام پێشەوای ئەهلی ســوونە ابن تیمیة رحمه الله لـە چەندەها جێگە باسی حوکم بە غەیری قورئان دەکات، لـە زۆر شوێن دەفەرمووێ کوفری بچوکـە، ئائەمەیە کە مورجیئەکانی باسی دەورووژێنن و تەنانەت ئەم وتانەی ابن تیمیة بۆ

---

[٣٥١] أنوار التنزيل وأسرار التأويل لإمام البـيضاوي (المتوفى: ٦٨٥هـ) : ب ٢ / لا ٨١ .

[٣٥٢] زاد المسير في علم التفسير لإمام ابن الجوزي (المتوفى: ٥٩٧هـ) : ب ٥ / لا ١٣١.

بەرگری لە حاکمە تاغوت و خاوەن تەشریع و یاسادانانەکان بەکار دەهێنن، ئائەمە إفترایـە بەسەر ابن تیمیةوە ، چونکە ئەوەی إبن تیمیة رحمه الله دەفەرمووێ کوفری بچوکە ئەوەیە کە حاکمێك لە حاڵەتێکدا لە بابەتێکی معیندا تەرکی حوکمەکە بکات ، بەبێ إستحلال و جحد و تفضیل ، ئائەمەیە شێخی ئیسلام دەفەرمووێ کوفری بچوکە ، وە تەنانەت سەلەفیش ئەمەیان بە کوفری گەورە نەزانیوە ، هاتووە لە ابن عباس وە لە تاوس و عکرمە و عطاء و غەیری ئەوانیش کە فەرموویانە کوفری بچوکە ، ئائەمە ئێمەیش ئیمانمان پێی هەیە و بە کوفری بچوکی دەزانین ، بەڵام شەیخی ئیسلام ابن تیمیة بابەتی دەستکاری کردنی یاسا و تەشریع و یاساگۆڕیندا بە کوفری گەورەی دەزانێت تەنانەت خاوەنەکەی بە کافر دەزانێت ، شەیخی بەرێز دەفەرمووێ :

یەکەم : (**نُسَخُ هذه التوراة مبدلة لا يجوز العمل بما فيها، ومن عمل اليوم بشرائعها المبدلة والمنسوخة فهو كافر**)[٣٥٣]. واتە : ئائەم تەوراتە گۆڕدراوە نەسخ بۆتەوە و دروست نیە کار بەوە بکەیت کە تێیدایە ، وە هەرکەسێك کاری پێبکات بە یاسا گۆڕدراوە مەنسوخەکانی ئەوا کافرە.

دووەم : وە فەرموویەتی (**فمن جعل غير الرسول تجب طاعته في كل ما يأمر به وينهى عنه وإن خالف أمر الله ورسوله، فقد جعله نداً... وهذا من الشرك الذي يدخل أصحابه في قوله تعالى: - ﴿وَمِنَ النَّاسِ مَن يَتَّخِذُ مِن دُونِ اللهِ أَندَاداً يُحِبُّونَهُمْ كَحُبِّ اللهِ وَالَّذِينَ آمَنُواْ أَشَدُّ حُبًّا لِّلّهِ﴾**)[٣٥٤]. واتە : هەرکەسێك کەسێك دابنێت لە غەیری پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم و بە واجبی بزانێت کە گوێرایەڵی هەموو فەرمان و نەهیەکانی بکات ئەگەر چی پێچەوانەی فەرمانی الله تعالى بیت ، ئەوا کردوویەتی بە شەریکی الله عز وجل ، وە ئائەمە لەو شیرکەیە کە خاوەنەکەی دەکاتە ناو ئەو

---

[٣٥٣] مجموع الفتاوى : ٢٠٠/٣٥

[٣٥٤] مجموع الفتاوي ١٠/ ٢٦٧.

کەسانەی کە خوای تعالی دەربارەیان فەرموویەتی ﴿لـەناو خەڵکیدا تاقێك خەڵـك هەن کە هەندێ کەسان ل غەیری الله کردووە بە شەریکی الله ﷻ و خۆشیانیان دەوێ وەکو خۆشەویستیان بۆخوای تعالی ، وە ئەوانەی کە بەڕاستی ئیمانیان هێناوە ئەوا خۆشەویستی تەواوەتیان تەنها بۆ الله تعالی ـە.

**سێیەم** : وە فەرموویەتی (**فكل من خرج عن سنة رسول الله ﷺ وشريعته، فقد أقسم الله بنفسه المقدسة، أنه لا يؤمن حتى يرضى بحكم رسول الله ﷺ في جميع ما شجر بـينهم من أمور الدين أو الدنيا، وحتى لا يبقى في قلوبهم حرج من حكمه**)[355]. واتە : هەرکەسێك لـە سونەت و یاساکەی پێغەمبـەری خوا ﷺ دەرچێـت ، ئەوا خوای تعالی سوێندی بە زاتی پاکی خۆی خواردووە کە بڕوای نیە هەتاکو بە حوکمەکەی پێغەمبـەری خوا ﷺ لـە هەموو بابەتەکان ڕازی نەبـێت ، جا کار و باری دینی بـێت یان دونیای ، هەتاکو وایان لـێدێت کە هیچ پێناخۆش بوونێکیش لـە دڵیاندا نەبـێت .

**چوارەم** : وە تەنانەت شوێنکەوتوانی یاسا دەستکردەکانیش بە کافر ناو دەبات هەروەکو فەرموویەتی : (**ومتى ترك العالم ما علمه من كتاب الله و سنة رسوله ، واتبع حكم الحاكم المخالف لحكم الله و رسوله ، كان مرتدا كافرا يستحق العقوبة في الدنيا و الآخرة**)[356]. واتە : وە هەرکاتێك زانا وازی لـەو عیلـە هێنا کە لـە قورئان و سونەتەوە فێری بووە ، وە چوو شوێنی حوکمی حاکمێك کەوت کە حوکمەکەی پێچەوانەی حوکمی الله تعالی ـە ، ئەوا بەو کارەی هەڵگەڕاوەتەوە و کافرە و شایستەی سزای دونیا و قیامەتە.

**پێنجەم** : وە هەروەها فەرموویەتی : (**الشَّرْعِ الْمُنَزَّلِ مِنْ عِنْدِ اللَّهِ تَعَالَى وَهُوَ الْكِتَابُ وَالسُّنَّةُ الَّذِي بَعَثَ اللَّهُ بِهِ رَسُولَهُ" فَإِنَّ هَذَا الشَّرْعَ لَيْسَ لِأَحَدٍ مِنْ الْخَلْقِ**

---

[355] مجموع الفتاوى ٢٨/ ٤٧١

[356] مجموع الفتاوى / ٣٧٢/٣٥

الْخُرُوجُ عَنْهُ وَلَا يَخْرُجُ عَنْهُ إِلَّا كَافِرٌ)[357]. واته : یاسای دابەزێنراوە لەلایەن الله تعالى ـەوە قورئان و سونەتە کە پێغەمبەرەکەی ﷺ پێنارد ، بەڕاستی ئەم یاسایە بۆ هیچ کەسێك نیە لێی دەربچێت، وە هیچ کەسێکیش لێی دەرناچێت ئیللا کافر نەبێت.

**شەشەم** : وە هەروەها فەرموویەتی (الْحُكْمُ بِمَا أَنْزَلَ اللَّهُ عَلَى مُحَمَّدٍ ﷺ هُوَ عَدْلٌ خَاصٌّ، وَهُوَ أَكْمَلُ أَنْوَاعِ الْعَدْلِ وَأَحْسَنُهَا، وَالْحُكْمُ بِهِ وَاجِبٌ عَلَى النَّبِيِّ ﷺ وَكُلِّ مَنِ اتَّبَعَهُ، وَمَنْ لَمْ يَلْتَزِمْ حُكْمَ اللَّهِ وَرَسُولِهِ فَهُوَ كَافِرٌ)[358] . واته حوکم کردن بەو دینەی کە دابەزی بۆسەر محمد ﷺ ئائەوە دادپەروەریکی تایبەتە و تەواوترین و باشترین دادپەروەرییە ، وە حوکم کردن پێی واجب بووە لەسەر پێغەمبەری خوا ﷺ و هەموو موسڵمانانیش ، وە هەرکەسێك پێوەی پابەند نەبێت ئەوا کافرە.

**حەوتەم** : وە هەروەها فەرموویەتی (وَالْإِنْسَانُ مَتَى حَلَّلَ الْحَرَامَ الْمُجْمَعَ عَلَيْهِ أَوْ حَرَّمَ الْحَلَالَ الْمُجْمَعَ عَلَيْهِ أَوْ بَدَّلَ الشَّرْعَ الْمُجْمَعَ عَلَيْهِ كَانَ كَافِرًا مُرْتَدًّا بِاتِّفَاقِ الْفُقَهَاءِ.)[359]. واته : هەرکاتێك مرۆڤـ حەرامەکانی حەڵاڵکرد و حەڵاڵەکانی حەرامکرد کە إجماعیان لەسەر بوو ، یان یاسایەکی گۆڕی کە إجماعی لەسەربوو ، ئەوا بووە بەکافر و مورتەدد بەیەکدەنگی شەرعناسان.

**هەشتەم** : وە فەرموویەتی (فَمَنْ عَاقَبَ عَلَى فِعْلٍ أَوْ تَرْكٍ بِغَيْرِ أَمْرِ اللَّهِ وَرَسُولِهِ وَشَرَعَ ذَلِكَ دِينًا، فَقَدْ جَعَلَ لِلَّهِ نِدًّا وَلِرَسُولِهِ نَظِيرًا بِمَنْزِلَةِ الْمُشْرِكِينَ الَّذِينَ جَعَلُوا لِلَّهِ أَنْدَادًا، أَوْ بِمَنْزِلَةِ الْمُرْتَدِّينَ الَّذِينَ آمَنُوا بِمُسَيْلِمَةَ الْكَذَّابِ وَهُوَ مِمَّنْ قِيلَ فِيهِ: {أَمْ لَهُمْ شُرَكَاءُ شَرَعُوا لَهُمْ مِنَ الدِّينِ مَا لَمْ يَأْذَنْ بِهِ اللَّهُ})[360] . واته : هەرکەس سزای

---

[357] مجموع الفتاوى : ٢٦٢/١١

[358] منهاج : ١٣١/٥

[359] مجموع الفتاوى : ٢٦٧/٣

[360] الفتاوى الكبرى : ٣٣٩/٦

کەسێك بدات لەسەرکارێك یان نەکردنی کارێك ، بە غەیری ئەو ئەمرەی الله ﷻ و پێغەمبەرەکەی ﷺ ، لەگەڵ ئەوەدا کردی بە دین و بەرنامە ، ئەوا شەریکی بۆ الله قەراردا وەکو ئەو موشریکانەی کە شەریکیان بۆ الله قەراردا ، وەکو ئەو مورتەددانەی کە بڕوایان بە مسلیمە هێنا.

**گوتم** : ئەوەندە وتەکەی ڕوونە (ڕەحمەتی الله لێبێ) هیچ شیکردنەوەیەکی پێویست نیە ، چونکە ئەمڕۆ بەچاوی خۆمان دەبینین.

**نۆیەم** : وە فەرموویەتی (**وَمَعْلُومٌ بِالِاضْطِرَارِ مِنْ دِينِ الْمُسْلِمِينَ وَبِاتِّفَاقِ جَمِيعِ الْمُسْلِمِينَ أَنَّ مَنْ سَوَّغَ اتِّبَاعَ غَيْرِ دِينِ الْإِسْلَامِ أَوْ اتِّبَاعَ شَرِيعَةٍ غَيْرِ شَرِيعَةِ مُحَمَّدٍ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَهُوَ كَافِرٌ وَهُوَ كَكُفْرِ مَنْ آمَنَ بِبَعْضِ الْكِتَابِ وَكَفَرَ بِبَعْضِ الْكِتَابِ**)[٣٦١] واتە : شتێکی ڕوون و زانراوە لە دینی ئیسلام و بەیەکدەنگی هەموو موسڵمانان کە هەرکەسێك ڕێگەبدات بە شوێنکەوتنی دینێك لە غەیری دینی ئیسلام ، یان شوێنکەوتنی یاسایەك لەغەیری یاساکەی محمد (صلی الله علیه وسلم) ، ئائەوە کافرە ، وە کوفرەکەی وەکو ئەوە وایە کە بڕوای بە هەندێ لە قورئان هەیە و کافرە بە هەندێکی تر.

**دەیەم** : وە فەرموویەتی (**الطُّغْيَانُ: مُجَاوَزَةُ الْحَدِّ" وَهُوَ الظُّلْمُ وَالْبَغْيُ. فَالْمَعْبُودُ مِنْ دُونِ اللَّهِ إذَا لَمْ يَكُنْ كَارِهًا لِذَلِكَ: طَاغُوتٌ" وَلِهَذَا سَمَّى النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ الْأَصْنَامَ طَوَاغِيتَ فِي الْحَدِيثِ الصَّحِيحِ لَمَّا قَالَ: ((وَيَتَّبِعُ مَنْ يَعْبُدُ الطَّوَاغِيتَ الطَّوَاغِيتَ)).**

**وَالْمُطَاعُ فِي مَعْصِيَةِ اللَّهِ وَالْمُطَاعُ فِي اتِّبَاعِ غَيْرِ الْهُدَى وَدِينِ الْحَقِّ - سَوَاءٌ كَانَ مَقْبُولًا خَبَرُهُ الْمُخَالِفُ لِكِتَابِ اللَّهِ أَوْ مُطَاعًا أَمْرُهُ الْمُخَالِفُ لِأَمْرِ اللَّهِ - هُوَ طَاغُوتٌ" وَلِهَذَا سُمِّيَ مَنْ تُحُوكِمَ إلَيْهِ مَنْ حَاكَمَ بِغَيْرِ كِتَابِ اللَّهِ طَاغُوتٌ وَسَمَّى اللَّهُ فِرْعَوْنَ وَعَادًا طُغَاةً**)[٣٦٢] واتە : لەداوی ئەوەی باسی تاغوت دەکات پاشان یەك لە

---

[٣٦١] مجموع الفتاوى : ٥٢٤/٢٨

[٣٦٢] مجموع الفتاوى : ٢٠١/٢٨

جۆرەکانی تاغوت : کە گوێڕایەڵی دەکرێت لە شتێکدا کە سەرپێچی الله ، یان گوڕایەڵی بکرێت لە شوێنکەتنی غەیری ڕێباز و دینی ڕاست و دروست ، جا إگاعە بکرێن یان نا ئەوا تاغوتە ، بۆیە لەبەر ئەمە ناونراوە (بەتاغوت) چونکە حوکمی بۆلابراوەتەوە بۆلای حاکم بەغەیری قورئان کە تاغوتە ..

## الإمام الحافظ إبن القيم (رحمه الله)

ئیمامی إبن القیم رَحِمَهُ اللَّهُ دەفەرمووێ : (**ثم أخبر سبحانه أن من تحاكم أو حاكم إلى غير ما جاء به الرسول، فقد حكّم الطاغوتن وتحاكم إليه، يعني: الآيات في النساء: ﴿أَلَمْ تَرَ إِلَى الَّذِينَ يَزْعُمُونَ أَنَّهُمْ آمَنُوا بِمَا أُنْزِلَ إِلَيْكَ وَمَا أُنْزِلَ مِنْ قَبْلِكَ يُرِيدُونَ أَنْ يَتَحَاكَمُوا إِلَى الطَّاغُوتِ وَقَدْ أُمِرُوا أَنْ يَكْفُرُوا بِهِ﴾[٣٦٣]، قال: والطاغوت: كل ما تجاوز به العبد حده، من معبود أو متبوع أو مطاع" فطاغوت كل قوم: من يتحاكمون إليه غير الله ورسوله، أو يتبعونه على غير بصيرة من الله، أو يطيعونه فيما لا يعلمون أنه طاعة لله. فهذه طواغيت العالم، إذا تأملتها، وتأملت أحوال الناس معها، رأيت أكثرهم ممن أعرض عن طاعة الله ومتابعة رسوله، إلى طاعة الطاغوت ومتابعته**)[٣٦٤]. واتە : پاشان الله تعالى هەواڵ دەدات کە هەرکەسێك حوکم بباتەوە یان حوکمبکات بە غەیری ئەو دین و یاسایەی کە پێغەمبەری ﷺ پێی هات ، ئەوا بەڕاستی تاغوتی کردووە بە تاغوت و حوکمی بۆلای ئەو بردۆتەوە (پاشان باسی ئایەتی (٦٠) لە سورەتی النساء دەکات کە پێشتر ڕوونمان کردووە).

**پاشان دەفەرمووێ:** وەتاغوتیش هەموو شتێکە کەبەندە لەسنوری خۆی دەریبکات وزیادەڕوی تێدابکات لەپەرستراو وشوێنکەوتن وگوێڕایەڵــی بۆ کردن

---

[٣٦٣] (سورة النساء / ٦٠)

[٣٦٤] الرسائل الشخصية (مطبوع ضمن مؤلفات الشيخ محمد بن عبد الوهاب، الجزء السادس) / ٣٠٤

وە زانایان لـەم بابەتەدا خیلافیان هەیە :

وتراوە: هەموو ئەم وەصفانە بۆ یەك مەبەست و وەصفە (کە کافرە) ، چونکە کافر زاڵمیشە ، هەروەکو الله تعالى فەرموویەتی : ﴿بەڕاستی کافران ستەمکارن﴾، وە فاسق و سنور بەزێنیش (کافرن) ، هەروەکو الله تعالى فەرموویەتی : ﴿وە ئەوانەی کە سنوریان بەزاند و بڕیاری الله تعالى ـیان شکاند ئەکرێنە ناو ئاگرەوە﴾، واتە کافرن .

وە لـە زانایانیش هەبووە کە وتویەتی : ئەم وەصفانە بۆ چەند بەشێکە ، کە ئەمە بۆچوونی بەهێزە (واتا شێخ لـەسەر ئەم ڕەئیەیە).

**حاکم لـەسێ حاڵـەتدا دەبـێت بە کافر :**

**یەکەم** : ئەگەر پێی وابـیت کە دروستە حوکم بە غەیری قورئان بکات (ئەوا کافرە) ، بە بەڵگەی وتەی الله تعالى : ﴿**أفحكم الجاهلية يبغون**﴾، بۆیە هەموو ئەوەی پێچەوانەی حوکمی الله ـیە ، ئەوا ئەوە حوکمی جاهیلیە ، بەبەڵگەی ئیجماعی بڕواە کە دروست نیە حوکم بەغیری قورئان (بکرێت) ، بۆیە ئەوانەی حوکمی غەیری قورئان حەڵاڵ دەکەن کە پێچەوانەی ئیجماعی هەموو موسڵمانان بـیت ، ئائەمە کافرە و مورتەددە ، وەکو ئەوەی پێی وابـیت زینا یان عەرەق حەڵاڵە ، یان نان و ماست حەرامن.

**دووەم** : ئەگەر پێی وابـیت غەیری حوکمی الله ـیش وەکو حوکمی خوای تعالى وایە.

**سێیەم** : ئەگەر پێی وابـیت کە حوکمی غەیری قورئان باشترە لـە حوکمی قورئان ، (کافرە) بەو بەڵگەیەی الله تعالى فەرموویەتی ﴿**ومن أحسن من الله حكما لقوم يوقنون**﴾[٤٢٦].

**وە حاکم دەبن بە زاڵم** : ئەگە پێی وابـیت کە باشترین حوکم حوکمی الله

[٤٢٦] (سورة المائدة / ٥٠)

تعالی ــیە ، وە هەر ئەو حوکمەیش باشترینە بۆ خەڵك و وڵاتیش ، وە پێی وایە کە واجبە حوکمی پێبکرێت  بەڵام کەسێك دەهێنن بۆڵای کە ڕقی لێیەتی و دەیەوێ ستەمی لێبکات ، ئەمیش ستەمی لێدەکات و لەو کاتەدا حوکم بە قورئان ناکات ، ئەمە کافر نین و زاڵمن.

**وە دەبــیت بە فاسقیش:** ئەگەر حوکم کردنەکەی بە غەیری قورئان بە هۆی هەواوئارەزوویەوە بوو ، لەگەڵ ئەوەیشدا پێی وایە حوکمی قورئان ڕاست و دروسترین یاسایە ، ... پاشان دەفەرمووێ وەکو ئەوەی حوکم بۆ کەسێك دەدات (کارێکی بۆ جێبەجێ دەکات) بۆ ڕیشوەیەك ، یان کەسێکی نزیکیەتی یان هاوڕێەتی ، (واتا لەبابەتێکی دیاری کراو بــیت و جارێك یان چوند جارێك بــیت بەبێ لادانی یاسا)، ئەمەیش کافر نیە و فاسقە بە کورتی.

**بەڵام بە نسبەت ئەوەی کە یاسا دادەنێت** و دەیشزانێت کە ئەم یاسایە حوکمی الله نیە و دەزانێت یاسای الله شتێکی ترە و دەیشزانێ کە ئەم یاسایەی خۆی پێچەوانەی یاسای الله تعالی ــییە ، ئائەمە یاسای خوای گۆڕیوە بۆ ئەم یاسایە ، ئائەمە کافرە.

**دووەم** : وە فەرموویەتی : (**فإذا وجد قوم يتبعون القوانين الوضعية المخالفة للشريعة الإسلامية مع علمهم بمخالفتها للشريعة فإننا نقول: هؤلاء قوم مشركون لأنهم اتخذوا حاكما يحكم بــين الخلق غير الله**)[427]. واتە :خۆ ئەگەر قەومێك هەبوون شوێنی یاسادەستکردەکان دەکەوتن کە پێچەوانەی یاسای ئیسلامن، لەگەڵ ئەوەیشدا دەزانن کە ئەم یاسایە پێچەوانەی یاساکەی الله تعالی ــیە، ئەوا ئێمە دەڵێین : ئائەو قەومە موشریکن لەبەر ئەوەی کە کەسێکیان کردووە بە حاکمی خۆیان کە حوکم دەکات لەنێوان خەڵکی بەغەیری حوکمەکەی الله ﷻ.

---

[427] مجموع فتاوى ورسائل فضيلة الشيخ محمد بن صالح العثيمين : ٢٨٥/٧

**سێیەم وەرن مەدخەلیەکان بزانن شێخەکەتان دەڵێ چی؟** : (**ولهذا نرى أن الذين يضعون قوانين تخالف الشريعة ليحكم فيها بين عباد الله وفي عباد الله، نرى أنهم على خطر عظيم، سواء حكموا أو لم يحكموا، ونرى فرقاً بين شخص يضع قانوناً يخالف الشريعة ليحكم الناس به، وشخصٍ آخر يحكم في قضية معينة بغير ما أنزل الله" لأن من وضع قانوناً ليسير الناس عليه، وهو يعلم مخالفته للشريعة، ولكنه أراد أن يكون الناس عليه" فهذا كافر، ولكن من حكم في مسألة معينة يعلم فيها حكم الله، ولكن لهوىً في نفسه" فهذا ظالم أو فاسق، وكفره إن وصف بالكفر، فكفر دون كفر**)[428] واته : دەبینین جیاوازی هەیە لە نێوان کەسێك کە یاسایەك دادەنێت کە پێچەوانەی یاسای الله ﷻ یە و لەنێوان خەڵکی حوکمی پێدەکات ، وە لەنێوان کەسێك کە لە بابەتێکی دیاری کرا و حوکم بە قورئان ناکات ، لەبەر ئەوەی کە هەرکەسێك یاسایەك دابنێت بۆ ئەوەی خەڵکی لەسەری بن ، وە باشیش دەزانێت کە حوکمەکەی پێچەوانەی یاسای ئیسلامە ، بەڵام دەیەوەێ خەڵك لەسەری بێت ، ئائەمە کافرە ، بەڵام هەرکەسێك حوکم بەغەیری قورئان بکات لە بابەتێکی دیاری کراو کە حوکمەکەی خوایش دەزانێت ، بەڵام لەبەر هەواو ئارەزوو حوکم بە غەیری قورئان دەکات ، ئائەمە زاڵم یان فاسقە ، وە کوفرەکەیشی کوفری بچوکە.

## صالح بن فوزان الفوزان

وە صالح الفوزان خوای تعالى هیدایەتی ئێمە و ئەویش بدات کە بێ گومان کەسێکی شارەزا و دیارە لەم سەردەمە ، لە زۆر شوێن بەهەمان شێوە حوکم بە غەیری قورئان بە کوفـــری بچوک ناودەبات و خاوەنەکەی بە کافرنازانێت و بە کفر دون کفر ناویدەبات، بەڵام کاتێك دێتە سەر یاسادەستکردەکان ئەوا بە کافر

[428] لقاء الباب المفتوح للشيخ محمد بن صالح العثيمين : ٦/٢٩

و تاغوت ناويان دەبات و ڕوونی دەکاتەوە کە لـەم حاڵـەتەدا کفر دون کفر ناگرێتەوە ، هەروەکو وتوويەتی : (**منهم الحكام الذين يسنون القوانين و يلغون الشريعة و يجعلون القوانين محلها ، هؤلاء طواغيت ، الذي يحكم بغير ما أنزل الله ، هذا طاغوت بنص القرآن ﴿يريدون أن يتحاكموا إلى الطاغوت وقد أمروا أن يكفروا به﴾**[429] **، فمن حكم بغير ما أنزل الله متعمدا ذالك فإنه يكون طاغوتا. أما من حكم بغير ما أنزل الله مجتهدا يتحرى الحق ولكنه أخطأ ، فهاذا ليس طاغوتا)**[430]. واتە : هەيشيانە لـە دەسەڵاتداران کە ياسادادەنێن و ياسای الله ﷻ لادەدەن و لـەوڵات و بڕيارەکانی هەڵدەوەشێننەوە و ياساکەی خۆيان لـەجێگاکەی دادەنێنەوە ، ئائەوانە تاغوتن ، ئەوەی حوکم دەکات بە غەيری قورئان تاغوتە بە نەصی (دەق) ـی قورئان ، ﴿دەيانەوێ حوکم بۆلای تاغوتان ببەنەوە لـە کاتێکدا کە فەرمانيان پێکرابوو کە کوفری پێبەك و پشتی لـێبکەن﴾ ، هەرکەسێك حوکم بە غەيری قورئان بکات بە ئارەزووی خۆی ئابەوە دەبـيت بە تاغوت.

بەڵام ئەوەی حوکم بە غەيری قورئان دەکات بەڵان بە إجتهاد (واتە خۆی وادەزانێت ئەمە حوکمی خوايە بەڵام هەڵـەدەکات) حەقی دەوێ بەڵام هەڵـەدەکات ، ئائەمە تاغوت نيە.

**پاشان دەڵێت** : (**إنما الطاغوت الذي تعمد مخالفـة الشـرع ، و تعمد الحكم بغير ما أنزل الله ، يجلب القوانين و المحاكم القانونية يجعلها محل الشريعة ، هذا لاشك أنه طاغوت ، ليس طاغوتا عاديا بل من رءوس الطواغيت الخمسة**)، واتە : بەڕستی تاغوت ئەوەيە کە بە مەبەستيەتی پێچەوانەی ياسای ئيسلام بکات ، وەخۆی ياسائامادەدەکات و دەينوسێتەوە لـە شوێنی ياساکەی الله ﷻ دايدەنات ، هيچ

---

[429] سورة النساء / ٦٠

[430] شرح معنى الطاغوت / ٩ (دارالمأثور)

گومانی تێدا نیە کە ئەمە تاغوتە ، تاغوتێکی ئاسای نیە بەڵکو لە گەورەکانی پێنج تاغوتەکەیە.

**سێیەم** : وە پرسیاری لێدەکرێت و پێی دەگوترێ : (**هناك من ينسب هذا التراجع عن تكفير من ينجي الشريعة إلى فضيلتكم؟**) واتە : هەیە کە باس لەوەدەکات کە ئەو پەشیمان بوونەوەیە دەداتە پاڵ ئێوە لە تەکفیری ئەوانەی کە لە یاسای ئیسلام دەردەچن؟.

الفوزان وەڵامێکی زۆر جوان دەداتەوە و دەڵێت : (**نبرأ إلى الله من ذالك ، نحن لا نتراجع عن تكفير من كفره الله ورسوله ، وكذبوا علينا فحسابهم على الله ، أنا أعلم أنه يوجد مرجئة يريدون ألا يكفر أحد**)[431]. واتە پاکی بۆ الله ، ئێمە لە تەکقیری کەسێك پەشیمان نابینەوە کە الله و پێغەمبەرەکەی (صلی الله علیەوسلم تەکفیریان کردبێت ...

## عبدالعزيز بن عبدالله بن باز

شێخ بن باز لە زۆر شوێندا وەکو پێشی خۆی حوکم کردن بە غەیری قورئان بە کوفری بچوك ناودەبات ، بەڵام بە هەمان شێوە کاتێك قسە و باس دێتە سەر تەشریع و تبدیل و یاسانوسینەوە ئەوا زۆر بە توندی لەبارەیانەوە قسە دەکات ، بەڵام لێرە تەنها یەك نمونە باس دەکەین ، شێخ بن باز لە تعلیقی لەسەر فتح المجيد دەفەرمووێ : (**الذي يستخلص من كلام السف رضي الله عنهم : أن الطاغوت كل ما صرف العبد و صده عن عبادة الله ، وإخلاص الدين و الطاعة لله و لرسوله ، سواء في ذالك الشيطان من الجن و الشيطان من الإنس ، والأشجار و الأحجار و غيرها**) . واتە : تاغوت هەموو ئەوەیە کە بەندە لادات لە پەرستنی الله و ڕاگرتنی

[431] شرح رسالة الدلائل في حكم موالات أهل الإشراك – الفتاوى المنتقاة من أجوبة فضيلة الشيخ ... / لا ٢١١

به تەوحید و ئیخلاصەوە و گوێڕایەڵی کردنی خوا و پێغەمبەرەکەی ﷺ ، جا شەیتانی ئینس بێت جن یان داروبەرد بێت یان غەیری ئەوانیش..

**پاشان دەفەرمووێ** : (**ويدخل في ذالك بلا شك : الحكم بالقوانين الأجنبية عن الإسلام و شرائعه و غيرها من كل ما وضعه الإنسان ليحكم به في الدماء و الفروج و الأموال ، و ليبطل بها شرائع الله، من إقامة الحدود و تحريم الربا و الزنا و الخمر و نحو ذالك ، مما أخذت هذه القوانين تحللها و تحريمها بنفوذها ومنفذها ، و القوانين نفسها طواغيت ، وواضعوها ومروجوها طواغيت ، و أمثالها من كل كتاب وضهه العقل البشري ليصرف عن الحق الذي جاء به رسول الله (صلى الله عليه وسلم) إما قصداً أو عن غير قصد من واضعه فهو طاغوت**)[٤٣٢].واته : هەر لەم پێناسەیا بەبێ گومان ئەوەمەیش جێگای دەبێتەوە :حوکمکردن بە یاسا ئەورووپیەکان لەسەر ئیسلام و یاساکانی ، وە غەیری ئەو یاسایانەیش لە هەموو ئەو یاسایانەی کە مرۆڤەکان دایدەنێن بۆ ئەوەی لە بابەتەکانی خوێن و فروج و ماڵ و سامانی دونیا حوکمی پێبکەن ، بۆ ئەوەی یاساکانی الله هەڵبوەشێننەوە لە جێبەجێ کردنی حەددەکان و حەرامکردنی ڕیبا و زینا و عەرەق و هاوشێوەکانی ئەم تاوانانە ... هتد. ئەم یاسایانە خودی خۆیان تاغوتن ، وە دانەرەکەیشی تاغوتە ، وە هاوشێوەکانی ئەم یاسایانەیش لە هەموو ئەو کتابانەی کە کە عەقڵی بەندەکان دایاننابێت بۆ ئەوەی حەقی پێلابدرێت جا بە هەرمەبەستێك

بێت ئەوا هەر تاغوتە .ئەمە وتەی زانایانە کە بەم شێوازە لە بابەتەکە حاڵی بوونە ، وە بابەتی حوکم کردن بە یاسا دەستکردەکان و گەڕانەوەی حوکم پێیا و ڕازی بوون پێیان بە کوفر و شیرك و نیفاقی گەورەناودەبەن و خاوەنەکەی بە کافر دەزانن (والله المستعان) ..

---

[٤٣٢]تعليق الشيخ ابن باز على كتاب (فتح المجيد / ٢٤٣) طبعة مؤسسة الريان

## وتەی بەشێکی تر لە زانایان کە لەکتابی (الدرر السنیە) هاتووە

ئیمامی عبدالرحمن بن قاسم النجدی لە کتابە بەسوودەکەی خۆی (الدرر السنية) بەرگی (١٦) ی تەرخان کردووە بە ئاگادارکردنەوەی موسڵمانان لەم یاسادەستکردانە ، وەمن ئامۆژگاری هەموو خوێنەران دەکەن کە لانی کەم بەرگی (١٦) هەموو بخوێننەوە ، جا لە نامەیەکی پڕ گەوهەر کە بۆمانقلّدەکات کە فتوای هەریەك لە زانایان (محمد بن إبراهيم، وعبد العزيز الشثري، وعبد اللطيف بن ابراهيم، وعمر بن حسن، وعبد العزيز بن باز، وعبد الله بن حميد، وعبد الله بن عقيل، وعبد العزيز بن رشيد، وعبد اللطيف بن محمد، ومحمد بن عودة، ومحمد بن مهيزع) کە پێکەوە لە دەستەی فتوابوونە و لە نامەکەدا دەفەرموون : (**إن من أقبح السيئات وأعظم المنكرات: التحاكم إلى غير شريعة الله، من القوانين الوضعية، والنظم البشرية وعادات الأسلاف والأجداد، التي قد وقع فيها الكثير من الناس اليوم، وارتضاها بدلا من شريعة الله التي بعث بها رسوله محمد صلى الله عليه وسلم. ولا ريب أن ذلك من أعظم النفاق، ومن أكبر شعائر الكفر والظلم والفسوق**).واتە بەڕاستی یەکێك لە پیسترین و گەورەترین تاوان و خراپکارییەکان بریتیە لە گەڕانەوەی حوکم بۆلای غەیری یاسای الله ﷻ ، لە یاسادەستکردەکان وە عادات و نەریتەکانی پێشین و باب و باپیرانیان کە ئەمڕۆ خەڵکێکی زۆر تێیکەوتن و پێی ڕازین لەجێی لە یاسای الله ﷻ کە ناردی بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ ، وە گومانی تێدانیە کە ئەمە لە گەورەترینی مونافیقیە وە لە گەورەترینی شعائیرە کوفر و زوڵم و فیسقیەکانە.

**پاشان دەفەرموون** : (**وهذا تحذير شديد من الله ﷻ لجميع العباد، من الإعراض عن كتابه وسنة رسوله ﷺ، والتحاكم إلى غيرهما، وحكم صريح من الرب عز وجل على من حكم بغير شريعته، بأنه كافر وظالم وفاسق..**)[433]. واتە ئەمە

[433] الدرر السنية في الأجوبة النجدية : ١٦/٢٢٥

ئاگادارکردنەوەیەکی ترسناکە لە خوای تعالى ـوە بۆ سەرجەم بەندەکان ، لە پشتهەڵکردن لە کتاب و سونەت و بردنەوەی حوکم بۆلای غەیری قورئان و سونەت ، وە ئەمە حوکمدانێکی ڕوونە لەلایەن الله ـوە لەسەر هەرکەسێك کە حوکم بەغەیری یاساکەی بکات ، کە ئەوانە کافر زاڵم و فاسقن .

**وە وتەی زۆرێکی تر لە زانایان ماوە**: کە هەمان بڕوایان هەیە ، لەوانە : شێخی محدث عبدالله بن عبدالرحمن السعد وە د.ماهر الفحل وە شێخ عبدالله الغنیمان وە شێخ خالد الحایك وە شێخ ناصر الفهد وە غەیری ئەمانیش لە زانایان و محدثین ڕەحمەتی الله تعالى ـیان لێبێت ، وتەکانیان ماوە هەم لە یوتیوب هەمیش لە کتاب و بەرهەمەکانی خۆیان ، دەتوانن بۆیان بگەڕێنەوە.

## وەڵامی گومان و شوبهەكان لەم بارەوە

دیارە ئەهلی زەیغ و بەدیاری كراوی مەدخەلی و بەناوئیسلامییە دیموكراسی خوازەكان ئەم هەموو بەڵگەیە لە قورئان و لە سونەت و لە یەكدەنگی زانایان ڕتدەكەنەوە لە بارەی كافر بوونی حاكمێك كە تەشریع بكات و دەستە پیسەكانی بۆ یاساكانی الله تعالی دەبات و بە ئارەزووی خۆی دەیانگۆڕێت ، ولله الحمد و المنه شوبهەكان هیچیان ئەوە نین كە بتوانن بەرامبـەری ئەو هەموو بەڵگەیە بگرن ، بۆیە الله تعالی ئاسانی بكات یەك یەكی ئەو شوبهانە دەهێنین و وەڵامی هەمووی دەدەینەوە :ئەو شوبهانە كە ئەم جەهمیانە دەستیان پێوەگرتووە چەند خاڵێكن ،لـەوانە:

١ – ڕیوایەتی كفر دون كفر .

٢– وتەی بەشێك لـە زانایان و تأویلـكردنێكی سەقەت بۆ مەبەستەكانیان .

٣– ئەم ئایەتانە باسی كاملْ نەبوونی ئیمان دەكەن نەك نەمانی .

٤– حاكمیەت تەوحید نیە (پەنابە الله) .

٥– جحد و إستحلال و تفضیل .

٦– ئەوانە وەلی ئەمری شەرعین !.

٧– یوسف پێغەمبـەر حوكمی بە حوكمی خوا نەكرد (پەنابەخوا).

٨– نەجاشی حوكمی بە قورئان نەكرد .

٩– جەهمییەكانی سەردەم (حكم بغير ما أنزل الله) و (فعل بغير ما أنزل الله) بەهۆی جەهلـەوە تێكەلْ بەیەك دەكەن .

١٠– پێغەمبەری خوا ﷺ حوكمی بە تەوراِت كرد .! وە غەیری ئەم شوبهانەیش ..

**ئیمامی الدارقطني** رحمه الله دەفەرمووێ : حَدَّثَنَا أَحْمَدُ بْنُ مُحَمَّدِ بْنِ سَعِيدٍ ، ثنا إِبْرَاهِيمُ بْنُ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ مُحَمَّدِ بْنِ سَالِمٍ السَّلُولِيُّ أَبُو سَالِمٍ ، قَالَ: سَمِعْتُ أَبِي ، قَالَ:

سَمِعْتُ وَكِيعًا ، يَقُولُ: «**أَهْلُ الْعِلْمِ يَكْتُبُونَ مَا لَهُمْ وَمَا عَلَيْهِمْ ، وَأَهْلُ الْأَهْوَاءِ لَا يَكْتُبُونَ إِلَّا مَا لَهُمْ**»[٤٣٤] . ئیمامی وکیع بن جراح فەرموویەتی : ئەهلی عیلم (ئەهلی سونە) هەموو ئەوانە دەنوسن کە بەڵگەبێت بۆیان یان لەسەریان ، بەڵام ئەهلی ئەهوا (بدع) تەنها ئەوانە دەنوسن و باسی دەکەن کە بەڵگەیە بۆیان .

**گوتم** : ئێمەیش الحمدالله خۆمان بە شوێنکەوتەی سەلەف و ئەهلی سونە دەزانین ، بۆیە بیٚ منەتیشین لە هەر شوبهەیەك کە ئەهلی بدع بیهێنێت ، بە پشتیوانی الله ﷺ هەمووی باس دەکەین بەو شێوازەی ئەهلی بیدع لێی تێگەیشتوون ، پاشان وەڵامی هەمووی دەدەینەوە و ولا نبالي.

[٤٣٤] سنن الدارقطني / ر.٣٦

## شوبهەی یەکەم : (مەسەلەی کوفر دون کفر)

ئەم شوبهەیە زیاتر مەدخەلییەکان دەیورووژێنن ، دەڵێن :

ڕاستە خوا ﷻ فەرموویەتی کافرن ، بەڵام ابن عباس فەرموویەتی ئەوە کوفری بچوکە مادام استحلالی نەکردووە، یان تفضیل ناکات، یان جحدی نەکردووە ، خۆ ئەگەر ئەم سێ حاڵەتە نەبوو ئەوا کوفری بچووکە ، ئەمە ابن عباس و تابعینیش وتویانە.

**گوتم** : هیچ نکۆڵی لەوە ناکرێت کە (کفر دون کفر) لای ئەهلی سوونە و بەتایبەتتر ئەم مصطلحە لەلای سەلەف باو بووە و لێوەیان هاتووە ، وە ئێمەیش وەکو شوێنکەتەی سەلەف بڕوامان بە کفر دون کفر هەیە ، بەڵام کێشەی گەورە و هۆکاری خنکانی نەزانانداا لەم بابەتە ، شارەزانەبوون و نەزانینی مفهوم و مەبەستی کوفر دون کفرە لەلای سەلەف ، تەنانەت ورد نەبوونەوە لە سەنەدەکەیشی.

بەداخەوە کەسانێك ئەو هەموو ئایەت و بەڵگەیە ڕەتدەکاتەوە بەهۆی چەند ریوایەتێك، وە پشت لە إجماعی ئەهلی سوونە کە لەسەر ئەساسی دەقە قورئانییەکان بنیاتنراون ڕەتدەکاتەوە و ئەوەی خۆی پێی خۆشە یان دەبێتە هۆی پارێزراوی ماڵ و مووچەکەی یان ڕازی کردنی وەلی ئەمرەکەی تأویلێکی فاسد بۆ کوفر دون کوفر دەکات ، وە بۆ ئەو مەبەستە بەکاری ناهێنێ کە سەلەف بەکاریان هێنا ، ئەمیش خنکان لە دونیا و قیامەتی بۆ دێنێتە پێش ، خوای تعالى پارێزراومان بکات .

## کفر دون کفر

کوفر دون کوفر واتە : کوفرێك کە کوفری بچوك بێت و خاوەنەکەی پێی کافر نەبێت، کوفرێك کە لەخوار کوفری گەورە بێت، وەکو چەسپاوە لە خۆشەویستامنەوە ﷺ کە فەرموویەتی ((شیوەنکردن بەسەر مردوو یان دەمووچاو

هەڵدرِین یان سنگ کوتان کوفرە)) هەروەکو لـە حدیسەکەی ابن مسعود لـەلای البخاری و غەیری ئەویش.

بەڵام کوفرە کفر دون کفرە و کوفری گەورە نیە کە خاوەنەکەی لـە بازنگەی ئیسلامەتی بباتە دەرەوە .

وە رِیوایەت کراوە لـە ئیمام و حەبری ئومەت ابن عباس ﵄ ئامۆزای خۆشەویستمان و ﷺ کە فەرموویانە حوکم کردن بە غەیری قورئان کوفر دون کوفرە واتە کوفری بچوکە ! .

ئایا رِاستە وای فەرمووە ؟ ئایا ئەگەر وای وتبیت مەبەستی چیبووە ؟ ، ئایا ئەوەی ئەو باسی فەرموو یاسادەستکردەکان دەگریتەوە ؟ ئایا دەتکریتە ئەو هەموو ئایەتە پشتگوێ بخەین و پینە بۆ ئەو هەموو تاغوتە مل پانە بکەین گوایە ابن عباس ﵄ وتویەتی کوفری بچوکە ؟

**لـەوەڵامدا دەڵێین** : وەڵامی ئەم پرسیارە تفصیلی دەوێت و ناکرێت بە مجملی باس بکرێت ، سەرەتا سەیرێکی سەنەدەکەی دەکەین بزانین ئایا دەگاتە پلـەیەك کە بتوانرێت بوترێت ابن عباس وای وتووە ؟

## سەنەدەی ئەسەرەکە

**رِێگەی یەکەم** : **هشام لـەطاوس لـە ابن عباسەوە :**

ئیمامی الحافظ أبوعبدالله الحاکم رِیوایەتی کردووە و دەفەرمووێ : (أَخْبَرَنَا أَحْمَدُ بْنُ سُلَيْمَانَ الْمَوْصِلِيُّ ، حَدَّثَنَا عَلِيُّ بْنُ حَرْبٍ ، حَدَّثَنَا سُفْيَانُ بْنُ عُيَيْنَةَ ، عَنْ هِشَامِ بْنِ حُجَيْرٍ ، عَنْ طَاوُسٍ ، قَالَ : قَالَ ابْنُ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا : إِنَّهُ لَيْسَ بِالْكُفْرِ الَّذِي يَذْهَبُونَ إِلَيْهِ إِنَّهُ لَيْسَ كُفْرًا يَنْقِلُ عَنِ الْمِلَّةِ ﴿وَمَنْ لَمْ يَحْكُمْ بِمَا أَنْزَلَ اللَّهُ فَأُولَئِكَ هُمُ الْكَافِرُونَ﴾[٤٣٥] كُفْرٌ دُونَ كُفْرٍ)[٤٣٦]. واتـە : أحمد کورِی سلیمان الموصلی هەواڵی

---

[٤٣٥](سورة المائدة /٤٤)

[٤٣٦]المستدرك / ٣٢١٩

پێدام ، علي كوڕی حرب بۆی باسكردين ، سفيانی كوڕی عيينه بۆی باسكردين ، له هيشامی كوڕی حجيرەوه له طاوسی كوڕی كيسانەوه ابن عباسەوه كه فەرموويەتی : (حوكم كردن به غەيری قورئان) ئەوه ئەو كوفره نيه كه ئێوه بۆی دەچن ، ئەوه كوفرێك نيه خاوەنەكەی پێی كافر ببيت ، ﴿وَمَنْ لَمْ يَحْكُمْ بِمَا أَنْزَلَ اللَّهُ فَأُولَئِكَ هُمُ الْكَافِرُونَ﴾ ، كوفر دونه كوفره .

وه ئيمامی ابن أبي حاتم[437] هەمان ڕێگەی نقلكردووه بەڵام ئەم له ڕێگەی محمد كوڕی عبدالله المقرى له سفيانەوه له هشام له طاوس له ابن عباس ديسان موقوفا.

## ئەم ڕێگايه بەهێز نيه و معلوله به دووعيلله:

**يەكەم** : لاوازی هيشامی كوڕی حجير المكی ، پياوێكی خواناس و ڕاست گۆبوو، وه زانايان وەسفی دەكەن ،ساڵی (١٢١ – ١٣٠) وەفاتی كردووه . بەڵام له بارەی فەرموودە و ڕيوايەتەوه ناگات به پلەی بەهێز .

**ئيمامی يحيى بن سعيد القطان** رحمه الله**:** ئيمامی ابن المديني رحمه الله دەفەرمووێ : فەرموودەيەكم خوێندەوه له خزمەتی يحيى ـداكه هيشامی كوڕی حجير له سەنەدەكەيدا هەبوو ، وتم **ئايا زەرب بينم بەسەر ڕيوايەتەكەيدا ، ئيمامی يحيى فەرمووی بەڵێ**[438] .

**ئيمامی يحيى بن معين** رحمه الله **:** وه ئيمامی عبدالله بن أحمد پرسيار له ئيمامی ابن معين دەكات و ئەويش دەفەرمووێ **زۆر لاوازه**[439] .

**ئيمامی أحمد بن حنبل** رحمه الله : ئيمامی عبدالله بن أحمد دەفەرمووێ : باوكم دەربارەی هيشام فەرمووی **بەهێز نيه** ، وتم ئەی لاوازه ؟ فەرمووی **بەو شێوازەيش**

---

[437] ر. ٦٤٣٤

[438] الكامل في ضعفاء الرجال : ٦/٢١٠

[439] من تكلم فيه وهو موثوق أو صالح الحديث بتحقيق عبدالله الرحيلي/ ٥٢٢ و التعديل والتجريح لمن خرج عنه البخاري في الجامع الصحيح : ٣/١٣٣١

**نيه** . پاشان عبدالله دەفەرمووێ : پرسیاریشم لـه ئیمامی ابن معین کرد و ئەویش فەرمووی **زۆر لاوازە** .[440].

وە هەر عبدالله دەفەرمووێ : باوکم (واتە ئیمامی أحمد) وتی : هیشام ضعیفه (لاوازە) .[441]

وە فەرموویەتی : هشام فەرموودەکانی لاوازە[442].

**ئیمام سفیان بن عیینة** ﵀ دەفەرمووێ : **هیچ ڕیوایەتێکمان لـه هشام وەرنەگرتووە ئیللا مەگەر لـه یەکێکی تریشمان وەرگرتبـیت**[443] . (واتە هیشام ئەوە نیە بگات بە صحیح.)

**ئیمامی الذهبـي دەفەرمووێ** : هیشام خەڵکی مەککەیە و مامۆستای ابن جریجە و ابن معین و ئیمامی أحمد بە لاوازیان داناوە.[444]

لـه بەرامبـەریشدا بەشێك لـه زانایان لـەوانە : ابن حجر و العجلی و إسحاق بن منصور و ابن شبرمه و ابن سعد و غەیری ئەوانیش دەفەرموون باشـــه یان هەندێك دەفەرموون سیقەیە .

**گوتم**: وتەی زانایـــانی سەرەتا کە تجریحی هیشامیان کرد بەهێزترە لـەوانەی کە دەفەرموون باشە ، وە ئەوان بـێگومان پلەبڵنترینی زانایانی جەرح و تەعدیلن، ئیمامی أبن معین و أحمد و ابن القطان و علی المدینی و ابن عیینه و غەیری ئەمانیش، بۆیـــه بـێگومان جەرحەکانی ئەوان بەهێزترە لـه تعدیلی ابن شبرمه و إسحاق و العجلی هەرچەندە ئەمان مەشهورە کە متساهلن لـه بارەی جەرح و تەعدیل، بۆیــه پشت بە وتەکانیان نابەسترێت ، هەرچەندە ئەوانیش نەیاونوت

[440] الجرح والتعديل : ٩/٥٤ .

[441] موسوعة أقوال الإمام أحمد بن حنبل في رجال الحديث وعلله / ر ٣٣٧٠

[442] **العلل ومعرفة الرجال: ٤٠١/١**

[443] إكمال تهذيب الكمال : ١٣٨/١٢

[444] المغني في الضعفاء : ٧٠٩/٢

بەهێزە، بەڵكو بەشێكیان دەفەرموون (صالح) یان (صدوق) ، ئائەمە ئێمەیش لەسەرتاوە باسمانكرد كە ڕاستە پیاوێكی باش و ڕاستگۆبووە ، بەڵام وەهمێكی شدیدی هەبوو.

وە دەتوانین بە دوو ڕێگە ترجیح بە یەكێك لەم دوو ڕایە بدەین :

١ – سەیر دەكەین بزانین كامیان تفصیل بە جەرح یان تعدیلەكانی خۆیان دەدەن.

٢– ئەگەر ئەو خاڵەیش بەدینەكرا ، ئەوا جەرحەكە پێشی تعدیلەكە دەكەوێت.

**هەربۆیـە ئیمامی ابن الصلاح** دەفەرمووێ : (**إذا اجتمع في شخص جرح و تعديل فالجرح مقدم**)[٤٤٥]. واتە : ئەگەر لەسەر كەسێك جەرح و تەعدیل كۆبۆیەوە (واتە بەشێك وتیان ثقةیە و بەشێكیش وتیان لاوازە) ، ئەوا جەرحەكە پێش دەكەوێت (واتە ئەوانەی كە فەرموویانە لاوازە) پێش دەكەوێت . چونكە لەوانەیە ئەمان شتێكیان لەو ڕاوییە بـینیبـیت كە ئەوانی تر لـێیان نەبـینیوە و جاهیلن بەحاڵی .

وە ئەمە وتەی إبن حجر[٤٤٦] والسيوطي[٤٤٧] و

بۆیـە تەجریجی زانیان لەسەر هیشام تطـبیق دەكرێت و هیچ فەرموودەیەكی لێوە وەرناگیرێت تاوەكو ئەو فەرموودەیە لە كەسێكی تریشەوە وەرگیرابـیت ، وە خاوەنی الصحیحینیش بوخاری و مسلم هەمان ڕێگەیان گرتۆتە بەر لە بەرامبـەر ڕیوایەتەكانی هیشام .

---

[٤٤٥] مقدمة / ٥٨

[٤٤٦] نزهة النظر مع النخبة: (ص٧٣).

[٤٤٧] تدريب الراوي: (١/٣٠٩).

**دووەم** : عیللەی دووەم ئەوەیە کە لەم فەرموودەیە نکارە هەیە ، چونکە هیشام کە ڕاوییەکی ضعیفە ئەم ڕیوایەتەی نقلّ کردووە کە پێچەوانەی ڕیوایەتێکی بەهێزە.

ئیمامی عبدالرزاق ڕیوایەتی کردووە (عن معمر عن ابن طاوس عن أبیه ، قال : سئل ابن عباس عن قوله الله تعالى ﴿**ومن لم يحكم بما أنزل الله فأولئك هم الكافرون**﴾[448] **قال : هي به كفر . وقال ابن طاوس : وليس كمن كفر بالله و رسوله)**[449]. واتە : لە معرەمەوە لە عبداللە بن طاوسەوە لە باوکیەوە کو فەرموویەتی : پرسیار لە عبداللە ـی کوڕی عباس کرا دەربارەی ئایەتی ﴿جاهەرکەسێك حوکم بەوە نەکات کە اللە تعالى ناردوویەتی ئائەوانە کافرن﴾ ، ئیمامی ابن عباس فەرموویەتی : ئابەوە کافر بووە ، ابن گاوسیش فەرموویەتی : وە ئەم کوفرە وەکو ئەوە نیە کوفر بە خوا و پێغەمبەرەکەی ﷺ بکەیت . ئەم ئەسەرە چەسپاوە وە سەنەدەکەی وەکو خۆر ڕووناکە .

**لەم ڕیوایەتە بەهێزەوە دووخاڵی گرنگ فێر دەبین :**

١ – ڕیوایەتی هیشام لە طاوسەوە مونکەرە.

٢– وتەی (لیس کمن کفر باللە ..) وتەی عبداللە بن طاوسە نەك ئیمامی عبداللە بن عباس رضي الله عنه.

٣– بەڵکو ابن عباس رضي الله عنه حکم بغير ما أنزل الله بە کوفر دەزانێت و هۆکارێك بۆ کافربوون ناوی دەبات .

بەڵام بەداخەوە زانایان کەمترین جار باسی ئەمەدەکەن کە بە صحیحی هاتووە ، کەچی ئەو ڕیوایەتە مونکەرەیان لە خۆیان کردووە بە دین و گەشەی پێدەدەن و بیدەنگن لە ئاستی عیللەکانیدا ، ئیللا ژمارەیەکی کەمی محدثین نەبێت .

---

[448] (سورة المائدة / ٤٤)

[449] تفسیر الإمام عبدالرزاق : سورة المائدة /٤٤

**گوتم** : ئەگەر هیشام ڕاوییەکی لاواز بـیت ئەوا فەرموودەکەی دەبـیت بە مونکەر.

## فەرموودەی مونکەر چیە ؟

بریتیە لـە فەرموودەی ڕاوییەکی لاواز کە پێچەوانەی فەرموودەی ڕاوییەکی بەهێز بـیت.

بـێگومان هیشام لاوازە (هەریەك لـە ئیمامی احمد و یحیی بن معین و علی بن المدینی و یحیی بن سعید القطان و سفیان بن عیینە و غەیری ئەوانیش فەرموویانەلاوازە) ، بەڵام ابن طاوس کە ڕاوییەکی بەهێزە نقڵی کردووە بە پێچەوانەی ئەوەی ابن حجیر نقڵی کردووە ، بۆیـە حوکم لـەسەر ئەوەی ابن طاوس دەدرێت بە صحیح و ئەوەی هیشامیش بە ضعیفیکی مونکەر .

## گریمان هیشام بن حجیر لاواز نەبوو :

خۆ گریمان هیشامیش ضعیف نەبوو ، بەڵکو ثقة و بەهێز بوو ، دیسانەوە فەرموودەکەی لاوازە و دەبـیت بە فەرموودەیەکی شاذ و مقبول نیە و ضعیفة .

## فەرموودەی شاذ چیە ؟

فەرموودەی شـــاذ بریتیە لـە فەرموودەی ڕاوییەکی بەهێز کە پێچەوانەی فەرموودەی ڕاوییەکی لـە خۆی بە هێزتر بکات . ئائەمە شاذە .

گریمان هیشامیش بە وتەی ئیمامی ابن شبرمە بەهێزە ، دیسان ئەم فەرموودەیەی لێوەر ناگیرێت ، بەڵکو ڕەت دەدرێتەوە و ئەسەرەکەی ابن طاوس حوکمی صحیحی لـەسەر دەدرێت.

## ڕێگەی دووەم : ابن ابـیطلحة لـە ابن عباسەوە ﵁

بە ڕێگەیەکی تەواو لاواز و معلولـەوە هاتووە کە بەهیچ شێوەیەك قابـیلی پشت بەستن نیە .

ئیمامی الطبري و ابن ابـي حاتم بەم ڕێگەیە ڕیوایەتیان کردووە و الطبري دەفەرمووێ : (حدثني مثنى ، قال ثنى عبدالله بن صالح ، قال ثني معاوية بن صالح

عن علي ابن ابـي طلحة عن ابن عباس ﷺ قوله ﴿ومن لم يحكم بما أنزل الله فأولئك هم الكافرون﴾ **قال: من جحد ما أنزل الله فقد كفر. ومن أقرّ به ولم يحكم، فهو ظالم فاسقٌ**[450]. واته : مثنى (كوڕى ابراهيم) بۆى باسكردم ، وتى عبدالله بن صالح بۆى باسكردم ، وتى : معاويەى كوڕى صالح بۆى باسكردم لـه ابن ابـیطلحةوه لـه ابن عباسەوه ﷺ كه دەربارەى ئەو ئايەته پيرۆزه[451] فەرموويەتى : هەركەسێك نكۆڵى لـەوه بكات كه الله تعالى دايگرتووه ئەوا كافربووه ، بەڵام هەركەسێك دانى پێدابنێت و حوكمى پێنەكات زاڵم و فاسقه .

## ئەم ڕێگەيه معلوله به سێ عيلله:

**عيللەى يەكەم**: ابن أبـي طلحة بەهيچ شێوەيەك به ابن عباس ﷺ نەگەيشتووه[452] واته منقطعه.

**عيللەى دووەم**: زۆرێك لـه زانايانى جەرح و تەعديل (ابن ابـیطلحة) بەلاواز دادەنێن ، ڕاسته ڕاستگۆبووه ، بەڵام زۆر هەڵەى دەكرد.

**ئيمامى أحمد** ﷺ دەفەرمووێ : (**عَليّ بن أبـي طَلْحَة لَهُ أَشْيَاء مُنكرَات وَهُوَ رجل من أهل حمص**)[453]. واته كۆمەڵێ شتى مونكەر و خراپى هەيه ، وه ئەوه پياوێكه لـه خەڵكى حمص (لـه سوريا) .

**وه ئيمامى يعقوب بن سفيان** ﷺ دەفەرمووێ : (**وَهُوَ ضَعِيفُ الْحَدِيثِ مُنْكَرٌ**)[454] . واته : ئائەوه ضعيفه ، فەرموودەكانى مونكره . وه لـه شوێنێكى تر فەرموويەتى حجه نيه[455].

---

[450]

[451] (سورة المائدة / ٤٤)

[452] من كلام أبـي زكريا يحيى بن معين في الرجال (رواية طهمان) / لا ٨٥ و الإرشاد في معرفة علماء الحديث لإمام القزويني : ب١/لا ٣٩٣ و فتح الباب في الكنى والألقاب / خ.ز٤٤٩ و المراسل لإمام ابن ابـي حاتم / لا١٤٠

[453] من كلام أحمد بن حنبل في علل الحديث ومعرفة الرجال ريواية المروذي و غيره . ت صبحي السامرائي / ١٦٤ و الضعفاء للعقيلي : ب ٤/ لا ٢٥٦

**وه ئیمامی أبو أحمد الحاكم** رحمه الله دەفەرمووێ : (**لَيْسَ مِمَّنْ يُعْتَمَدُ عَلَى تَفْسِيرِهِ الَّذي يروى عَنْ مُعَاوِيَةَ بْنِ صَالِحٍ عَنْهُ**)[456] واته : ئەوەنیه كه إعتماد بكرێته سەری (واته پشتی پێنابەسترێت) لـه تەفسیرەكەیدا ئەوەی كه معاویەی كوڕی صالح لێوەی گێڕاوەتەوە .

**ئیمامی ابن حجر:** دەفەرمووێ (**صدوق قد يخطئ**)[457]. واته : ڕاست گۆبوو بەڵام هەڵەی دەكرد.[458]

**عیللەی سێیەم:** ڕاوی (أبو صالح) عبدالله بن صالح ضعيفه و فەرموودەی لێ وەرناگیرێت، لـەگەڵ ئەوەدا كەسێكی لـەخواترس و ڕاستگۆبوو، وه فەرموودەكانی الليثي دەنوسیوە، تەنانەت ئیمامی الفضل الشعراوی دەفەرمووێ : هەركاتێك عبدالله ـم ببینیایه یان خەریكی حدیث بوو یان زیكری الله تعالى ـی دەكرد .

بەڵام فەرموودەی زۆر مونكەری لێوە دەبینرا ، هەتاكو وای لێهات بەشێك لـه زانایانی جەرح و تەعدیل بە درۆ تۆمەتباری بكەن .

**ئیمامی صالح بن جزره** رحمه الله دەفەرمووێ : (**انَ يَحْيَى بنُ مَعِيْنٍ يُوَثِّقُهُ، وَعِنْدِي أَنَّهُ كَانَ يَكْذِبُ فِي الحَدِيْثِ**)[459] واته : ابن معين به ثقةی دانا ، بەڵام لـەلای من ئەو درۆی هەڵدەبەست لـه فەرموودەدا!.

---

[454] المعرفة والتاريخ : ٤٥٧/٢

[455] المعرفة و التاريخ : ٦٥/٣

[456] تاريخ الإسلام لإمام الذهبي : ٢٢٧/٩

[457] تقريب التهذيب للحافظ /٤٠٢

[458] علي بن ابي طلحةيەكی تریش هەیه كه خەڵكی كوفەیه ثقةیه شێخی سفيان و غەیری ئەوانیشه ، پێویسته ئەو دوو ڕاوییه تێكەڵ بەیەك نەكرێن {بڕوانة : موسوعة أقوال الإمام أحمد بن حنبل في الجرح والتعديل : ٩٧/٦ و ٩٨ . المعجم في مشتبه أسامي المحدثين / ٢٠١}

[459] سير اعلام النبلاء : ٤٥٤/٨

بەڵام ئەمە پێویستی بە ڕوونکردنەوەیە ، عبداللە بن صالح کەسێکی ڕاستگۆبوو بەهەمان شێوە، وە هۆکاری ئەو فەرموودە مونکەرانەی دەگەڕێتەوە بۆ هاوسێیەکی هەبوو ڕقی لە عبداللە بوو ، بۆیە فەرموودەی هەڵدەبەست و بەناوی عبداللە ـوە دەینوسی وەدەیهێنا بۆماڵ عبداللە ، وەکاتێك عبداللە دەیبینی وایدەزانی ئەم فەرموودانە هی خۆیەتی.

**ئیمامی إبن خزیمة** رَحِمَهُ اللَّهُ دەفەرمووێ : (**كَانَ لَهُ جَارٌ يُعَادِيهِ فَكَانَ يَضَعُ الحَدِيْثَ عَلَى شَيْخٍ عَبْدِ الله بن صالح، ويكتب فِي قِرْطَاسٍ بِخَطٍ يُشبِهُ خَطَّ عَبْدِ اللهِ وَيَطْرَحُهُ فِي دَارِهِ بينَ الكُتُبِ، فَيَجِدُهُ عَبْدُ اللهِ فيحدث به على التوهم أنه خطه**)[٤٦٠]. واتە : عبداللە جیرانێکی هەبوو دژایەتی دەکرد ، وە فەرموودەی هەڵدەبەست لەسەر شێخ عبداللە بن صالحدا ، و لە پارچەیەك قیرتاس دەینوسی بە خەتێك کە لە خەتی عبداللە بچێت ، و دەیکردە ناو ماڵەکەی لەنێوان کتابەکاتیدا ، وە کاتێك عبداللە دیبینی و دەستی دەکەوت و ئەویش وەکو فەرموودە دەیوتەوە و وایدەزانی خەتی خۆیەتی ، لەسەر وەهمەکەی کە هەیبوو.

**ئیمامی ابن حبان** رَحِمَهُ اللَّهُ دەفەرمووێ : (**مُنْكَرَ الحَدِيْثِ جِدّاً، وَكَانَ فِي نَفْسِهِ صَدُوْقاً**)[٤٦١].واتە:فەرموودەکانی زۆر مونکەرن، لە هەمان کاتدا خۆی ڕاستگۆبوو.

**ئیمامی النسائي** رَحِمَهُ اللَّهُ دەفەرمووێ : (**لَيْسَ بِثِقَةٍ**)[٤٦٢] . واتە : سیقە و بەهێز نیە.

**ئیمامی علي بن المديني** رَحِمَهُ اللَّهُ دەفەرمووێ : (**ضَرَبْتُ عَلَى حَدِيْثِ كَاتِبِ اللَّيْثِ، وَلاَ أَرْوِي عَنْهُ شَيْئاً**)[٤٦٣]. واتە : زەڕبم بەسەر حەدیسەکانی نوسەرەکەی الليث (أبو صالح) دەهێنا و هیچم لێ وەرناگرم.

---

[٤٦٠] سير أعلام النبلاء : ٤٥٢/٨

[٤٦١] سير اعلام النبلاء : ٤٥٢/٨

[٤٦٢] سير .. : ٤٥٤/٨

[٤٦٣] سير .. : ٤٥٤/٨

**ئیمامی ابن عدي** رحمه الله دەفەرمووێ : (**أَبُو صَالِحٍ عِنْدِي مُسْتَقِيْمُ الحَدِيْثِ إِلَّا أَنَّهُ يَقَعُ فِي حَدِيْثِهِ غَلَطٌ، وَلاَ يَتَعَمَّدُ الكَذِبَ**)[٤٦٤] . واتە : أبو صالح (عبدالله) لەلای من فەرموودەکان ڕاستن (باشن) ، ئیللا ئەوە نەبـێت کە لە فەرموودەکانیدا هەڵە هەیە ، إعتمادیش ناکرێتە سەر درۆ .

**گوتم** : بزانە خوای تعالی من و تۆیش زیاتر شارەزا بکات و بەرچاو ڕۆشنمان بکات ، کە أبو صالح عبداللە بن صالح کەسێکی ڕاستگۆبوو ، بەڵام بە هیچ شێوەیەك پشت بە ڕیوایەتەکانی نابەسترێت ، ئەمیش بە هۆی ئەو وەهمەی کە هەیبوو ، وە ڕیوایەتانێکی زۆری مونکەر تێکەڵ بە ڕیوایەتەکانی بووە ، بۆیە بە هیچ شێوەیەك پشتی پێنابەسترێت.

**وە بەڕێگەیەکی تر** هاتووە لە عبدالرزاق لە سفیان لە پیاوێك .

جا ئەم سەنەدە جگە لەوەی کە إبهام هەیە ، إضطرابیش هەیە ،جارێك دەیداتە پاڵ ابن عباس، جارێکیش طاوس ، جارێکیش ابن طاوس..!!

**دەپرسم**:-

ئایا چۆن دەکرێت ئەو هەموو بەڵگەیە لەسەر کافرییەتی حاکم بەیاسا دەستکردەکان هاتووە و دەیەها إجماع لەو بارەوە نقلکراوە کە پێشتر باسکرا هەرهەمووی پشت گوێ بخرێت و پشت بە ئەسەرێکی لاواز و نەخۆش (معلول) ببەسترێت ؟ ئایا کەسێك حەقی بوێت ڕیوایەتی لاواز و معلول دەکات بە بەڵگەی خۆی و واز لەو قورئان و سونەت و إجماع دەهێنێت ؟

لەگەڵ ئەوەیشدا ابن عباس رضي الله عنه بە پێچەوانەی ئەوەی لێوە نقلّ کراوە کە فەرموویەتی کافرە وە لەسەر زاهیری ئایەتەکە فتوای داوە نەك پێچەوانەی ئایەتەکە ، ئەوە هەرگیز کاری هاوەڵان نەبووە پێچەوانەی دین بکەن و بە دینیشی بناسێنن ، بەڵکو ئەوە ئیمامی عمرە رضي الله عنه کەسێکی کوشت لەسەر ئەوەی بە

---

[٤٦٤] سير .. : ٨/٤٥٥

حوكمی الله ﷻ ڕازی نەبوو، وە ئیمامی علی ﷺ ئەو حاكمانە بە وەلی ئەمری شەرعی نازانیێت كە حوكم بە قورئان دەكەن، وە ابن مسعود ﷺ فەرمووی ڕشوەوەرگرتنێك لـە حوكمدا كوفرە ، ئەی ئەگەر حاڵی حاكمانی ئەمڕۆی ببـینیایە چی دەفەرموو ؟ ئەوە ابن عباسە ﷺ بە صحیحی لـێوەی هاتووە حوكم بە غەیری قورئان بە هۆكاری كافر بوون ناودەبات .

## بۆچوونی فەرموودەناسانی سەردەم لەسەر ئەسەرەكە

شتێكی شاراوە نیە كە زۆرینەی زانایان ئەم ئەسەرە بە صحیح دەزانن ، وە معاصرینیش شێخ أحمد شاكر و شعیب الأرنؤوط و الألباني و غەیری ئەوانیش بە صحیح ـان داناوە.

لـەبەرامبەریشدا كۆمەڵێكی زۆر لـە محدثین بەتایبەت ئەوانەی لـەسەر مەنهەجی متقدمین دەڕۆن ئەم ئەسەرە بە لاواز لـەقەڵەم دەدەن ، لـەوانە شێخی محدث سلیمان العلوان و ماهر الفحل وە خالد الحایك وە مصطفی العدوی و حسین الصومالی وەغەیری ئەمانیش دەفەرموون ئەم ئەسەرە لـە ابن عباسەوە ﷺ نەچەسپاوە بەڵكو لـە تابعینەوە هاتووە .

## ئەو ڕێگایەی زۆرێك تێیدا تووشی هەڵەبوون

ڕێگایەك هاتووە كە زۆرێك دەفەرموون صحیحە ، لـەكاتێكدا ئەویش لاوازە و دەیسەلمێنین إن شاء الله ، بەڵام پێشتر باسی تاكە ڕێگەی صحیح دەكەین لـە إبن عباس تا جوانتر لـە بابەتەكە تێبگەین.

ئیمامی عبدالرزاق لـە تەفسیرەكەیدا[٤٦٥] وە ئیمامی أبوبكر الخلال[٤٦٦] وە ئیمامی الطبري[٤٦٧] و المروزی[٤٦٨] و ابن بطة[٤٦٩] وە غەیری ئەوانیش ڕیوایەتیان كردووە

---

[٤٦٥] تفسیر عبدالرزاق : سورة المائدة / ٤٤

[٤٦٦] كتاب السنة لإمام ابو بكر الخلال / ر.١٤٢٠

[٤٦٧] تفسیر الطبري : ٤٦٦/٨

(حدثنا مَعْمَرٌ ، عَنِ ابْنِ طَاوُسٍ ، عَنْ أَبِـيهِ ، قَالَ: سُئِلَ ابْنُ عَبَّاسٍ عَنْ قَوْلِهِ: ﴿**وَمَنْ لَمْ يَحْكُمْ بِمَا أَنْزَلَ اللَّهُ فَأُولَئِكَ هُمُ الْكَافِرُونَ**﴾ . **قَالَ: هِيَ بِهِ كُفْرٌ. قَالَ ابْنُ طَاوُسٍ: وَلَيْسَ كَمَنْ كَفَرَ بِاللَّهِ وَمَلَائِكَتِهِ وَكُتُبِهِ وَرُسُلِهِ**) واتە لـە ئیمامی معمرەوە ئەویش لـە عبداللە بن طاوسەوە ئەویش لـە باوكیەوە ئەویش لـە ابن عباسەوە ﷺ كە دەربارەی ئایەتی ﴿**جا هەركەسێك حوكم بەوە نەكات كە اللە تعالى دایگرتووە ئائەوانە كافرن**﴾ ، ئابەوە كوفرە.

پاشان ابن طاوس دەڵێت : ئەم كوفرە وەكو ئەوە نیە كوفر بە خوا ﷻ و پێغەمبـەركەی ﷺ بكەیت .

ئەمە تاكە ڕێگای پارێزراوە لـە إبن عباسەوە ﷺ لـەم بارەوە كە ئایەتەكەی لـەسەر زاهیری خۆی تەفسیر كرد، نەك كفر دون كفر.

**ئەو ڕیوایەتەی كە زۆرێك بە هەڵە لێی حاڵی بوون:**

تەنها یەك ڕێگە ماوە كە إشكالی دروست كردووە زۆرینەی زانایان دەفەرموون صحیحە ، لـەكاتێكدا صحیحیش نیە ، ئەویش ئەوەیە كە الخلال لـە السنة[470] و الطبري[471] و غەیری ئەوانیش ڕیوایەتیانكردووە لـە (حدثني الحسن قال،حدثنا أبو أسامة، عن سفيان، عن معمر، عن ابن طاوس، عن أبـيه قال:قال رجل لابن عباس في هذه الآيات:﴿..**ومن لم يحكم بما أنزل الله**..﴾، **فمن فعل هذا فقد كفر؟ قال ابن عباس: إذا فعل ذلك فهو به كفر، وليس كمن كفر بالله واليوم الآخر، وبكذا وكذا**). واتە : الحسن بۆی باسكردم ، وتی أبو اسامە بۆی باسكردین ، لـە سفیانەوە لـە معرەوە لـە ابن طاوسەوە لـە باوكییەوە وتی: پیاوێك بە ابن عباسی وت لـە دەربارەی ئەو ئایەتانە و وتی : ئایە هەرچیەك وابكات كافربووە ؟ ابن عباس

---

[468] تعظيم قدر الصلاة / ر.٥٧٠

[469] الإبانة الكبرى / ر.١٠٠٩

[470] ر.١٤١٩

[471] تفسير الطبري / ر.١٢٠٥٤

فەرمووی : ئەگەر ئەوە بکات ئەوا پێی کافر بووە ، وە کوفرەکەوە وەکو کوفر کردن نیە بەخوا و ڕۆژی دووای وو بەوە و بەوە . ئەم ئەسەرەیش لاوازە و ڕەتدەکرێتەوە .

وە هاتووە لـە تەفسیرەکەیدا (تفسیر سفیان الثوري) لـە عبدالله بن طاوس لـە باوکیەوە لـە إبن عباس هەمان وتەی نقڵ کردووە، واتە باسی معمر ناکات، کە دواتر باسی دەکەین.

**بۆچی ڕەت دەکرێتەوە ؟**: وەك باسمانکرد عبدالرزاق و سفیان هەردووکیان لـە معمرەوە دەیگێڕنەوە ، ئەویش لـە ابن طاوس ئەویش لـە باوکیەوە ئەویش لـە ابن عباسەوە ، لـە ڕیوایەتەکەی سفیان دەفەرمووێ (هي به کفر ، ولیس کمن کفر بالله و رسوله) ، واتە ئائەوە کوفرە و هۆکاری کافر بوونەکەیەتی ، بەڵام کوفرێك نیە کە بگات بە کوفر کردن بە خوا ﷻ و پێغەمبـــەرەکەی ﷺ .

بەڵام لـە ڕیوایەتەکەی عبدالـرزاق دەفەرمووێ : نەخێر ئەو بەشەی کۆتای (لیس کمن کفر بالله و رسوله) واتە : وەکو کوفر بەخوا و پێغەمبەرەکەی ﷺ نیە ، ئائەوە وتەی ابن عباس ﷺ نیە ، بەڵکو وتەی ابن‌طاوسـه .

وەك باسکرا زاهیری هەردوو سەنەدەکە صحیحە وە هەردوولا رجالـەکانی بەهێزن، کەواتە چۆن بتوانین ڕەئی بەهێز هەڵبژێرین ، دوو هاوەڵی معمر ڕیوایەتێکیان لـێوە نقڵ کردووە و جیاوازیان هەیە لـەو بەشەی کۆتای .

**ئیمامی أحمد بن حنبل** ﷺ بۆمان هەڵدەبژێرێت و دەفەرمووێ : (**إذا اختلف أصحاب معمر فالحديث لعبد الرزاق**)[472]. واتە ئەگەر هاوەڵانی معمر جیاوازیان تێکەوت (لـە فەرموودەیەکدا) ، ئەوا فەرموودەکە بۆ عبدالـرزاقە . وە بەهەمان شێوە ئیمامی یعقوب بن شیبە و غەیری ئەوانیش هەمان بۆچوونی هەیە .[473]

---

[472] شرح العلل ٢/ ٥١٦ و شرح علل الترمذي لإمام ابن رجب / ٢٥٤

[473] شرح علل الترمذي لإمام ابن رجب : ٢٦٦/١

وە یەك زانای جەرح و تعدیل و علل نەیانفەرمووە سفیان أثبترە لە عبدالرزاق لە معمرەوە.

بۆیە هیشامی کوڕی یوسف کە ئەمیش قوتابی معمر بوو دەیفەرموو (**كَانَ عَبْدُ الرَّزَّاقِ أَعْلَمَنَا، وَأَحْفَظَنَا**)[٤٧٤] .واتە : عبدالرزاق زیرەترین و باشترینمان بوو لە حفظ (لەبەرکردن) ـدا .

مەبەست لەمە ئەوە نیە کە سفیان ناگات بە پلەی عبدالرزاق ، بەڵکو أثبترە لە عبدالرزاق ، بەڵام عبدالرزاق لە معمرەوە بەهێزترە لە سفیان ، واتە شارەزاترین کەسێك بە حدیثەکانی معمر عبدالرزاقە و هیچ یەکێك لە زانایان نەیانفەرمووە سفیان لە معمرەوە بەهێزترە لە عبدالرزاق ، بۆیـــە دیسان ڕیوایەتەکەی سفیان مردودە و کاری پێناکرێت ، چونکە پێچەوانەی ڕیوایەتی کەسێکی لە خۆی بەهێزترە لە معمرەوە ، وە ئەم فەرموودەیە مدرجە .

## سفيان الثوري مدلس بوو

**پاشان ئەوەی باسمان کرد**: هاتووە لە تەفسیری سفیان لە إبن طاوس لە باوکیەوە لە إبن عباس ﷺ..

ئەمەش ڕەت دەکرێتەوە، سفیان لەگەڵ پلە و پایە وحفظ ـیدا، بەڵام کەسێکی مدلس بوو، هەندێکجار تدلیسی دەکرد، (واتە: ناوی ئەو کەسەی فەرموودەکەی بۆ دەگێڕێتەوە باسی ناکرد، بەڵکو ناوی ئەو کەسەی دەهێنا کە بۆ مامۆستاکەی باسی کردووە).

ئیمامی أحمد بن حنبل وە الدارقطني وغەیری ئەوانیش دان دەنێن بەوەی کە سفیان بن سعيد الثوري مدلس بووە.

**ئیمامی محمد بن إسماعيل البخاري** ﷺ دەفەرمووێ تدلیسی هەبوو، بەڵام کەم[٤٧٥] .

---

[٤٧٤] المُفصَّلُ في علوم الحديث / ٢٥٦

**ئیمامی أبو عبدالرحمن النسائي** رحمه الله **:** لـه ناوی مدلیسەکاندا سفیان الثوري لـه ژمارە (١٤) ـەدا داناوە![٤٧٦].

**إبن حجر العسقلاني** رحمه الله **:** لـه طبقات المدلسین بە ژمارە (٥١) باسی کردووە[٤٧٧].

**جلالدین السیوطي** دەڵێت : (سفیان مەشهوربووە بەوەی کە مدلس بووا!)[٤٧٨].

**هەندێك نمونە لـەم بابەتەدا:**

**یەکەم**: نمونەی تدلیسی سفیان زۆرە، لـەوانە:

سفیان دەگێڕێتەوە لـه القاسم بن عبدالرحمن کە ئیمامی عمر نوێژی بۆ موسڵمانان دەکرد و لـەشیشی گران بوو.

**ئیمامی أحمد بن حنبل** رحمه الله دەفەرمووێ: (لم یسمع من القاسم بن عبد الرحمن إنما روی عن أشعث بن سوار عنه)[٤٧٩]. واتە: گوێی لـه القاسم نەبووە ، بەڵکو گوێی لـه أشعث بن سوار بووە لـه القاسم ـەوە.

گوتم: أشعث بن سوار ڕاویەکی لاوازە و فەرموودەکە لاوازە، بەڵام دەبینین سفیان باسی أشعث ناکات ڕاستەوخۆ دەڵێت القاسم..

**دووەم**: نمونەیەکی تر لـەسەر تدلیسی سفیان: سفیان دەگێڕێتەوە لـه (محمد بن عبدالرحمن لـه سلیمان بن یسار، لـه عبدالله بن عتبە لـه ئیمامی عمر...)

**ئیمامی أحمد بن حنبل** رحمه الله دەفەرمووێ : گوێی لـه محمد نەبووە[٤٨٠]..

---

[٤٧٥] طبقات المدلسین : لا ٣٢

[٤٧٦] ذکر المدلسین للإمام أبو عبدالرحمن النسائي : لا ١٢٣

[٤٧٧] طبقات المدلسین : لا ٣٢

[٤٧٨] أسماء المدلسین للسیوطي : لا ٥١

[٤٧٩] جامع التحصیل في أحکام المراسیل: لا ١٨٦

[٤٨٠] جامع التحصیل : لا ١٨٦

**سێهەم:** دیسان فەرموودەیەك دەگێڕێتەوە، لـە أبی معشر عن إبراهیم عن الأسود عن بلال (أنه كان أذانه وإقامته مرتین).

**ئیمامی الدارقطني** رحمه الله دەفەرمووێ (لم یسمعه الثوري من أبي معشر)[481]. واته: واته لـە أبی معشر ــەوە گوێی لێ نەبووە.

**چوارەم:** ئیمامی أبو نعیم الملائی دەفەرمووێ: (حدیث سفیان عن عمرو بن مرة عن عبد الرحمن بن أبي لیلی عن البراء قنت النبـي ﷺ في الصبح لم یسمعه سفیان من عمرو، دلسه)[482]. واته : فەرموودەكەی سفیان لـە عمرو بن مره لـە عبدالرحمن بن أبی لیلی لـە البراء كه رسول الله لـە بەیانیدا ویتری كرد، سفیان لـە عمرو گوێی لێوە نەبووە، (بەڵكو) تدلیسی كردووە!.

نمونەی تر زۆرە بابەتی كتابەكە ئەمە نیە ئەگینا نمونەم زۆر دەهێنا.

لێرە دەبینین سفیان ڕاستەخۆ باسی إبن طاوس دەكات و ناوی معمر دەقرتێنێت، بەڵام لـە ڕاستیدا سفیان ئەمەی لـە إبن طاوس ــەوە گوێ لێ نەبوو.

**ئیمامی عبدالرزاق الصنعاني** رحمه الله دەفەرمووێ سفیان ئەمەی لـە معمرەوە بیستووە (نەك إبن طاوس).

**لەكۆتایدا:** ئیمامی سفیان الثوري رحمه الله لەلای هەندێك لـە قوتابیانی باسی معمر ناكات، بەڵام ئیمامی عبدالرزاق الصنعانی رحمه الله ئەم بابەتەمان بۆ ڕوون دەكاتەوە و دەفەرمووێ نەخێر سفیان لـە معمر گوێی لێ بووە.

بۆیە فەرموودەی تەواو وبەهێز ئەوەی عبدالرزاق ــە، وە وتەی (ولیس كمن كفر بالله..) وتەی إبن طاوس ــە و مدرجە.

## فەرموودەی المدرج چیە ؟

بریتیە لـە فەرموودەیەك كە زیادەیەك تێكەڵی سەنەد یان مەتن دەبـیت ، ئێمە لێرە باسی زیادەی ناو مەتن دەكەین .

---

[481] جامع التحصیل : لا ١٨٦

[482] جامع التحصیل : لا ١٨٦

بریتیه لـه تێكەڵ بوونی وتەی صحابـیەك یان ڕاوییەكانی دوای ئەوان به فەرموودەكه وه ئەو ڕاویەی كه فەرموودەكه وەردەگرێت یان دەینوسێت وادەزانێت ئەمەیش وتەی پێغەمبــەری خوایه ﷺ، بەڵام به ڕاستیدا وتەی ڕاوییەكانه تێكەڵی بووه ، ئەمیش كاتێك هەستی پێدەكرێت كه لـه ڕێگەی صحیحەوه به پێچەوانەی ئەمەوه هاتبـیت و بزانرێت ئەو زیادەیه وتەی كێیه تێكەڵ به فەرموودەكه بووه ، وه تەنانەت صحیحی بوخاری و مسلمیش لـەم عیللـەیه پارێزراو نەبوونه ، بەڵام به ڕێژەیەكی زۆر كەم بەڵكو دەگمەن شتی وا دەبـینرێت.

وه ئەم ئەسەرەیش كه باسی دەكەین به هەمان شێوه مودرەجه ، واته ئەو بەشەی كۆتای وتەی ابن طاوسه تێكەڵ به مەتنەكه بووه .

بۆیــه بڕیار لـەسەر ڕیوایەتەكەی سفیان رحمه الله دەدرێت به فەرموودەی مدرج ، وه ترجیح به فەرموودەكەی عبدالـرزاق رحمه الله دەدرێت به بەهێز و پارێزراو لـه هەر عیللـەیەك ، بۆیــه دەتوانین بڵێین تاكه ئەسەر كه پارێزراو دەرچوو ئەسەرەكەی عبدالـرزاقه لـه معمرەوه لـه ابن طاوسەوه لـه باوكیەوه لـه ابن عباسەوه رضي الله عنه كه فەرموویەتی : (هي به كفر) . واته ئابەوه كوفره . ئێستا دەتوانین بڵێین ئەمه صحیحه و غەیری ئەمه صحیح نیه .

# مەتنی ئەسەرەكە

ئەمڕۆ ئیشكالی گەورە و هۆكاری گومڕابوونی كۆمەڵانێك كە زۆرجار سەردەكێشێت بۆ كافر بوونی خاوەنەكەی بریتی نیە خیلاف لەسەر لاوازی یان بەهێزی سەنەدی ئەسەرەكە ،**چونكە ئەمە حەقیقەتە زۆرینەی محدثین ئەم ئەسەرە بە صحیح دەزانن** وە كێشە لە سەنەد نەبۆتە هۆی گومڕابوون،بەڵام هۆكاری گومڕابوون دەگەڕێتەوە بۆ خراپ حاڵی بوون لە مەبەستی ئەسەرەكە ، وەك باسكرا ئەم ئەسەرە كە گوایە ابن عباس ﷺ وتویەتی كوفری بچوكە ضعيفة ، بەڵكو بە پێچەوانەی ئەوەی لێوە نقلكراوە و بە كوفری گەورەی دەزانێت ، تەنانەت بۆ هۆكاری كافر بوونی خاوەنەكەی دەزانێت ، لەگەڵ ئەمەیشدا كەسانێكی نەخۆش بەتایبەت جەهمییەكانی سەردەم ئەو هەموو بەڵگەیە لە قورئان و سونەت و إجماعە ڕەتدەكەوە و پشت بەو ڕیوایەتە لاوازە دەبەستن ، لەگەڵ ئەوەیشدا تفسیر و شەرحێكی زۆر فاسد و ترسناكیشی بۆ دەكەن ، وە افترا بەسەر هاوەڵانەوە دەكەن و دین لە خۆیان و خەڵكیش دەشێوێنن .

ڕاستــە من دان بەوەدا دەنێم كە زۆرینەی زانایان ئەم ئەسەرە بە صحیح دەزانن لە كاتێكدا وایش نەبوو ، بەڵام وەك وتمان پینە و پینەكارییە ، بەڵام لەگەڵ ئەوەدا إشكالیان لە مفهومەكەی نیە ، بۆنمونە فەرموودەناس شێخ أحمد شــاكر رحمه الله ئەسەرەكە بە صحیح دەزانێت ، بەڵام هەرگیز نەچووە شەرحی فاسد بۆ مەتنەكەی بكات، بەڵكو وەك باسی وتەكانیمان كرد **پێی وایە حوكم كردن بە یاسادەستكردەكان كوفری أكبرە** و هەرگیز كفر دون كفر نیە . مەتنی ئەسەرەكە ئەوەمان پێنیشان دەدات كە حوكم بغیر قورئان كوفریبچوكە.ئێمەیش ئەمەمان قبوڵە وە پێمان وایــە حوكم كردن بە غەیری قورئان كوفری بچوكە ، بەڵام ئەمە مەرجی خۆی هەیە ، خۆ ناكرێت هەرچیەكت بـینیی حوكمی بە غەیری قورئانی كرد بڵێی ئەمە كوفرەكەی كوفری بچوكە .

## مەبەستی سەلەف لە مصطلحی کفر دون کفر چیـــە ؟

ئەمەی بەشێکی ئێجگار کەم لە سەلەف کە لێوەیان هاتووە کە فەرموویانە کوفری بچوکە کە حوکم بە غەیری قورئان بکەیت ، ئائەمە بۆ حاکمێکە کە جارێك یان دوو جار حوکم بە قورئان نەکات بە هۆی هەواو ئارەزووی خۆیەوە ، ئەمیش بە مەرجێك کە بەهیچ شێوەیەك دەستکاری یاسای وڵاتی نەکردبێت و وەك ئەمڕۆ بە ئارەزووی خۆی حوکمەکانی نەگۆڕی بێت ، ئائەمە کوفری بچوکە و ئێمەیش بڕوامان پێی هەیە وە دواتریش وتەی زانایان لەم بارەوە نقلّ دەکەین .

ڕاستە زۆرینەی هەرە زۆری زانایان بڕوایان بەوە هەیە کە ابن عباس ﷺ فەرموویەتی کوفری بچوکە ، بەڵام إشکالیان لە مفهومەکەی نیە ، بۆ نمونە شەیخی ئیسلام ابن تیمیە ﷺ یان پێشتر باسمانکرد شێخ أحمد شاکر ﷺ کەئەمانە زۆر بلیمەت بوون لە زانستی فەرمووەدە ، بڕوایان وایـــە کە حوکم کردن بە غەیری قورئان کوفری بچوکە و باسی ئەسەرەکەی ابن عباسیش ﷺ دەکەن ، وە جەهمییەکانی سەردەم ئەم وتانەی ئیمام دەهێنن و دەڵێن ئەوەتا ابن تیمیەیش یان فڵان بڕوای وایە حوکم کردن بە غەیری قورئان کوفری بچوکە ، بەڵام کوێرن لە ئاست ئەوەی کە ابن تیمیە ﷺ یان غەیری ئەویش لە زانایانی ئەهلی سونە بابەتی یاسا گۆڕین و دەستکاری یاسا و تەشریع بە کوفری أکبر دەزانن ، تەنانەت شەوێنکەوتوانیشیان بە کافر دەزانن کە پێشتر باسمانکرد[٤٨٣] ، پێویستە ئەم خاڵە بە هەند وەربگیرێت وە بۆ خەڵکی و بە تایبەت قوتابیانی زانستی شەرعی ڕوونبکرێتەوە، کە ئەوەی سەلەف باسی دەکەن کە کوفری بچوکە ئەمە بۆ حاکمێکە کە لە واقیعەیەکدا حوکم بە قورئان ناکات، بەڵام یاسای وڵاتی هەر قورئانە و دەستی بۆ یاسانەبردووە ، ئائەمە کافر نیە ، بەڵکو کوفرەکەی کوفری بچوکە واللە أعلی و أعلم .

---

[٤٨٣] مجموع الفتاوی : ٣٧٢/٣٥

## ئایا سەلەف مُشرعیان بە موسڵمان زانیوە هەروەکو ئەم جەهمیانەی ئەمڕۆ دەیدەنە پاڵ سەلەف؟

کەسانێك جگە لەوەی ئەم ئەسەرانە بە صحیح ناو دەبەن کە ئەمە کێشەیەکی وانیە ، چونکە خیلاف لە صحەتی ئیسناد هەرهەبووە و دەیشبێت، بەڵام کەسانێك لەگەڵ ئەوەیشدا گەورەترین إفتراء بەسەر سەلەفەوە دەکەن و گەورەترین درۆیان بۆ هەڵدەبەستن ، گوایـــە مەبەستی سەلـەف و ابن عباس ﵁ تشریع و تبدیل و استبدال و یاسا نوسینیش دەگرێتەوە (پەنابەخوا) وە ئەوە دەدەنە پاڵ سەلـەف کە ئەوان باسی ئەو حاکمانە دەکەن کە یاسا دەنوسنەوە و کافریش نابن ، ئەمە درۆیە و إفترایە و لەچەند ڕوویەکەوە وەڵام دەدرێنەوە :

١ – پێش هەموو شتێك ئەوە بزانە کە سەردەمی سەلـەف هەرگیز لـەناو موسڵماندا یاسا گۆڕین و تەشریع و استبدال بوونی نەبووە و پێیشی ئاشنا نەبوبون ، بەڵکو لـە زیاد لـە (٦٠٠) ساڵ دوای ئەوان بۆ یەکەمین جار ئەم کارە بـینرا لـەناو وڵاتی موسڵمانان . بۆیــە پێویستە پرسیار لـە جەهمییەکان بکرێت : ئایا ئەگەر سەلـەف تەنانەت ئاشنای ئەم کارە بەددە هەرنەبوبون ، ئەی چۆن بڕیاریاندا کە ئەو کارە کوفری بچوکە ؟ ئایا سەلـەف زانیویانە دوای خۆیان تشریع و تبدیل پەیدا دەبـیت؟

ئەگەر بوترێت بەڵێ : ئەوا وەڵامیان دەدرێتەوە و پێیان دەگوترێت درۆتان کرد، هیچ کەسێك غەیب نازانێت تەنها الله تعالی نەبـیـت ، وە هەرکەسێك بڵێت سەلـەف غەیبـیان زانیوە ئەوا کافرە.

خۆ ئەگەر وتیان نەخێر سەلـەف نایانزانی دوای خۆیان چی دێتە کایەوە : ئەوا پێیان دەگوترێت ئەی ئەگەر سەلـەف نایانزانی کەواتە تۆ بۆچی درۆیان بۆ هەڵدەبەستیت و دەڵێی سەلـەف یاسا نوسین و یاسا گۆڕینیشیان بە کوفری بچوك زانیوە ؟؟

**٢-** ئەمە درۆیە بەسەر مێژووەوە ، چونکە هەرگیز نابینین لە مێژووی ئیسلامیدا و لە دەوڵەتە ئیسلامییەکاندا هەر لە (دەوڵەتی ڕاشدین و دوای ئموی و دوای عباسی ... هتد) یەك حاکم و خەلیفە هاتبیت و یاسای قورئانی لادابیت و خۆی یاسای نوسیبیتەوە ، هەرگیز لە مێژووی ئیسلامیدا و لەناو دەوڵەتی ئیسلامیدا شتی وا ڕوویندداوە .

**ئیمامی عبدالرحمن بن قاسم النجدی** رحمه الله بابێکی تایبەتی لە کتابە بەناوبانگەکەی خۆی (الدرر السنية) ناوناوە بە (**الفصل الثالث: ما يسمى بالنظم وبالقانون لم يكن يعرف في عهد سلفنا**)[484]. واتە : فەصڵی سێیەم : ئەوەی کە ناودەنرێت بە یاسا و قانون کەلەسەردەمی سەلەف نەناسرابوو.

پاشان دەفەرمووێ : (**ما يسمونه بالنظم، وقد يسمى بالقانون، وغير ذلك، ولكل دولة فيه اصطلاح، وقد يختم كل نظام بوجوب الحكم به، وللدولة نظم عديدة، كنظام الوزراء، والمحاكم، وكنظام البنوك، ونظام العمل والعمال، وسائر الدوائر، ولم تكن تلك تعرف في عهد سلفنا، ولا في عهد السلف الصالح**)[485]. واتە : ئەم قانون و یاسا نوێیانە کە هاتوون لەسەردەمی سەلەف بوونی نەبووە.

**٣-** ئەوەی سەلەف پێیان دەوت کوفری بچوك حاکمێك بوو لەو دەوڵەتە ئیسلامیانە ، وە حوکمی بە یاسای ئیسلام دەکرد و خۆشی دەویست ، بەڵام هەندێك جار بە هۆی هەواوئارەزوویەوە لە حوکمەکە لایدەدا ، ئەمیش حاڵەت بوو نەك بە یاسای بکرێت و یاسای الله تعالی پشتگوێ بخرێت ، ئائەمە ئێمەیش وەکو شوێنکەوتەی سەلەف بە کوفری بچوکی دەزانین .

**٤-** ئەم وتە و إفترایەی جەهمی و مورجیئەکان پێچەوانەی بۆچوونی زانایانی ئەهلی سونەیە هەر لەسەلەفەوە تاکو ئەمڕۆ ، چونکە ئەوان ئەم کوفر دون کوفرە

---

[484] (ب ١٦/لا ٢٣٣)

[485] الدرر السنية : ٢٣٣/١٦

بۆ بابەتی یاسا گۆڕین و تەشریعیان بەکار ناهێنا، کە پێشتر بە دووروودرێژی باسمانکرد کەڵەزانایانی ئەهلی سونە کە بابەتی تەشریع و تبدیل و استبدال بە کوفری گەورە دەزانن و خاوەنەکانیان بە کافر و مورتەدد ناودەبەن، ئەمە عقیدەی ئەهلی سوونەیە و ئێمەیش وەکو میراتگر لەسەری پەروەردەبووین، وە ئەمە عقیدەمانە و بانگەوازیشمان بۆ ئەمەیە کە: خوای تعالى نەلە حاکمیەتدا نەلە ئلوهیەت و نەلە ڕبوبیوت و ناو و سیفەتە پاکەکانیشیدا شەریکی نیە و هەرکەسێکیش هەریەکێك لەو تایبەت مەندیانە بداتە پاڵ خۆی تاغوتە موشریکە کافرە پیسترینی مرۆڤەکانە .

## پوختەی قسە لە بارەی کوفر دون کوفرەوە

ئەگەر حاکمێك لە دەوڵەتی ئیسلامیدا حوکمی بە یاسای الله تعالى کرد و بەهیچ شێوەیەك یەك یاسای قورئانی پەك نەخست و دەستکاری نەکرد ، بەڵام جارێك یان دووجار یان هەندێك جار بە هۆی هەواو ئارەزووەوە کاری پێنەکرد ، ئەوا تووشی کوفر بووە ، بەڵام کوفرەکەی کوفری بچوکە و پێی کافر نابیت ، ئەمیش بە چەند مەرجێك :

١- دەستکاری یاسای نەکردبیت و یاسای کافران و نەتەوەیەکگرتووە کافرەکان نەچەسپێنێت لە وڵات و یاسای الله عزوجل لابدات ، ئەگینا کافر دەبیت .

٢- نابیت کارەکەی خۆی بە حەڵاڵ بزانێت (إستحلالی نەکات) .

٣- نابیت کارەکەی خۆی بە باش و چاك بزانێت ، یان لە حوکمەکەی الله بەباشتری بزانێت .

٤- نابیت نکۆڵی لەیەك حوکمی ئیسلام بکات ، ئەگینا کافر دەبیت ،ئەگەر خۆی لەم چوار خاڵە پاراست ئەوا کوفرەکەی کوفری بچوکە و پێی کافر نابیت، ئەگەرنا ئەوا کوفرەکەی کوفری گەورەیە تووشی هەرکامیان بیت.

## شوبهەی دووەم: شێواندنی وتەی زانایان

هەرچەندە ئەم شوبهەیە دەبوایە لە کۆتایدا باسبکرایە لەبەر لاوازی خودی شوبهەکە ، بەڵام چونکە پەیوەندی بە شوبهەی یەکەم هەیە بۆیە پێشم خست بۆ ئێرە وو زۆر بەکورتی ڕوونکردنەوەیەکی لەسەر دەدەم .

دیارە یەکێکی تر لەو هۆکارانەی کە ئەهلی بیدەع دەستیان بۆ دەبەن بۆ برەودان بە فکری خۆیان ، بریتیە لە هێنانی وتەی زانایانی ئەهلی سوونە و دەستکاری کردنی وتەکان یان بڕینی پاش و پێش یان شێواندن لە تێگەیشتن و مەفهومی وتەی زانایان ، دیارە جەهمیەکانی سەردەمیش هەمان ڕێچکەیان گرتۆتە بەر ، وتەی زانایان هەر لەسەلەفەوە تاکو معاصرینیش دەهێنن و خیانەت لە مەبەستی فتواکان دەکەن ، بۆ نمونە وتەکەی ابن عباس ﵁ کە دراوەتە پاڵی و پێشتر قسەمان لەسەر مەتن و سەنەدی ئەسەرەکە کرد ، دەڵێن ئەوەتا ابن عباس ﵁ دەڵێت کوفر دون کوفرە ، جگە لە بابەتی سەنەدەکەی ، ئەوەیش دەشارێتەوە کە ئایا مەبەستی کفر دون کفر چیە کە سەلەف بەکاریان هێناوە ؟ زانایانی ئەهلی سونە بۆیان ڕوونکردوینەتەوە کە ئەمە یاسادانان ناگرێتەوە ، بەڵام ئەهلی بیدەع خۆیان لە دەلیلەکان دەشارنەوە ، وە حەق دادەپۆشن و برەو بە ناحەق دەدەن ، چاوی شوێنکەوتوانیان دەبەستن لە شەرحی زانایان ، یان وتەی زانایانی دواتر بە تایبەتی شەیخی ئیسلام ابن تیمیە و ابن القیم و ابن کثیر و غەیری ئەوانیش تاکو ئەم سەردەمە ، وتەیەکی دەهێنن و پاش و پێشی دەبڕن و دەڵێن ئەوەتا زانایان حوکم کردن بە غەیری قورئان بە کوفری بچوك ناودەبەن.

**گوتم** : پێشتر باسکرا وە دووبارە و سێبارەیشی دەکەینەوە تاکو ئەو حەقە بە موسڵمانان بگات، کە زانایان حوکم کردن بە غەیری قورئان بە کوفری بچوك دەزانن ، وە ئەو زانایانەی کە لەسەرەوە باسکرا هەموویان ئەم کارە بە کوفری

بچوك دەزانن و نكۆڵی لەوە ناكەین، وە ئێمەیش وەكو شوێنكەوتەی پێشینی چاكەكار هەمان بـیروباوەڕمان هەیە ، بەڵام ئەمە بەمەرجی خۆی:

**یەكەم** : نابـێت بەهیچ شێوەیەك دەستكاری یاسابكرێت و تەشریع و استبدال بكرێت ، چونكە ڕاستەوخۆ پێی كافر دەبـیت و خاوەنەكەی پێی دەبـیت بە تاغوت ، وە زانایان ئەمەیان بە تفصیلی و بە جوانی ڕوونكردۆتەوە لە پێشی هەموویان ابن تیمیە و ابن القیم و ابن كثیر كە پێشـــتر باسی هەموویمان كرد ، ئایا تاكو كەی ئیفتراء بەسەر زانایانەوە بكرێت و حەق لە خەڵك بشاردرێتەوە ، موسڵمان پێویستە تەقوای الله تعالی ـی هەبـیت و بترسێت لە سزای ئەوانەی كە حەق دەشارنەوە ، بۆیە هەركاتێك وتەی زانایەكی ئەهلی سونەیان هێنا لەم بارەوە بەبێ هیچ گومانێك بزانە ئەمە بابەتی تشریع ناگرێتەوە، مەگەر زانابەكرێگراوەكانی خۆیان ئەوا قسە لەوبارەوە ناكەین.

**دووەم** : مەرجی دووەم نابـیت كارەكەی خۆی بە حەڵاڵ بزانێت .

**سێیەم** : نابـێت نكۆڵی لە حوكمەكەی الله ﷻ بكات .

**چوارەم** : نابـێت كارەكەی خۆی بەباشتر بزانێت .

وە مەرجی تر زۆرن بەڵام ئەمە گرنگترینیانن ، هەر حاكمێك حوكمی بە قورئان نەكرد لە بابەتێكدا ، وە تووشی هیچ یەكێك لەو خاڵانە نەبووبوو ئەوا بە كافری نازانین ، وە كوفرەكەی بە كوفری بچوك دەزانین ، وە لەژێر هەڕەشەی الله تعالی ـدایە و شایستەی سزایە .

بۆ نمونە دەڵێن ئەوەتا ابن عباس رضي الله عنه دەڵێ ئەوە كوفری بچوكە ، بەڵام ڕوونی ناكەنەوە كە ئەمە بابەتی تشریع ناگرێتەوە.

یان دەڵێن ئەوەتا ابن تیمیە فلان فلان دەڵی كوفری بچوكە ، بەبێ ئەوەی حەقەكە بدركێنن كە إبن تیمیە استبدال و تشریع بە كوفری أكبر دەزانێ نەك كفر دون كفر.

خۆ ئەگەریش وتەی زاناکە پێچەوانەی وتەی الله تعالی و پێغەمبــەرکەی ﷺ بوو ، ئەوا بەبێ هیچ گومانێك ڕەتی دەکەینەوە و تاکو دەتوانین دەیدەین بە دیاواردا ، جا کێیە با ببێت ، دەروێشایەتیمان بۆ هیچ زانایەك نیە ، چونکە ((**لا طاعت لمخلوق في معصية الخالق**)) .

## شوبهەی سێیەم :لە بارەی ئایەتی (٦٠ و ٦٥) لە سورەتی النساء

شوبهەی دووەم : دەڵێن ئەم ئایەت و هەرەشانە مەبەست پێی کامڵ نەبوونی ئیمانە نەك کافر بوون ، خوای تعالى بە بیٚ ئیمان ناویان دەبات نەك کافر.

دیارە جەهمیەکان لە ئایەتەکان دەروانن و لیٚی ورد نابنەوە ، دەڵێن ئەو حاکمانەی کە حوکم بە قورئان ناکەن کافر نین بەڵکو بیٚ ئیمانن ، بـی ئیمانیش شەرت نیە هەموو جارێك کافر بـیت ، هەروەکو خوای تعالى بە أعرابـیەکان دەڵێت ئێوە موسڵمانن بەڵام مەڵێن ئیمانمان هەیە .

**لە وەڵامدا دەڵێین** : خوای تعالى لە قورئاندا ڕوونی کردۆتەوە کە حوکمی حاکم بغیر ما أنزل الله چیە ، ئایا کافرە یان نا ؟ وە پێشتر ئەمەمان بە تفصیلی باسکرد ، بەڵام ئەو ئایەتانەی ئەم جەهمییانە باسی دەکەن بریتیە لە ئایەتی (٦٠) وە (٦٥) لە سورەتی النساء ، ئەمیش ئایەتەکانە :

خوای تعالى دەفەرمووێ : ﴿**ألم تر الى الذين يزعمون أنهم آمنوا بما أُنزل إليك وما أُنزل من قبلك يريدون أن يتحاكموا إلى الطاغوت وقد أُمروا أن يكفروا به**﴾[٤٨٦].

واتە : ئەی محمد ئایا ئەوانەت بـینیوە کە لافی ئەوە لیٚدەدەن کە ئیمانیان هەیە بەو دینەی بۆ تۆ و پێغەمبـەرانی پێش تۆیش هات ، لەکاتێکدا دەیانەوێ حوکم بۆلای تاغوتان ببەنەوە ، لە کاتێکدا فەرمانیان پێکرابوو کە کوفر بە تاغوت بکەن .

وە لە ئایەتی (٦٥) الله (سبحانه و تعالى) دەفەرمووێ : ﴿**فلا وربك لا يؤمنون حتى يُحَكموك شيما شجر بـينهم ثم لا يجدوا في أنفسهم مما قضيت و يسلم تسليما**﴾[٤٨٧]. واتە : نەخێر سوێند بـیت بە پەروەردگاری تۆ ئەی محمد ئەوانە بڕوادار نین هەتاکو تۆ نەکەن بە حەکەم لە نیٚوان خۆیاندا ، لە پاشاندا نابـیت لە دڵیانەوە پێیا ناخۆش بـیت یان گومانیان لە ڕاستیٚتی ئەو حوکمە هەبـیت.

---

[٤٨٦] (سورة النساء/٦٠)

[٤٨٧] (سورة النساء / ٦٥)

دەڵێن ئەوەتا خوای تعالی باسی ئیمان دەكات نەك ئیسلام ، ئیمانیش پلەیەك بەرزترە ، كەواتە ئەمانە بــێ ئیمانن بەڵام كافر نین كەواتە حاكم ئەگەر حوكم بە قورئانیش نەكات كافر نیە بەڵام بێ ئیمانە .

**بە چەند خاڵێك وەڵامیان دەدەینەوە :**

**یەكەم** : پێش هەموو شتێك لێرەدا كوێری ئەهلی بـیدەع و جەهمییەكانی سەردەممان بۆ ئاشكرا دەبـیت لـە بەرامبەر قورئان ، خوای تعالی لـە باسی بــێ ئیمانی ئەمانەدا باسی حاكم بغیر ما أنزل الله ناكات ، بەڵكو باسی محكوم بغیر ما أنزل الله دەكات ، چونكە ئەم دوو جۆرە جیاوازە و پێویستە بابەتە ڕوونبكرێتەوە نەك بە كەیفی خۆمان تەفسیری بكەین وەكو مورتەددە جەهمیەكان دەیكەن .

**حاكم بغیر ما أنزل الله:** بریتیە لـەو حاكم و دەسەڵاتدارەی كە حوكم بە دینی الله تعالی ناكات.

**مەحكوم بغیر ما أنزل الله:** بریتیە لـەو كەسەی كە حوكم بۆلای ئەو حاكـمە دەبــاتەوە كە حــوكم بە دینــی الله تـعالی ناكــات.

حوكمی حاكم جیایە و حوكمی مەحكوم جیایە ، ئەمە گەورەترین تاوانە كە درۆبەناوەی الله تعالی ــوە بكەیت و قصد و مەبەستی ئایەتەكان بشێوێنیت ، خوای تعالی لـە قورئاندا حاكم بغیر ما أنزل الله بەكافر[488] و تاغوت[489] ناودەبات و باسی ئیمانی نەكردووە لـە باسی حاكماندا .

تەنانەت ئەم ئایەتەیش كە ئەم كەسانەی باسی دەكەن گەورەترین بەڵگەیە دژیان ، هەرلـەو ئایەتەدا خوای تعالی حاكم بغیر ما أنزل الله بە تاغوت ناودەبات ﴿**یتحاكموا الى الطاغوت**﴾[490] ، خوای تعالی لـەم دوو ئایەتە پیرۆزەدا حوكمی

---

[488] (سورة المائدة / ٤٤ – ٤٥ – ٤٧)

[489] (سورة النساء / ٦٠)

[490] (سورة النساء / ٦٠)

حاكم و مەحكوم بغير ما أنزل الله ڕوون دەكاتەوە و لێكی جیادەكاتەوە ، بۆ حاكم تاغوتە و بۆ مەحكومیش بێ بڕوا.

**گوتم** : هەركاتێك یەكێكت لەو جەهمیانە بینی وتی حاكم بغير ما أنزل الله كافر نیە ئەوەتا الله ﷻ دەفەرمووێ بێ ئیمانن.

ئەوا لە وەڵامدا بڵێ: نەخێر هەڵەتكرد، ئەوەی الله تعالى باسی دەكات مەحكوم بغير ما أنزل الله ـە كە خوای تعالى دەفەرمووێ بێ ئیمانن نەك حاكم ، حاكم بابەتەكی ڕوون و ئاشكرایە كافر و تاغوتە، بەڵكو پێویستە ئێمەیش كوفریان پێبكەین، هەروەكو الله تعالى فەرمووی ﴿**وقد أُمروا أن يكفروا به**﴾[491]. واتە : فەرمانیان پێكرابوو كوفر بە تاغوت بكەن .

**دووەم** : لەگەڵ ئەوەیشدا ئەمە واتای ئەوە نیە كە مەحكوم بغير ما أنزل الله موسڵمانە و هیچ كێشەیەك لە دینەكەی نیە ، بەڵكو بابەتی ئەمانیش تفصیلی تێدایە :

١ – ئەگەر هۆكاری گەڕانەوەی حوكمەكەی بۆلای یاسا دەستكردەكان كارێكی زۆر زەرورەت بێت و ناچار بێت بە واتای ناچار ، یان كارێكی ڕۆژانە وەكە كاروباری فەرمانگەكان كە نەكردنی ئەستەم بێت ئەمە وای نازانم تاوان بێت، بەڵام بەمەرجێك لەو شوێنە حوكمی الله ﷻ بوونی نەبێت تاكو بڕواتەوە بۆلای ، بەڵكو لەبەرناچاری ڕوو لە تاغوت دەكات (وەكو فۆرمی خۆراك یان جنسیەی شخصی وهاوشێوەكانی..)

٢– بەڵام ئەگەر كەسێك كە ویستی خۆی حوكم بۆلای یاسادەستكردەكان بباتەوە ، وە بە حوكمی ئەو حاكمانە ڕازی بێت كە یاسای الله تعالى یان لاداوە و حوكم بە یاسای مرۆڤەكان دەكەن كە پێچەوانەی یاسای الله ـە ، وە ئەم حوكمە هەڵدەبژێرێت بەسەر حوكمی الله تعالى ، ئەوا هیچ گومان لە بێ بڕوای و

[491] (سورة النساء / ٦٠)

مونافیقی ئەو کەسە نیە ، وە نیفاقەکەی نیفاقی گەورەیە و پێی کافر دەبێت ، هەروەکو الله تعالی دەفەرمووێ : ﴿**ألم تر الى الذين يزعمون أنهم آمنوا بما أُنزل إليك وما أُنزل من قبلك يريدون أن يتحاكموا إلى الطاغوت وقد أُمروا أن يكفروا به**﴾[٤٩٢] . واتە : ئەی محمد ئایا ئەوانەت بینیوە کە لافی ئەوە لێدەدەن کە ئیمانیان هەیە بەو دینەی بۆ تۆ و پێغەمبەرانی پێش تۆیش هات ، لەکاتێکدا دەیانەوێ حوکم بۆلای تاغوتان ببەنەوە ،کە فەرمانیان پێکرابوو کە کوفر بە تاغوت بکەن نەك شوێنیان بکەون.

**ئەم ئایەتە پیرۆزە بەڵگەیەکی بەهێزە دژی جەهمیەکان ، چونکە خوای تعالی چەند بابەتێکی گرنگمان بۆ ڕوون دەکاتەوە :**

١ – حوکمی حاکم بغیر ما أنزل الله ـی بۆ ڕوون کردینەوە کە تاغوتن.

٢– حوکمی مەحکوم بغیر ما أنزل الله ـی بۆ ڕوونکردینەوە کە مونافیق و بێ بڕوان ، وە یەك ئایەت پاشتر دەبینین الله تعالی دەفەمووی ﴿**وَإِذَا قِيلَ لَهُمْ تَعَالَوْا إِلَى مَا أَنْزَلَ اللَّهُ وَإِلَى الرَّسُولِ رَأَيْتَ الْمُنَافِقِينَ يَصُدُّونَ عَنْكَ صُدُودًا**﴾ . واتە : ئەگەر بەو کەسانە بگوترێ کە لافی بڕواداری لێدەدەن وەرن بۆلای قورئان و سونەت ، ئەبینیت مونافیقان پشتت لێدەکەن .

کەواتە هەرکەسێك پشت لە یاسا و بەرنامەی الله تعالی بکات و ڕوولە یاساکوفرییەکانی سەردەم بکات مونافیقە وە بێ بڕوای گەورەی توش بوە و ئەصڵی ئیمانی لەدەست داوە و پێی کافر دەبێت .

٣– ئەم مەحکوم بغیر ما أنزل الله ـە لێرەدا تەنها ویستی حکم بگەڕێنێتەوە بۆلای تاغوت ، واتە کوفرەکەی تەنها ویستی دڵ بو، هەروەکو الله ﷻ فەرمووی ﴿**يريدون أن يتحاكموا**﴾ واتە : دەیانەوێ حوکم ببەنەوە بۆلای تاغوتان . ئەی ئەگەر ئەمە چارەنوسی کەسێك بێت کە تەنها دەیەوێت حوکم بۆلای تاغوتان

[٤٩٢] (سورة النساء/٦٠)

بباتەوە ، ئەی حوکمی ئەوانە چیە کە هەمیشە حوکم بۆلای تاغوت دەبەنەوە و سـەریان دەخەن ؟؟.

٤- فەرمان بە موسڵمانان کراوە کە کوفـــر بە تاغوت بکـــەن ، ﴿**وقد أمروا أن يـــكفروا بـه**﴾ ، واتـە : فەرمانیان پێکـرابوو کـە کوفر بە تاغوت بکەن . کوفر بە تاغوت مەرجی یەکەمی لاالـەالاالله ـە[493] ، وە هەرکەسێك کوفر بە تاغوت نەکات کافرە و خوێنیشی حەڵاڵە هەروەکو بە مەرفوعی هاتووە لە پێغەمبەرمان ﷺ[494] .

**وە لـە ئایەتی (٦٥) ـیش هەمان حوکم دەیگرێتەوە بە هەمان شێواز ، بەڵام پێویست بە تەفصیلێکی زیاتر دەکات ، ئەمیش بەچەند خاڵێك :**

١ – ئەگەر حوکمی بۆلای غەیری الله ﷻ بردەوە ، ئەمیش جارێك یان دووجار بەبێ ئەوەی حوکمەکەی الله ﷻ پشتخوێ بخات و حوکمەکەی تر بە باشتر بزانێت وەك وتمان بۆ کارێکی زەرورەت وە حوکمی خوایش لـەو شوێنەدا بوونی نەبـیت تا بڕوات بۆلای، ئەوا پێی کافر نابـیت .

٢- بەڵام ئەگەر لـە شوێنێکدا حوکمی خوا ﷻ و حوکمی تاغوتیش بوونی هەبوو ، بەڵام ئەگەر ئەم کەسە پشتی لـە یاساکەی الله تعالی کرد و ڕووی لـە تاغوت کرد ، ئەوا موونافیقە و هیچ گومان لـەمەدا نیە .

**ئیمامی أبوبکر الجصاص** رحمه الله لـە تەفسیری ئایەتی (٦٥) لـە سورەتی النساء دەفەرمووێ : (**هَذِهِ الْآيَةِ دَلَالَةٌ عَلَى أَنَّ مَنْ رَدَّ شَيْئًا مِنْ أَوَامِرِ اللَّهِ تَعَالَى أَوْ أَوَامِرِ رَسُولِهِ ﷺ فَهُوَ خَارِجٌ مِنْ الْإِسْلَامِ سَوَاءٌ رَدَّهُ مِنْ جِهَةِ الشَّكِّ فِيهِ أَوْ مِنْ جِهَةِ تَرْكِ الْقَبُولِ وَالِامْتِنَاعِ مِنْ التَّسْلِيمِ**)[495]. واتە : ئەم ئایەتە بەڵگەیە لـەسەر ئەوەی کە هەرکەسێك شتێك لـە فەرمانەکانی الله تعالی ڕەتبکاتەوە ، یان فرمانەکانی

---

[493] (سورة البقرة / ٢٥٦)

[494] صحيح مسلم / ٢٣ و المعجم الكـبـير للطبراني / ٨١٩٠ و الإيمان للإمام ابن منده / ٣٤

[495] أحكام القرآن لإمام الجصاص : ١٨١/٣

پێغەمبــەرەکەی ﷺ ، ئەوا دەرچووە لـە دینی ئیسلام ، جا هەڵگەڕانەوەیکەی لـە لایەنی گومانەوە بـیت کە گومانی لـە فەرمانەکان هەبووە، یان لـەڕووی قبوڵنەکرد و ملکەچ نەبوون بۆی.

**ئیمامی ابن کثیر** رحمه الله دەفەرمووێ : (**يُقْسِمُ تَعَالَى بِنَفْسِهِ الْكَرِيمَةِ الْمُقَدَّسَةِ: أَنَّهُ لَا يُؤْمِنُ أَحَدٌ حَتَّى يُحَكِم الرَّسُولَ ﷺ فِي جَمِيعِ الْأُمُورِ، فَمَا حَكَمَ بِهِ فَهُوَ الْحَقُّ الَّذِي يَجِبُ الِانْقِيَادُ لَهُ بَاطِنًا وَظَاهِرًا**)[٤٩٦]. واتە : خوای تعالی سوێندی بە زاتی بەڕیز و پاکی خۆی خواردووە : کە هیچ کەسێك بڕوای نیە تاکو پێغەمبـــەری خوا ﷺ نەکات بە حەکەم و حوکمی بۆلای نەگەڕێنێتەوە لـە هەموو بوارەکانی (ژیانی) ، هەرشتێك خۆشەویستمان ﷺ حوکمی پێبکات ئەوا ئەو حوکمە ڕاستیەیە کە پێویستە لـە ئاشکرا و نهێنی بۆی ملـەچ بـیت .

**خوێنەری بەڕێز:** ئەمە جیاوازی نێوان حاکم و محکوم بوو کە بڕیار لـەسەرهەریەکەیان جیاواز و سەربەخۆیە ، بۆیە هەرکەسێك ئەم دوو بابەتەی تێکەڵ بەیەککرد ئەوا بۆی ڕوونبکەوە و ئامۆژگاری بکە .

---

[٤٩٦] تفسير الإمام ابن كثير : ٢/٣٤٩

## شوبهەی چوارەم : حاکمیەت لە تەوحید نیە (پەنابەاللە)

هەرکەسێك بڕوای بەوەنەبێت کە اللە تعالی تاك و بێ شەریکە لە حوکمدا، ئەوا کافرە و موشریکە و مافی بەسەر ئیسلامەوە نەماوە وە حوکمی حوکمی موڕتەددە و خوێن و ماڵیشی بۆ دەوڵەت حەڵاڵە ، چونکە ئەمە ڕەتکردنەوەی دەیەها ئایەتی قورئان و فەرموودەیە و نکۆڵی کردنە لە بەشێکی گەورەی تەوحید .

هەرکەس بلێ حاکمیە ت لە تەوحید نیە ، ئەوا وەکو ئەوە وایە بلێ اللە تاك و تەنها نیە لە حوکمدا ، چونکە تەوحیدی حاکمیەت واتە بەتاك دانانی اللە تعالی لە حوکمدا ، ئەمەیش دەقی ئایەتەکانە کە باسکرا.

**تەوحید** : واتە (**إفراد اللە ﷻ بما یختص بە**) بەتاك ڕاگرتنی اللە تعالی لەوەی کە تایبەتە بە خۆیەوە ، لەگرنگترینی تایبەت مەندیەکانی اللە ـیش بریتیە لەوەی کە اللە ﷻ خۆی حوکم دادەڕێژێ و بەحاکمێکی تر جگە لە خۆی ڕازی نیە ، ئێ کەواتە اللە تەنها خۆی حاکمە ، وە خۆی دەفەرمووێ لە حوکمدا شەریکم نیە هەروەکو لە سورەتی الکهـف: ٢٦ هاتووە ، ئێ ئەمە واتا اللە ﷻ لە حوکم شەریکی نیە و دەتوانین ناوی بنێین تەوحیدی حاکمیەت.

زۆرکەس دەڵێن حاکمیەت تەوحید نیە چونکە زانایانی زوو باسیان نەکردووە، هەرچەندە قسەکە هەڵەیە و زانایان باسیانکردووە ، بەڵام هەندێك فەرموویانە بەشێکە لە تەوحیدی ڕبوبیەت ، بەشێکی تر فەرموویانە بەشێکە لە تەوحیدی ئلوهیەت ، وە دەفەرموون بەشێکە لە تەوحیدی أسمائـ وصفات " کە ئەمە دواتر ڕوون دەکەینەوە".

تەوحید تەنها ئەوەندە نیە بڕوات بە خوا ﷻ هەبێت و تەنها داوا لە ئەویش بکەیت، تەوحید زۆر لەوە فراوانترە کە ئاوا تعریف بکرێت.

تەوحید (بەتاکدانانی اللە ﷻ) هەموو ئەو بابەتانە دەگرێتەوە کە تایبەتمەندن بە اللە ﷻ و مافی کەسیتری تێدانیە ، وە هەرکەسێك ئەو مافانە بداتە پاڵ خۆی پێی دەگوترێت تاغوت (خوای تعالی پەنامان بدات) ، بەڵام پێویستە بۆ خەڵك

ڕوونبکرێتەوە کە تەوحید چیە ؟ تەوحید بەوشێوازە بچوکە نیە کە کەسانێك لێی گەیشتون .

کەسانێك دەڵێن تەوحید ئەوەیە کە بڕوات بەخوا ﷻ هەبێت و بزانیت کە تۆی دروست کردووە، وەکەسانێك تەوحیدیان لەوەندە بچوك کردۆتەوە کە داواکردن بگرێتەوە و باسی غەیری ئەوەناکەن .بێگومان هەردوو بابەتەکە لە تەوحیدە، بەڵام قسەی ئێمە ئەوەیە کە تەوحید زۆر لەوە فراوانترە کە بەو شێوازە تعبیر بکرێت .

## به کورتی: تەوحید چیە ؟

تەوحید بریتیە لە بەتاك ڕاگرتنی الله ﷻ بەو شتەی کە تایبەتە بە خۆیەوە . ئائەمە شاملترین پێناسەی تەوحیدە . خۆ ئەگەر بوترێت تەوحید ئەوەیە تەنها داوا لە خوا بکەین ، یان ئەوەیە کە بڕوامان بە خوا هەبیت ، ئەم پێناسەیە هەڵەیە بۆ تەوحید چونکە گشتگیر نیە و هەموو بوارەکانی تەوحید لە خۆیدا کۆناکاتەوە .

### تەوحید چەند جۆرە ؟:

هەموو تایبەتمەندیەکانی الله تعالى دەگرێتەوە کە پێویستە بەندە لەو تایبەت مەندیانە الله تعالى بە تاك ڕابگرێت[٤٩٧]، بەڵام بە شێوەیەك کە بتوانین ئەو هەموو تایبەت مەندییە کۆبکەینەوە ، ئەوا دەتوانین بڵێن تەوحید سێ جۆرە کە ئەو سێ جۆرەیش کۆکەرەوەی هەموو تایبەتمەندییەکانی الله تعالى ـن:-

**یەکەم : تەوحیدی ڕبوبیەت :**

پێویستە بیروبڕوات وابیت کە : تەنها الله تعالى دروستی کردوین و تەنها خۆیشی دەمانژیینێت و مردنیشمان هەر بەدەستی ئەوە ، هەرئەویش خاوەن حوکمی ئەم گەردوونەیە ، هەرخۆیشی ڕۆزی بۆ بەندەکانی دەدات ..هتد .

[٤٩٧] تایبەت مەندییەکانی الله تعالى : هەندێکی کار وهەندێکی ناو وسیفەتن وهەمدێکیشی مافن.

ئائەمە تەوحیدی ڕبوبـیەتە، کە زۆرێك لـە کافرانی زوویش و سەردەمیش بڕوایان پێ هەبوو و هەیە ، بەڵام ڕزگاری نەکردن لـە سزای الله ﷻ و نەیشیانکات ، چونکە ئەمە تەنها چمکێکی تەوحیدە و تەوحیدی تەواونیە.

**دووەم : تەوحیدی ئلوهیەت :**

بریتییە : إفراد الله بالعبادة : واتە بەتاکڕاگرتنی الله ﷻ بە عیبادەت ، واتە پێویستە تەنها الله ﷻ بپەرستین و عیبادەت تەنها بۆ ئەو بکەین . ئەمە چەقی ململانێی کافران و ئەهلی تەوحید و ئیسلامە ، کە ئەمڕۆیش کافران و موشریکان ئەوانەی کە شەریك بۆ الله تعالی قەراردەدەن لـەم جۆرەی تەوحید ڕوخاون .

**سێهەم : تەوحید و ناو و سیفەتەکانی الله تعالی :**

خوای تعالی کۆمەڵی ناو سیفەتی پاك و پیرۆزی هەیە کە تەنها شایەنی خۆین و هیچ کەسێك بۆی نیە تعطیل یان تحریف یان تأویلی فاسدی بۆ بکات .

ئەمە هەرسێ جۆرەکەی تەوحیدە سەرەکییەکە بوو ، وە هەموو تایبەتمەندیەکانی الله تعالی لـە ژێر سێبەری ئەم سێ جۆرەی تەوحید کۆدەبنەوە ، هەر لـە حاکمیەت و محبة وطاعة ...هتد ، بۆیـــە دەبـێت باسی بکەین و بـیسەلمێنین کە حاکمیەت لـە ئەصڵی تەوحیدە و هەرکەسێك پشتی لـێبکات و تووشی شیرك بـیت تێیدا ئەوا موشریکە وە وەکو ئەوەوایە بت و پەیکەری پەرستبـێـت .

## تەوحیدی حاکمیەت

وەك وتمان تەوحید بریتیە : (إفراد الله بما يختص به) . واتە بەتاکدانانی خوای تعالی لـەو تایبەتمەندیانەی تایبەتن بە خۆیەوە ﷻ ، ئایە حوکم و حوکمڕانی لـە تایبەتمەندییەکانی الله تعالی نین ؟؟ ، بـێگومان بەڵێ ، وەهەرکەسێك نکۆڵی لـەمە بکات و موشریکە و مورتەددە ، چونکە بە دەیەها ئایەت و فەرمووددەمان هەیە کە بۆمانی دەسەلمێنن کە الله تعالی لـە حوکمدا شەریکی نیە ، خوای تعالی دەفەرمووێ ﴿**ألا له الخلق و الأمر**﴾ . واتە دروستکاری و حوکم بۆخوایە ﷻ، ببـینە الله تعالی

دوو تایبەتمەندی خۆی لێرەدا کۆکردەوە ، هەم خەلق و هەمیش حوکم ، هەروەکو چۆن الله تعالی خالق و دروستکاری هەموو شتێکە ، ئاوایش تەنها خۆی ﷻ حاکمە و کەسی تر مافی حوکمدانی نیە کە حوکمەکەی پێچەوانەی حوکمەکەی الله تعالی بیت ، هەروەکو چۆن هەرکەسێك بڕوای بە خالقێتی الله ﷻ نەبیت مافی بەسەر ئیسلامەوە نیە ، ئەوهایش هەرکەسێك بڕوای بەوە نەبیت کە تەنها الله تعالی حوکمڕانە و کەسی تر شەریکی نیە ئەوا کافرە و مافی بەسەر ئیسلامەوە نەماوە ، چونکە وەك وتمان نەفی کردنی هەرتایبەت مەندییەکی الله تعالی کوفرە .

وە ئەم ئایەتە ڕەددێکی بەهێزیشە لەسەر جەهمیەکانی زوو ، دەبینین کە خوای تعالی لێرەدا جیاوازی دەکات لە نێوان و خەلق و ئەمر کە بە جیا باسی دەکات ، کەواتە حوکم و بڕیاری الله مەخلوق نیە .

**ئایەتی دووەم** : موسڵمانی یەکخواپەرست بزانە کە دینی ڕاست و دروست ، وە موسڵمانی ڕاستگۆ لەگەڵ الله تعالی ئەو موسڵمانەیە کە خوای تعالی بەتاك ڕادەگرێت لە حوکمدا و پەرستنیش تەنها بۆ ئەو دەکات ، لە هیچ یەکێك لەم دوو خاڵەدا شەریك بۆ الله ﷻ قەرار نادات، بۆیە دەبینین خوای تعالی دەفەرمووێ : ﴿**إِنِ الْحُكْمُ إِلَّا لِلَّهِ أَمَرَ أَلَّا تَعْبُدُوا إِلَّا إِيَّاهُ ذَلِكَ الدِّينُ الْقَيِّمُ وَلَكِنَّ أَكْثَرَ النَّاسِ لَا يَعْلَمُونَ**﴾[498]. واتە : حوکم بۆ کەس نیە ئیللا بۆ الله تعالی ـە، ئەم حاکمە بڕیاریداوە کە تەنها خۆی بپەرسترێت ، ئائەمە دینە ڕاستەکەیە، بەڵام زۆرینەی هەرەزۆری خەڵك ئەم ڕاستییە نازانن .

گوتم : الله تعالی لەم ئایەتە پیرۆزەدا چەند دەرسێکمان فێر دەکات ، لەوانە:

**یەکەم** : حوکم تەنها مافی الله تعالی ـە ، ئەمە ڕوونترین بەڵگەیە کە دەیسەلمێنێت کە الله تعالی تەنها خۆی مافی حوکمدانی هەیە کە تەوحیدی حاکمیەت دەگرێتەوە.

---

[498] (سورة يوسف / ٤٠)

**دووەم**: بە تاکڕاگرتنی الله ﷻ لـە حوکمدا و پەرستنی پێکەوە بەستەوە .

**سێیەم**: هەردوو خاڵەکەی بە دینە ڕاستەکە ناوبرد کە واجبە شوێنی بکەوین.

**چوارەم**: لـێرەدا زۆر بە ڕوونی پەیوەندی حاکمیەت بە ڕبوبـیەتەوە دەبـینین کە دواتر دێینەسەری .

**ئایەتی سێیەم** : خوای تعالی لـە حوکمدا تاکە و شەریکی نیە ، دووبارە و سێ بارە و سەدد بارەیشی دەکەینەوە ، هەرکەسێك شەریك بۆ الله تعالی قەراربدات لـە حوکمدا ، موشریکە و موەحید نیە ، چونکە الله تعالی لـە حوکمدا تاکە و شەریکی نیە ، هەروەکو خۆی فەرموویەتی ﴿**ولا يشرك في حكمه أحدا**﴾ . واتە : خوای تعالی لـە حوکمدا کەسی نەکردووە بە شەریکی خۆی .

کەواتە ئەی بەندەی الله ، الله تعالی بە تاك ڕابگرە لـە حاکمیەتدا ، چونکە الله تعالی تەنها خۆی مافی حوکمدانی هەیە کەس بۆی نیە خۆی بکات بە شەریکی الله، ئەگینا تووشی طغیان دەبـیت و شوێنکەوتوانیشیان اسمی مشرك لـەسەریان دەچەسپێت.

**ئایەتی چوارەم** :خوای تعالی دیسان بۆمانی ڕوون دەکاتەوە کە تەنها خۆی مافی حوکمدانی هەیە و کەس شەریکی نیە ، هەروەکو فەرموویەتی ﴿**والله يحكم لا معقب لحكمه**﴾. واتە : الله تعالی خۆی حوکم دەدات و کەس نیە بڕیار و حوکمەکانی الله تعالی هەڵبوەشێنێتەوە و خۆی حوکم بکات . ئەی ئەگەر کردی ئەوا طغیانی کردووە و تاغوتە .

**ئایەتەکانی تر** :کۆمەڵێك ئایەتی تر لـە قورئانی پیرۆزدا بەڵگەن لـەسەر ئەمە ، وە تەوحیدی حاکمیەت و تاك و تەنهای الله تعالی ـمان بۆ دەردەخەن لـە حوکمدا ، خوای تعالی دەفەرمووێ ﴿**أَمْ لَهُمْ شُرَكَاءُ شَرَعُوا لَهُمْ مِنَ الدِّينِ مَا لَمْ يَأْذَنْ بِهِ اللَّهُ وَلَوْلَا كَلِمَةُ الْفَصْلِ لَقُضِيَ بـينَهُمْ وَإِنَّ الظَّالِمِينَ لَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ**﴾[٤٩٩] . واتە ئایا ئەو

[٤٩٩] سورة الشورى / ٢١

کەسانە کەسانێکیان کردووە بە شەریکی الله ﷻ کە حوکمیان بۆ دابڕێژن و بە کەیفی خۆیان حەڵاڵ و حـــەڕام بکـەن ؟لە کاتێکـــدا الله ﷻ بەمە ڕازی نیـــە!، ئەگەر بڕیاڕی الله ﷻ نەبوایـــە لـەسەر ئەوەی کە لـە سزایان هەڵدەگرێت بۆ قیامەت ، ئەوا لـە دونیایش عەزابی دەدان ، بەڵام لـە قیامەتدا ئەم زاڵـم و موشریکانە سزایەکی بەهێز دەدرێن پەنابەخوا .

**ئیمامی الطبري** رحمه الله زاڵـمان بە کافران ناودەبات و دەفەرمووێ (**وإن الكافرين بالله لهم يوم القيامة عذاب مؤلم مُوجع**) ، واتە بەڕاستی ئەو کەسانەی کە کافربوون بەرامبەر بە الله ﷻ لـە ڕۆژی قیامەتدا سزا و سوتانێکی سەختیان بۆ هەیە .

دەبـینین الله تعالى لـەو ئایەتە پیرۆزەدا هەموو ئەو کەسانەی کە یاسا و شەرع بۆ خەڵك دادەنێن بە کەسێك نیشانمان دەدات کە کرابـێت بە شەریکی الله تعالى لـە حوکمدا (پەنابەخوا) کە پێی دەبـێت بە تاغوت و شوێنکەوتاونیشی بە موشریك .

وە هەروەها فەرموویەتی : ﴿**وماختلفتم في شيئ فحكمه إلى الله**﴾ . واتە : خۆ ئەگەر لـە شتێکدا خیلافتان بۆ دروست بوو ئەوا حوکمەکەی ببەنەوە بۆلای الله ﷻ . چونکە تەنها ئەو مافی حوکمدانی هەیە و کەس شەریکی نیە.

وە هەروەها الله تعالى فەرموویەتی : ﴿**ثُمَّ رُدُّوا إِلَى اللَّهِ مَوْلَاهُمُ الْحَقِّ أَلَا لَهُ الْحُكْمُ وَهُوَ أَسْرَعُ الْحَاسِبِينَ**﴾[500] . واتە : پاشان دەگەڕێنرێنەوە بۆلای الله ﷻ کە پەرستراوی بە حەقتان، بزانن کە حوکم تەنها بۆ ئەوە ﷻ، وە الله تعالى لێپرسینەوەی خێراترە لـە هەموو کەس.

**گوتم** : ئەمە بەشێکی کەمە لـەو ئایەتانەی کە بەڵگەن لـەسەر تەوحید و بەتاکدانانی الله تعالى لـە حوکمدا ، دەبـینین خوای تعالى نەفی لـە هەموو کەسێك دەکات ئەگەر بـیەوێت بـیتە ئەو سنورە و حوکمبدات ، بۆیـــە الله تعالى بە تاغوت و بە شەریککراوی الله تعالى ناوی دەبات کە پێشتر بە تفصیلـتر باسکرا .

---

[500] سورة الأنعام / ٦٢

وە پێغەمبـــەری خوایش بە سەنەدێکی بەهێز لێوەی هاتووە کە تەنانەت پێی ناخۆش بووە خەڵك بە أبو الحكميش بانگ بکرێت ، بەڵکو کونیەکەی بۆ گۆڕیون وە فەرموویەتی ((إن الله هو الحكم و إليه الحكم))[501] . واتە خوای تعالى خۆی حاکمە و حوکمیش تەنها بۆلای خۆی دەگەڕێنرێتەوە .

ئائەمە بەشێکی کەم بوو لە بەڵگەکان لە قورئان و سونەت کە باس لە تاك و تەنهای الله تعالى دکات لە حوکمدا ، وە بۆی ڕوونکردینەوە کە الله تعالى لە حوکمدا شەریکی نیە . بۆیە پێویستە بزانین کە هەرکەسێك تەوحیدی حاکمیەت لە خۆیدا جێبەجێ نەکات ئەوا موسڵمان نیە ، واتە پێویستە بڕوات وابـیت کە تەنها الله ﷻ حاکمە و لەکاتی کێشەیەکیشدا حوکم بۆلای یاسای الله تعالى ببەیتەوە.

**تەوحیدی حاکمیەت دچێتە ژێربار لەکام سێ جۆرەکەی تەوحیدەوە ؟ :**

تەوحیدی حاکمیەت پەیوەندیدارە بە هەرسێ بەشەکەی تەوحیدەوە ، وە جێگای خۆی لە هەرسێکیاندا هەیە ، بۆیـــە هەرکەسێك تووشی شیرك بـیت لە تەوحیدی حاکمیەت ، ئەوا تووشی شیرك بووە لە هەرسێ جۆرەکەی تەوحید .

**حاکمیەت و ڕبوبـیەت** : وەك باسمانکرد تەوحیدی ڕبوبـیەت ئەوەیە کە بڕوامان وابـیت کە کارەکانی الله تعالى تەنها شایەنی خۆیەتی و کەس شەریکی نیە ، وەکو دروستکار ، تەنها خوای تعالى دروستکاری ئەم گەردوونەیە و کەسی تر ئەو تایبەت مەندیەی نیە ، چونکە الله تعالى خۆی دەفەرمووێ ﴿الله خالق كل شيئ﴾ . واتە : دروستکاری هەموو شتێك الله ـە (سبحانه وتعالى) .

ئایا حوکمیش تایبەتمەندی الله تعالى نیە ؟ : بـێگومان بەڵێ ، بەڵگەیشمان ئەو هەموو ئایەتو فەرموودەیەبوو کەباسمانکرد کە تەنها الله ﷻ شایەنی حوکمڕانیـــە ،

---

[501] الأدب المفرد لإمام البخاري / ١٨٧ و سنن أبو داود : ٢٨٩/٤ و السنن الكبرى لنسائي : ٤٦٦/٣ و السنن الكبرى للبـيهقي : ٢٤٣/١٠ .

کەواتە حاکمیەت بەشێکە لە ڕبوبـیـەت چونکە یەکێکە لـە تایبەتمەندییەکانی اللە تعالی ، بۆیــە خوای تعالی ئەمەمان بۆ باس دەکات و دەفەرمووێ : ﴿**ألا له الخلق و الأمر**﴾[502] . واتە : دروستکردنی گەردون و خاوەن بڕیار و خاوەن حوکم هەربۆ اللە تعالی ــە . وە هەروەها فەرموویەتی : ﴿**وَاللَّهُ يَحْكُمُ لا مُعَقِّبَ لِحُكْمِهِ**﴾[503] . واتـــە : اللە تعالی حوکم دەدات و لـە کەسیش قبول ناکات حوکمەکانی هەڵبوەشێنێتەوە ، وە بۆ هیچ کەس نیە کە لـە خوا بپرسێت بۆچی ئاوا حوکمتداوە ، چونکە ئەو خاوەنی گەردوونە و خۆی ﷻ دروستی کردووە.

**وشەی الأمر(فەرمان) لـە قورئانی پیرۆزدا بۆ دوو واتا بەکار دێت :**

١ – فەرمانی گەردوونی : هەروەکو اللە تعالی فەرموویەتی ﴿**وَمَا أَمْرُنَا إِلَّا وَاحِدَةٌ كَلَمْحٍ بِالْبَصَرِ**﴾[504]. واتە فەرمانی ئێمە کاتێك فەرمانمان بە شتێك کرد کە ببـیت یەك وشەیە لـە چاوترووکانێکدا دەبـیت .

٢– فەرمانی شەرعی : ئەمە ئەوەیە کە باسی دەکەین و شوێنی بەستنەوەی تەوحیدی حاکمیەتە بە ڕبوبـیـەتەوە ، هەروەکو خوای تعالی دەفەرمووێ ﴿**وَجَعَلْنَا مِنْهُمْ أَئِمَّةً يَهْدُونَ بِأَمْرِنَا لَمَّا صَبَرُوا وَكَانُوا بِآيَاتِنَا يُوقِنُونَ**﴾[505] . واتە : لـەناو بنی إسرائیل کەسانێکمان لـێیانکرد بە پێشەوای خەڵك ، چونکە ڕێنموی خەڵکیان بە فەرمانەکانی ئێمە دەکرد و یەقینیان بە دین هەبوو .

بۆیە تەوحیدی ڕبوبـیـەت تەنها بـیروباوەڕی دڵە و پەیوەندی بە کاروکردەوەوە نیە لـەگەڵ ئەوەیشدا پێویستە ملکەچی بـیت ، بڕوامان وایە تەنها خوای تعالی ئێمەی دروست کردووە و خاوەن حوکم و بڕیاریشمان هەرئەوە . بۆیــە پێغەمــبەران هەموویان ئەمە عقیدەیان بووە کە خوای تعالی ڕەوانەی کردوون .

---

[502] (سورة الأعراف / ٥٤)

[503] (سورة الرعد / ٤١)

[504] (سورة القمر / ٥٠)

[505] (سورة السجدة / ٢٤)

**إبراهيم (عليه السلام):** باوكی پێغەمبەران پێشەوای موەحیدان إبراهیم پێغەمبەر ﷺ دەیفەرموو ﴿**الَّذِي خَلَقَنِي فَهُوَ يَهْدِينِ**﴾[٥٠٦]. واتە : ئەو خودایەی کە دروستی کردووم هەر ئەویش ڕێنمایم دەکات و بەرنامەم بۆ دەکێشێت.

**موسی (علیه السلام):** تاغوتێکی وەکو فیرعەون پرسیاری لە پێغەمبەر موسی و هارون (علیهما السلام) کرد ، ئایە خودای ئێوە کێیە ؟ موسی ـیش وەڵامی دایەوە و هەردوو تەوحیدی ڕبوبیەت و حاکمیەتی بۆ باسکرد و فەرمووی ﴿**قَالَ رَبُّنَا الَّذِي أَعْطَى كُلَّ شَيْءٍ خَلْقَهُ ثُمَّ هَدَى**﴾[٥٠٧]. واتە خودای من ئەو خودایەیە کە هەموو شتێکی بە ڕێك و پێکی دروستکردوە و هەر ئەویش بەرنامەیان بۆ دادەنێت و ڕێنموویان دەکات بە بەرنامەکەی خۆی .

پوختەی قسە: تەوحیدی ڕبوبیەت بریتیە لە بەتاك ڕاگرتنی الله ﷻ لە کارەکانی خۆیدا، وەکو خلق و تدبیر..هتد، لە نێویشیدا حوکمکردن کە تایبەتە بەالله ﷻ.

**حاکمیەت و ئەسماء وصفات:** دیارە بەڵگەکان زۆر زۆرن لەم بارەوە کە پەیوەندی ڕاستەوخۆی تەوحیدی حاکمیەت و ناو و سیفەتەکانی الله تعالی نیشانمان دەدات ، یەکێك لە ناوەکانی الله تعالی (الحكم) ـە ، وە حوکم و حوکمڕانیش سیفەتی پاك و بەرزی الله تعالی ـە ، هەروەکو خۆی فەرموویەتی ﴿**والله يحكم لا معقب لحكمه**﴾ . وە لە فەرموودەکەی سەروەرمان هاتووە کە فەرمووی ((إن الله هو الحكم..)) ئائەمانە و غەیری ئەمانیش بەڵگەن لەسەر وابەستەبوونی ڕاستەوخۆی ئەم دوو تەوحیدە ، بۆیە هەرکەسێك شەریك بۆ الله تعالی قەراربدات لە حوکمدا ، ئەوا لە هەمان کاتتدا شەریکی لە تەوحیدی ناو و سیفەتەکانیش قەرار داوە(والله المستعان) .

---

[٥٠٦] (سورة الشعراء / ٧٨)

[٥٠٧] (سورة طه/٥٠)

**حاكميەت وئلوهيەت:** ڕوونترینی بەڵگەکان و ئاسانترینیان بۆ تێگەیشتن، پەیوەندییە ڕاستەوخۆکەی نێوان تەوحیدی حاکمیەت و تەوحیدی ئلوهیەتە، وەك پێشتر باسکرا چەقی ململانێی نێوان ئەهلی کوفر و ئەهلی ئیمان ئەم تەوحیدەوە، کافران زۆرینەیان بڕوایان بە ڕبوبیـەت و ئاسماو وصفاتی الله تعالی هەیە ، بەڵام ئەو بڕوابوونەیان سوودی پێنەگەیاندن ، چونکە لـە تەوحیدی ئلوهیەت تووشی شیرك بوبون ، کەواتە ئەم تەوحیدە زۆر زۆر گرنگە .

تەوحیدی ئلوهیەت : مادام الله تعالی دروستی کردووین و خاوەن بڕیارمانە، بۆیـە ئێمەیش تەنها ئەو دەپەرستین، ئائەمەتەوحیدی ئلوهیەتە، ئایا گەڕانەوەی حوکم بۆلای الله تعالی عیبادەت نیە ؟؟؟

بـێگومان بەڵێ : چونکە الله تعالی پێی خۆشە وە لـە دەیەها شوێن فەرمانمان پێدەکات کە حوکمی بۆلا بگەڕێنینەوە ، کەواتە گەڕانەوەی حوکم بۆلای الله تعالی عیبادەتە، هەر عیبادەتێکیش بۆ غەیری الله تعالی بکرێت شیرکە، کەواتە گەڕانەوەی حوکم بۆلای یاسا دەستکردەکان شیرکە ، ئائەمە پەیوەندیە بە هێز و ڕوونەکەی نێوان ئەم دوو تەوحیدەیە ، بۆیــە خوای تعالی دەفەرمووێ ﴿**وإن أطعتموهم إنكم لمشركون**﴾ . واتە: خۆ ئەگەر گوێڕایەڵی ئەو تاغوتانەتان کرد لـە گۆڕینی یاساکانی الله تعالی و حەڵاڵ و حەرامدا ، ئەوا ئێوە لـە موشریکانن . وە هەروەها فەرموویەتی ﴿**ولا يشرك في حكمه أحدا**﴾ . واتە : خوای تعالی کەسی نەکردووە بە شەریکی خۆی لـە حوکمدا ، وە فەرموویەتی ﴿**ومن لم يحكم بما أنزل الله فأولئك هم الكافرون**﴾ . واتە : هەرکەسێك حوکم بەو قورئانە نەکات لـە کافرانە .وە غەیری ئەم ئایەتانە کە پێشتر باسکرا .

# ئەو فەرموودەیەی کە جوانترین ڕوونکردنەوەیە بۆ تەوحید حاکمیەت

ئیمامی بوخاری وئیمامی أبوداود و غەیری ئەوانیش بە سەنەدێکی بەهێز ڕیوایەتیان کردووە لە شوریحەوە لە باوکیەوە کە دەفەرمووێ : «أَنَّهُ لَمَّا وَفَدَ إِلَى رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ مَعَ قَوْمِهِ سَمِعَهُمْ يَكْنُونَهُ بِأَبِي الْحَكَمِ، فَدَعَاهُ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، فَقَالَ: «إِنَّ اللَّهَ هُوَ الْحَكَمُ، وَإِلَيْهِ الْحُكْمُ، فَلِمَ تُكْنَى أَبَا الْحَكَمِ؟» فَقَالَ: إِنَّ قَوْمِي إِذَا اخْتَلَفُوا فِي شَيْءٍ أَتَوْنِي، فَحَكَمْتُ بَيْنَهُمْ فَرَضِيَ كِلَا الْفَرِيقَيْنِ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: «مَا أَحْسَنَ هَذَا، فَمَا لَكَ مِنَ الْوَلَدِ؟» قَالَ: لِي شُرَيْحٌ، وَمُسْلِمٌ، وَعَبْدُ اللَّهِ، قَالَ: «فَمَنْ أَكْبَرُهُمْ؟» قُلْتُ: شُرَيْحٌ، قَالَ: «فَأَنْتَ أَبُو شُرَيْحٍ»[٥٠٨]. واتە کاتێك هانیئ هاتە خزمەتی پێغەمبەری خوا ﷺ لەگەڵ عەشیرەت و کەس و کارەکەیدا ، پێغەمبەری خوا ﷺ گوێی لێبوو کە خەڵکەکە بە هانیئ دەڵێن (أبو الحکم) ، پێغەمبەری خوا ﷺ بانگی کرد و فەرمووی (خوای تعالی خۆی حاکمە و حوکمیش هەر بۆلای خۆی دەبرێتەوە ، بۆ چی بە أبا الحکم بانگت دەکەن (کونیەکەت بۆ أبو الحکمە؟) هانیئ وتی : قەومەکەم ئەگەر لە شتێکدا جیاوازیان تێکەوت دێن بۆلام و حوکم دەکەم لە نێوانیان و هەردوولا بە حوکمەکەم ڕازی دەبن ، پێغەمبەری خوا ﷺفەرمووی ، ئایا کوڕت نیە ؟ هانیئ وتی شورەیح و مسلم و عبداللە م هەیە ، پێغەمبەی خوا ﷺ فەرمووی (کامیان گەورەکەیانە؟) هانیئ وتی : شورەیح ، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی (کەواتە تۆ أبو شریحی) (نەك أبو الحکم) .

ئەوەی ئێمە مەبەستمانە ئەوەیە کە خۆشەویستمان فەرمووی (إن الله هو الحكم و إليه الحكم) . واتە خوای تعالی خۆی حەکەمە و حوکمیش هەربۆلای ئەوە .

---

[٥٠٨] رواه أبوداود / ٤٩٥٥ و سنن النسائي / ٥٣٨٧

## ئەم فەرموودەیە دووبەشە

**یەکەم** : (إن الله هو الحكم..) . واتە : الله خۆی حەکەمە ، ئائەمە پەیوەندی نێوان تەوحیدی حاکمیەت لەگەڵ ڕبوبـیـەت و ناو و سیفەتەکان نیشان دەدات ، چونکە : حەکەم ناوێکە لە ناوەکانی الله تعالی کە ئەمە بەشی أسماء و صفاتە ، وە تایبەتمەندییەکی الله تعالی ـە و کەسی تر خاوەنی نیە .

**دووەم** : پاشان فەرمووی (و إليه الحكم) واتە : حوکمیش هەربۆلای ئەوە، ئائەمە بەشەکەی تەوحیدی ئلوهیەتە کە خۆی لە کارکردەوەی ئێمەدەبـینێتەوە کە بۆ الله تعالی ئەنجامی دەدەین، ئائەم فەرموودەیە بەم شێوازە حاکمیەتی بۆ ڕوونکردینەوە .

گوتم : بەڵگەکان لەسەر ئەوە زۆر زیاترن کە بۆمانی دەسەلمێنن کە الله تعالی لە حوکمدا تاك و شەریکی نیە ، هەروەکو چۆن لە دروستکاریدا شەریکی نیە، لە نوێژ و ڕۆژوو نابـیت کەس بکەیتە شەریکی الله تعالی، بەهەمان شێوە لە گەڕانەوەی حوکمیش نابـیت کەس بکەیت بە شەریکی الله ﷻ، چونکە ئایەتەکانی قورئان و فەرموودەکان بەڵگەن لە وەحدانییەتی الله تعالی لە حوکمدا ، هەرکەسێك پێی وابـیت کە الله ﷻ شەریکی هەیە لە حوکمدا ، ئەوا کافرە و موشریکە و مافی بەسەر ئیسلامەوە نەماوە .

## شوبهەی پێنجەم : جحد و إستحلال و تفضيل

ئەهلی ئیرجاء چونکە بڕوایان بە کوفری عملی نیە (ئەگەر چی بە زمان وانالێن)، بۆیـــە هەموو جۆرەکانی کوفری عملی دەبەستنەوە بە إعتقادی دڵ کە ئەمە بـیروباوەڕی مورجیئەیە، دەڵێن حاکم بغیر ما أنزل الله کافر نیە تاکو جحد یان إستحلال یان تفضیل لـە دڵیدا نەبـیت، وە مەبەستیشیان یاسا دەستکردەکانە .

**جحد** : واتە نکۆڵی کردن لـە حوکمەکەی الله تعالی .

**إستحلالیش**: واتە بە حەڵاڵزانینی حوکم کردن بە غەیری قورئان .

**تفضیلیش**: واتە حاکمەکە حوکمەکەی خۆی بە باشتر دەزانێت لـە حوکمەکەی خوای تعالی .

**گوتم** : ئەم بابەتە نە بە مطلقی مقبولـە، نە بە مطلقی مردودە، بەڵکو تفصیلی تێدایە، ئەگەر حاکمێك حوکمی بە قورئان نەکرد لـە بابەتێکی دیاریکراو بۆ جارێك یان دووجار ، ئەوا کافر نابـێت تاکو تووشی جحد یان إستحلال یان تفضیل دەبـیت، چونکە لـەم حاڵەتەدا کوفرەکە کوفری بچوکە و بە مجردی فعلـەکە پێی کافر نابـیت. وە زانایانی ئەهلی سونە ئەمە مەبەستیانە لـەو سێ مصطلحە کە پێشتر لـە وتەی زانایان ڕوونمانکردەوە.

بەڵام حاکمێك کە دەستە چەپەڵـەکانی بۆ یاسای قورئان ببات و لایاندات و بـیانگۆڕێت بە ویستی خۆی، وە لـە جیاتی ئەوە بە ڕئی خۆی و هاوکارە تاغوتەکانی، یان نەتەوە کافر و یەکگرتووەکان ، یان شەرعە مەنسوخەکانی هێنایە جێی حوکمەکەی قورئان، ئەوا کوفرەکەی کوفری گەورەیە بە إجماع ، ئەمە هێڵی سوورە کە نابـیت حاکم نزیکی بکەوێتەوە، ئەگینا کافر دەبـیت ئەگەر چی تووشی ئەو سێ حاڵەتەیش نەبوبێت، چونکە ئەمە خوودی خۆی کوفری گەورەیە بە مجرد فیعلـەکە پێی کافر دەبـیت .

بۆ نمونە کەسێك دەبـینین بتێك دەپەرستێت، ئایا گرنگی دەدەیـــن ئەوەی کە بە

حەڵاڵی دەزانێت ؟؟ هەرگیز نەخێر چونکە ئەمە خوودی خۆی شیرکی گەورەیە، هەرگیز بیستوتە پێغەمبەری خوا ﷺ چوبیت بۆلای قورەیش وپرسیاری لێکردبیتن: ئایە کارەکەی خۆتان بە حەڵاڵ دەزانن یان نا؟؟

نەخێر هەرگیز، چونکە کارێك یان گوفتارێك کە خودی خۆی کوفر یان شیرکی گەورەبیت ئەو مەرجەی بۆ ناهێنرێتەوە، بەڵام ئەوە بۆ کارێکە کە کوفری بچوك یان شیرکی بچوك بیت .

بۆنمونە: کەسێك سوێند بە غەیری الله ﷻ دەخوات، کە ئەمە شیرکی بچوکە، ئەگەر سوێندەکەی خۆی بەباشتر زانی یان بە حەڵاڵی زانی ئەوا ئەوکات کافر دەبیت.

ئەگەر حاکمێك جارێك یان چەند جارێك لە حوکمەکەی الله ﷻ لایدا، بەبێ ئەوەی یاسابگۆڕێت، ئەوا ئێمەیش دەڵێین کافر نابیت تاکو تووشی یەکێك لەو سێ حاڵەتە نەبێتەوە، بەڵام حاکمێك کە بەکەیفی خۆی دەستکاری یاساکانی قورئان دەکات ، تەنانەت وەکو ئەمڕۆ حوکمی قورئانەکە لادراوە و لە جێی ئەوە بیروبۆچوونی دوژمنانی خوا ﷻ چەسپێنراوە ، ئەوا هیچ گومانێك لە کوفر و ڕیددەی ئەو کەسەدا نیە ، ئەگەرچی خۆیشی بە موسڵمان بزانێت .

## شوبههى شهشهم: ئهو حاكمانه وهلى ئهمرى شهرعين !

الله هاوكار بێت ئهم بابهته به تهفصيلهوه ڕووندهكهينهوه .

**وهلى ئهمر كێيه ؟** : وهلى ئهمر واته سهرپهرشتيارى كار يان بهڕێوبهر يان خاوهن بڕيار.

**وهلى ئهمرى شهرعى كێيه ؟** : وهلى ئهمرى شهرعى بهو كهسه موسڵمانه موهحيده دهگوترێت كه سهرپهرشتيارى كارى موسڵمانانه.

## وهلى ئهمرى شهرعى چهند جۆرێكن

### يهكهم: زانايانى ئاينى :-

**ئيمامى عبدالله بن عباس** رضي الله عنه: ئيمامى الحاكم[509] وه عبدالرحمن بن أبي حاتم[510] وه الطبري[511] وه اللالكائي[512] وه غهيرى ئهوانيش ڕيوايهتيان كردووه له ڕێگهى أبو صالح ـوه له معاويهى كوڕى صالح ـوه له على كوڕى أبي طلحةوه له ابن عباسهوه كه دهربارهى وهلى ئهمر فهرموويهتى (**أَهْلَ الْفِقْهِ وَالدِّينِ**) واته : ئههلى فيقه و دينن. (بهڵام سهنهدهكهى لاوازه).

**ئيمامى جابر بن عبدالله** رضي الله عنه: ئيمامى ابن أبي حاتم[513] و ابن أبي شيبة[514] و الحاكم[515] و ابن عبدالبر[516] وه غهيرى ئهوانيش ڕيوايهتيانكردووهله ئيمامى جابرهوه كه فهرموويهتى (**أُولُو الْفِقْهِ أُولُو الْخَيْرِ**) واته : وهلى ئهمر ئههلى فيقهو و خهيره. (سهنهدهكهى بههێز نيه).

---

[509] المستدرك لإمام الحاكم / ر.٤٢٣

[510] تفسير القرآن العظيم مسنداً لإمام ابن أبي حاتم / ر.٥٥٣٤

[511] جامع البيان لإمام الطبري : ٨/٥٠٠

[512] شرح أصول إعتقاد / ر.٧٨

[513] تفسيرالإمام ابن أبي حاتم /ر. ٥٥٣٠

[514] مصنف لإمام أبوبكر ابن أبي شيبة / ر.٣٢٢٠٠ – ط . السلفية

[515] المستدرك لإمام الحاكم النيسابوري / ر.٤٢٢

[516] جامع بيان العلم / ر.١٤١٧

بەڵام ئیمامی البیهقي[517] وە الخطیب البغدادي[518] وە غەیری ئەوانیش ڕیوایەتیان کردووە بە ڕێگایەکی تر کە پاڵپشتی ڕیوایەتی سەرەوە دەکات و پێکەوە دەگەن بە پلەی (حسن).

**ئیمامی مجاهد بن جبر** رحمه الله: ئیمامی عبدالرزاق لە تەفسیرەکەیدا ڕیوایەتی کردووە لە معمرەوە لە ابن ابي نجیحەوە لە ئیمامی موجاهیدەوە کە فەرموویەتی (**هم أهل الفقه والعلم**)[519]. واتە : وەلی ئەمر ئەهلی فیقهو و عیلمە . (وە سەنەدەکەی بەهێزە).

**ئیمامی الحسن البصري** رحمه الله: هەر عبدالرزاق ڕیوایەتی کردووە لە شەیخەکەیەوە معمر لە حەسەنی بەصرییەوە کە فەرموویەتی (**هم العلماء**)[520]. واتە وەلی ئەمر ئەهلی عیلمن ، (بەڵام سەنەدەکەی لاوازە بەهۆی إنقطاع لەنێوان معمر و الحسن).

بەڵام هەمان واتا لە ئیمامی الحسنەوە هاتووە بە ڕێگای تر ، ئیمامی عبدالرحمن بن أبي حاتم لە تەفسیرەکەیدا[521] ڕیوایەتی کردووە لە ڕێگەی محمدی کوڕی الحجاج الخضرمي ـوە لە الخطیب ناصەوە لە المبارك کوڕی فضالەوە لە ئیمامی الحسن البصرییەوە ..الأثر (بەڵام پلەی صححەتەکەی نازانم).

**ئیمام عطاء بن سائب** رحمه الله: ڕیوایەتێکی زۆر لە ئیمامەوە لەم بارەوە هاتووە ، بۆنمونە ئیمامی الدارمی ڕیوایەتی کردووە[522] لە یعلی لە عبدالملکەوە لە عطائەوە کە فەرموویەتی : **وەلی ئەمر ئەهلی عیلم و فیقهە** (وەسەنەدەکەی بەهێزە). وە

[517] المدخل إلى السنن الكبرى للبيهقي – باب تقليد العامي للعالم.
[518] الفقيهوالمتفقه للخطيب : ١٢٦/١
[519] تفسير الإمام عبدالرزاق – سورة النساء / ٥٩
[520] تفسير الإمام عبدالرزاق – سورة النساء / ٥٩
[521] تفسير ابن ابي حاتم / ر. ٥٥٣٦
[522] سنن الدارمي / ر.٢٢٥

ئیمامی الطحاوي[523] و الطبري[524] والخطیبی البغدادي وغەیری ئەمانیش بە ڕێگەی جیاواز نقڵیان کردووە .

**ئیمام قتادة بن دعامة** رَحِمَهُ اللهُ: ئیمامی إبن أبی حاتم[525] وە الطبري[526] ڕیوایەتیانکردووە ، ابن ابی حاتم لـە باوکیەوە وە الطبریش لـە بشری کوڕی معاذەوە هەردووکیان لـە یزیدی کوڕی زورەیعەوە لـە سعیدی کوڕی أبی عروبەوە لـە قتادەوە فەرموویەتی (**زاناکانیانە**). وە إسنادەکەی بەهێزە.

– وە ئەمە ڕەئی ئیمامی مالیکی کوڕی ئەنەسیشە[527] (واللہ أعلم).

## دووەم : کار بەدەستانی وڵات

بەشێکی تر لـە سەلەف وەلی ئەمر بە کاربەدەستانی وڵات ناودەبەن .

**ئیمامی أبو هریرة** رضي الله عنه: أبوبکر ابن ابی شیبة[528]وە الخلال[529]ڕیوایەتی کردووە لـە وکیعەوە لـە الأعمش ـەوە لـە أبی صالحەوە لـە ئیمامی أبوهریرەوە کە دەربارەی ئایەتەکە فەرموویەتی (**هم الأمراء**) واتە دەسەڵاتدارانن . (وە صحیحە).

بەڵام بەهەمان شێوە هاتووە لـە أبوهریرەوە کە فەرموویەتی فەرماندەی جەیشن، ئیمامی ابن أبی شیبة[530] وە الطحاوي[531] وە غەیری ئەوانیش ڕیوایەتیان کردووە لـە

---

[523]شرح مشکل الآثار / ر.١٥٢٤

[524] جامع البیان بتحقیق احمد شاکر : ٨/٥٠٠

[525]تفسیر ابن ابي حاتم / ٥٦٨٩

[526] تفسیر الطبري : ٨/٥٧٢

[527] الجامع لأحکام القرآن لإمام القرطبي : ٥/٢٥٩

[528] مصنف : ١٢/٢١٢

[529]السنة لإمام أبوبکر الخلال / ر.٤٨

[530]مصنف : ١٢/٢١٤

[531]شرح مشکل الآثار : ٤/١٨٦

حفصی کوڕی غیاث ـەوە لە الأعمش ەوە لە أبی صالحەوە لە أبی هریرەوە بەڵام ئەم ڕیوایەتە شاذە ، حفص لێرە مخالفی وکیع دەکات کە لەخۆی أثبترە .

وە ڕیوایەتەکەی أبو معاویەیش لە الأعمش ـەوە پاڵ پشتی قسەکەمانە، هەروەکو ئیمامی عبدالرحمن ابن ابی حاتم[٥٣٢] وە الطبري[٥٣٣] وە الطحاوي[٥٣٤] ڕیوایەتیان کردووە لە أبو معاویەوە لە الأعمش لە أبی صالح لە أبی هریرەوە بەهەمان لفظی ڕیوایەتەکەی وکیع لە الأعمش .. ، بۆیە ئەوەی هاتووە بە صحیحی لە أبوهریرەوە خوا لێی ڕازی بێت وەلی ئەمری بە کاربەدەستان ناوبردووە.

## سێهەم: ئەمیری جەیش

بەشێك لە سەلەف لەوانە مقاتل بن سلیمان و الکلبی و غەیری ئەوانیش دەفەرموون وەلی ئەمر ئەمیر و فەرماندەکانی سیریەکانن[٥٣٥] ، وە وەك لە پێشتریشدا پێشتریشدا باسمانکرد ڕیواتکراوە لە هاوەڵی خۆشەویست أبوهریرە کە فەرموویەتی ئەمیری سیریە و جەیشن ، بەڵام الله أعلم ڕیوایەتەکە شاذە.

## چوارەم: هاوەڵان

بەشێکی تر لە سەلەف وەلی ئەمر تایبەت دەکەن بە هاوەڵان .

ئەمیش هاتووە لە ئیمامی عکرمة کە فەرموویەتی وەلی أمر أبوبکر و عمرە[٥٣٦] ﵄ وە هاتووە لە ئیمام الظحاکەوە کە فەرموویەتی وەلی ئەمر هاوەڵانن[٥٣٧].

---

[٥٣٢] تفسير ابن ابي حاتم : ٩٨٨/٣

[٥٣٣] جامع البيان لإمام الطبري : ٤٩٧/٨ – ر.٩٨٥٦

[٥٣٤] شرح مشكل : ١٨٦/٤

[٥٣٥] تفسيرالقرآن العظيم المنسوب للإمام الطبراني : ٣/٢

[٥٣٦] تفسير ابن أبي حاتم : ٩٨٩/٣

[٥٣٧] تفسير ابن أبي حاتم : ٩٨٩/٣

## پوختەی قسەکانی سەرەوە

زانایان خیلافیان هەیە کام لەم بۆچونانە تەواوترینیانە ، بەڵام ڕەئی أرجح و بەهێز ئەوەیە کە دەفەرموون وەلی أمر هەم زانایانن هەمیش کاربەدەستانن ، ئەمیش دوو ئەسەر لەم بارەوە لە ئیمامی أحمدەوە هاتووە[538]، یەکیان دەفەرمووێ کاربەدەستان و جارێکیش زانایان بە وەلی ئەمر بە ناودەبات، کەواتە پێی وایە هەردوو صنفەکە وەلی ئەمرن ، وە شەیخی مفسیرین أبو جعفر الطبري[539] و شەیخی ئیسلام ابن تیمیة[540] و ابن القیم[541] و ابن کثیر[542] و الجصاص[543] و الشوکاني و غەیری ئەوانیش پێیان وایە وەلی ئەمر گشتگیرە ، هەم کاربەدەستی وڵاتە هەمیش زانایانن ، وە تەنانەت باوك وەلی ئەمری ماڵە ، پیاو وەلی ئەمری خێزانێتی ...هتد، ئەم ڕەئیە بەهێزترینە والله أعلم.

زانیمان وەلی ئەمری شەرعی ئەو کەسە موسڵمانە موەحیدانەن کە خاوەنی عیلم یان دەسەڵاتن ، وە پێویستە گوێڕایەڵیان بکرێت .

## مەرجەکانی وەلی ئەمری شەرعی

وەلی ئەمر چەند مەرجێکی هەیە تاکو لە خۆیدا بیهێنێتە جێ تاکو پێی بگوترێ وەلی ئەمری شەرعی و گوێڕایەڵی کردنی واجب بێت، چونکە هەموو دەسەڵاتدارێك ناوی وەلی ئەمر وەردەگرێت، بەڵام شەرت نیە وەلی ئەمری شەرعی بێت، ئەو وەلی ئەمرە شەرعیەی کە الله فەرمانی گوێڕایەڵی داوە.

---

[538] إعلام الموقعين عن رب العالمين : ٢/١٦٩

[539] جامع البيان لإمام الطبري : ٥/٢٦٠

[540] الأمر بالمعروف والنهي عن المنكر للشيخ الإسلام ابن تيمية / ٥٣

[541] إعلامالموقعينعنربالعالمين : ٢/١٦٩

[542] تفسير ابن كثير : ٢/٣٤٥

[543] أحكامالقرآن لإمام أبوبكر الجصاص : ٣/١٧٧

ئەمە ئەو فێڵەیە کە جەهمیەکانی سەردەم لەو خەڵکەی دەکەن، دەڵێن وەلی ئەمر واتە سەرپەرشتیار و خاوەن دەسەڵات، کەواتە گوێڕایەڵیشان واجبە، بەبێ ئەوەی بۆ خەڵکی ڕوون بکەنەوە کام وەلی ئەمر گوێڕایەڵی واجبە و کام وەلی ئەمر خروج و شەڕ دژی واجبە، چونکە تاغوتەکانیش **لە ڕووی زمانەوانیەوە** پێیان دەگوترێ وەلی ئەمر چونکە فەرمانی ئەو خەڵکەیان لەژێر دەستدایە ، بەڵام حوکمی وەلی ئەمریان نیە.

## کام دەسەڵاتدار گوێڕایەڵی کردنی واجبە؟

١ – موسڵمانێکی موەحید، الله ﷻ دەفەرمووێ ﴿**يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا أَطِيعُوا اللَّهَ وَأَطِيعُوا الرَّسُولَ وَأُولِي الْأَمْرِ مِنْكُمْ فَإِنْ تَنَازَعْتُمْ فِي شَيْءٍ فَرُدُّوهُ إِلَى اللَّهِ وَالرَّسُولِ إِنْ كُنْتُمْ تُؤْمِنُونَ بِاللَّهِ وَالْيَوْمِ الْآخِرِ ذَلِكَ خَيْرٌ وَأَحْسَنُ تَأْوِيلًا**﴾[٥٤٤] . واتە: ئەی بڕواداران گوێڕایەڵی فەرمانەکانی الله و ڕەسولەکەی ﷺ وزانا وکاربەدەستە موسڵمانەکان بن کە لە خۆتانن و موسڵمانن، خۆ ئەگەر جیاوازی کەوتە نێوانتانەوە لە بابەتێکدا ئەوا حوکم بۆلای الله ﷻ و ڕەسولەکەی ﷺ بگەڕێننەوە ئەگەر ئێوە ڕاست دەکەن و بڕواتان بە خواو ڕۆژی دوای هەیە ، ئائەمە باشە بۆتان بۆ چارەسەری کێشەکانتان .

وشەی ﴿**منكم**﴾ لە ئایەتەکەدا واتە لە خۆتان بن ، سەرەتایش خِطابەکە لە گەڵ ئیمانداران بوو هەروەکو فەرمووی ﴿**يا أيها الذين آمنوا**﴾ کەواتە ﴿**منكم**﴾ ئیماندارانن، پێویستە وەلی ئەمر ئیماندار بێت نەك تاغوتێکی ماسۆنی عیلمانی دیموکراسی بێــت.

وە خوای تعالی لە دوو شوێن لە قورئانەکەیدا دەربارەی زانایان دەفەرمووێ: ﴿**فَاسْأَلُوا أَهْلَ الذِّكْرِ إِنْ كُنْتُمْ لَا تَعْلَمُونَ**﴾[٥٤٥]. واتە : پرسیار لە ئەهلی عیلم و

---

[٥٤٤] سورة النساء / ٥٩

[٥٤٥] (سورة النحل / ٤٣ – و سورة الأنبياء / ٧)

قورئان بکەن ئەگەر ئێوە نەتانزانی. ئەهلی زیکر ئەهلی قورئانە، نەك یاسا کوفریەکان، نەك ئەوانەی ئەو قورئانەیان پەراوێز خستووە .

**٢-** نابێت کەسێك بێت شیرك یان کوفری بەواحی لێبینرابوو،هەروەکو خۆشەویستمان ﷺ فەرمانمان پێدەکات کە ململانێ لەگەڵ کاربەدەستانمان نەکەین تاکو کوفرێکی ئاشکرایان لێدەبینرێت، هەروەکو ئیمامی البخاري[٥٤٦] و مسلم[٥٤٧] و غەیری ئەوانیش[٥٤٨] ڕیوایەتیانکردووە لە عبادەی کوڕی صامتەوە «**أَنْ بَايَعَنَا عَلَى السَّمْعِ وَالطَّاعَةِ، فِي مَنْشَطِنَا وَمَكْرَهِنَا، وَعُسْرِنَا وَيُسْرِنَا وَأَثَرَةً عَلَيْنَا، وَأَنْ لاَ نُنَازِعَ الأَمْرَ أَهْلَهُ، إِلَّا أَنْ تَرَوْا كُفْرًا بَوَاحًا، عِنْدَكُمْ مِنَ اللَّهِ فِيهِ بُرْهَانٌ**» واتە بەیعەتماندا لەسەر ئەوەی کە ململانێی کاربەدەستان نەکەین نە لە خۆشی ونەلە ناخۆشی ، تاکو کوفرێکی ئاشکرایان لێبینرا.

**گوتم**: هەرکاتێك وەلی ئەمر کوفرێکی بەواحی لێبینرا ئەوا گوێڕایەڵی کردنی واجب نیە، بەڵکو تکفیر دەکرێت وە بەتاغوت ناودەبرێت، وە لەکاتی بوونی هێزیش واجبە بە إجماعی زانایان خروجی لێبکرێت[٥٤٩] .

جا کوفر جۆری ئێجگار زۆرە و ناتوانین لێرە باسی لێوە بکەین ، بەڵام ئەوەی مەبەستی ئێمەیە لێرە بریتیە لە لادانی یاسای قورئان و هێنانی یاسای تاغوتی ئەمریکی و ئەوروپی ، وە دیموکراسی و عیلمانی ، ئەمە لە گەورەترینی کوفرەکانە، والله تعالى لە قورئاندا ئەم حاکمانە بە کافر و تاغوت ناوبردووە ، وە ئەو کەسانەیش کە بە حوکمەکەیان ڕازین بە موشریك و مونافیق ناوی بردوون وەك لە پێشتر بە دووورودرێژی باسمان لێوە کرد ، وە دەیەها إجماع وە وتەی هەموو

---

[٥٤٦] صحيح البخاري / ر. ٧٠٥٥

[٥٤٧] صحيح مسلم / ر. ٤٨٧٧

[٥٤٨] ابن ابي شيبة في مصنفه : ١٥/٥٧ و البغوي في شرح السنة /ر. ٢٤٥٧ و أبي عوانة في مستخرجه / ر. ٧١٢٤

[٥٤٩] تفسير ابن كثير : ٣/١٣١

ئەهلی سونە لەسەر ئەوەن کە ئەم تشریعە کوفری گەورەیە و خاوەنەکەی لە بازنگەی ئیسلامەتی دەباتە دەرەوە ، بۆیـە ئەمەیش مەرجە بۆ وەلی ئەمر تاکو خۆی لێبپارێزێت ، ئەگەرنا حسێبی وەلی ئەمری بۆ ناکرێت .

ئیمام علي بن أبي طالب رضي الله عنه دەفەرمووێ : (**حَقٌّ عَلَى الإِمَامِ أَنْ يَحْكُمَ بِمَا أَنْزَلَ اللَّهُ وَأَنْ يُؤَدِّيَ الأَمَانَةَ، فَإِذَا فَعَلَ ذَلِكَ كَانَ حَقًّا عَلَى الْمُسْلِمِينَ أَنْ يَسْمَعُوا وَيُطِيعُوا وَيُجِيبُوا إِذَا دُعُوا**).واتە : پێویست و حەقە لەسەر پێشەوایانی موسڵمانان کە حوکم بە قورئان بکـــەن و ئەو ئەرك و ئەمانەتەی لەسەریانە وەکو خۆی بـیدەن ، خۆ ئەگەر ئەمەیان کرد ئەوا پێویستە لەسەر موسڵمانان کە گوێیان بۆ بگرن و گوێڕایەڵیان بکەن و بەدەمیانەوە بچن و وەڵامیان بدەنەوە.

خۆ ئەگەر ئەمەیان نەکرد ئەوا گوێڕایەڵیان ناکرێت، چونکە وەلی ئەمری شەرعی نین، خۆ ئەگەر وەلی ئەمری موسڵمانان بوونایە ئەوا واجب بوو گوێڕایەڵیان بکرێت .

## گوێڕایەڵی وەلی ئەمری موسڵمانان واجبە

ئەوەی دەبینین لە قورئان و سونەت وە وتەی سەلەف ئەوەیە کە گوێڕایەڵی وەلی ئەمری موسڵمانان واجبە، وەکەس بۆی نیە لە فەرمانیان دەربچێت،چ باش بن چ خراپکار، ئەمە زاهیری بەڵگەکانە لە قورئان و سونەت کە ژمارەیان زۆرە و دایان نانێم.

## گوێڕایەڵی حاکمی زاڵم ؟

ئەوەی کە جێگای خیلافە بە تایبەت لە نێوان سەلەف ئەم بابەتەیە گوێڕایەڵی حاکمێکی موسڵمان بەڵام ستەمکار، زاهیری بەڵگەکان لە قورئان و سونەت بەڵگەن لەسەر ئەوەی کە گوێڕایەڵی وەلی ئەمری ستەمکاریش واجبە ، وە دروست نیە لێی دەربچیت، ئەمە ڕەئی زۆرێك لە سەلەف، وە إجماع لەم بارەوە نقلکراوە هەرچەندە وەکو زۆر بابەتی تریش هەڵە لە نقلی إجماعەکە هەیە.

چونکه زۆرێکیش لە سەلەف خروجیان لە حاکمی موسڵمان کردووە گەر زاڵم بوبێ، ئەمە لە زۆرێك لە سەلەف بەتایبەت لە هاوەڵان وتابعین ـوە هاتووە .

## خیلاف لەنێوان سەلەف سەبارەت بە گوێڕایەڵی بۆ وەلی ئەمری ستەمکار

لە هاوەڵان لە نەوەی پێغەمبەری خوا ﷺ لە حوسەینی کوڕی عەلیەوە خوا لێیان ڕازی بێت هاتووە کە خروجی لە یزیدی کوڕی معاویة کرد کە حاکم بوو، وە پاشان عبداللە بن زبیر الله لە لێیان ڕازی بێت کە خروجی لە یزید کرد، وە ئەمانیش بە پاڵپشتی هەزارەها کەس لە هاوەڵان و تابعین کە پێکەوە خروجیانکرد.

### دەرچوونی ئیمام حسین و عبداللە لە خەلیفە :

لە دوای ئەوەی ئەمیری ئیماندارانی علی کوڕی أبی تاڵیب شەهیدکرا ئیمامی حەسەن ـی کوڕی عەلی (رضي الله عنهما) بەیعەتی پێدرا ، لە دوای شەش مانگ چوو بۆ شام و خەلافەتی ڕادەستی ئیمامی معاویەی کوڕی أبو سفیان کرد، دەسەڵاتی بنی ئومەیە لە شام چەسپا ، پاش ئەوەی کە معاویە تەمەنی کشا و یزیدی کوڕی کرد بە جێنشینی خۆی، سوور بوو لەسەر ئەوەی کە یزید ببێت بە خەلیفە، زانایان دەفەرموون ئەم کارە هەڵە بوو کە معاویة تووشی بوو لە دوو ڕووەوە :

١–کەسانی زۆر باشتر و بەڕێزتر هەبوو لە یزید ، وەکو الحسین و ابن زبیر و ابن عمر و ابن عباس و غەیری ئەوانیش رضي الله عنهم.

٢–سیستەمی خەلافەتی لە شوری ـوە گۆڕی بۆ میراتگری، وە ڕەچاوی ڕەئی هیچ کەسی نەکرد نە أهلی حل و عقد و شوری، وە ئیمامی ابن عمر رضي الله عنه وە غەیری ئەویشلەم بارەوە ئاگاداریان کردەوە بەڵام گوێی پێنەدا[٥٥٠].

[٥٥٠] تاريخ خليفة بن خياط / ٢١٣

## زۆرێك لە هاوەڵان و تابعین سەرەتا ئەم بەیعەتەیان ڕەتكردەوە :

وەكو حسینی كوڕی علی و عبداللە ـی كوڕی الزبیر و عبداللە ـی كوڕی عمر و عبداللە ـی كوڕی عباس وعبدالرحمن ـی كوڕی أبی بكر..هتد.

معاوية نامەی نارد بۆ عبدالرحمن، بەڵام توڕەبوو وە ڕەتی كردەوە كە بەیعەت بدات[551]، وەتاكو مرد بۆ یزید ملكەچ نەبوو[552].وە لە دوای مردنی معاوية و كۆبوونەوەی خەڵك لە دەوری یزید ، ابن عمر و ابن عباسیش بەیعەتیان بە یزید دا.

بەڵام ابن علی و ابن الزبیر و كۆمەڵێكی تر دیسان ڕەتیان كردوە.حسین چوو بۆ مەدینە و خەڵك لە دەوری كۆبۆیەوە ، وە نامەی خەڵكی عێراقی زۆر بۆ دەهات و بەڵێنی بەیعەتیان پێدەدا.

## ئیمامی حسین بە دوو هۆكار بەیعەتی نەدا بە یزید

١- پێی وابوو یزید شایستە نیە، بە عادڵی نەدەزانی[553]، كەواتە هۆكاری سەرەكی دەرچوونیان كەسایەتی ودینی یزید بوو.

٢- بە چۆنیەتی بەیعەت پێدانەكەیش ڕازی نەبوو كە كرابوو بە میراتگری.

وە ئەوانەی دەڵێن گوایە حسین ﷺ بەیعەتی لە گەردن نەبوو بۆیە خروجی كرد، خۆ ئەگەر بەیعەتی لەگەردن بوایە خروجی ناكرد .

**وەڵام دەدرێنەوە** : نەخێر ، باشە خۆ خەڵكی عێراق بەیعەتی یزیدیان لەسەر بوو، بەڵام كاتێك زانیان ئیمام حسین و ابن الزبیر (رضي الله عنهما) بەیعەتیان بە یزید نەداوە هەموویان بەیعەتیان فڕێ دا وە نامەیان بۆ حسین ﷺ نارد و ئاگاداریانكردەوە كە ئەوان چیتر بەیعەتی یزیدیان لەسەر نیە ، بەڵام ئیمامی حسین

[551] البداية والنهاية : ٩٦/٨

[552] البداية والنهاية : ١٦٢/٨

[553] الفقهاء والخلفاء / ٢١٠

نەهی لێنەکردن ، بەڵکو ئەو خروجەی بە باش زانی[554] ، تەنانەت مسلمی کوڕی عقیلی نارد بۆ کوفە و خەڵك بەیعەتیان بۆ حسین پێدا و دواتریش خۆی بەرێکەوت بۆ کوفە.

وە دەوترێ هاوەڵان نکۆڵیان لە کارەکەی ئیمامی الحسین ﷺ کرد، لەوانە إبن عمر وإبن عباس وغەیری ئەوانیش ﷺ.

بەشێك هاوەڵان لەوانە ابن عمر و ابن عباس وەکو حسین خروجیان نەکرد، بەڵام ئینکاریشیان لەکارەکەی نەکرد و بە خروج خراپ ناونەبرد[555] ، بەڵکو لە ترسناکی خەڵکی عێراق ئاگاداریان کردەوە کە خەڵکی عێراق سیقەیان نیە نەك ترسناکەی خروجی لە یزید، چونکە دەیانزانی ئەمە إجتهادێکی خۆیەتی، ئەمەش گەر صحیح بێ، بۆنمونە بەسەرهاتی ئاگادارکردنەوەکەی ئیمامی إبن عمر هاتووە لەلای إبن حبان والبیهقي والطبراني، کە یحیی بن إسماعیل بن سالم تفرّد ـی پێکردووە کە تێبینیش لەسەر ڕیوایەکانی هەبووە لەلای زانایانی جەرح وتەعدیل.

زۆرکەس لێرە بابەتەکە تێکەڵ دەکات، یان بەهۆی جەهلە بە ڕیوایات وئاثار لەم بابەتە، یانیش بابەتەکە دەوشارێتەوە وحەق دەرناخات، ئیمامی إبن عمر وإبن عباس هەرگیز نەیانوت حسین تۆ خروج دەکەیت تۆ هەڵەیت تۆ بیدعەت داهێنا تۆ خاریجیت تۆ..هتد.

نا هەرگیز، بەڵکو تەنها ئاگاداریان دەکردەوە کە خەڵکی کوفە جێ متمانە نین وپشتت ناگرن.

یزید نامەی نارد بۆ عبیداللە کە ئەوکات والی عێراق بوو وە فەرمانی پێکرد بە کوشتاری حسین[556] !. ، ئەوە بوو ئیمامی حسین شەهیدکرا وە زۆرێك لەوانەی لەگەڵیشیدا بوون بە هەمان شێوە. [557]

---

[554] مقدمة ابن خلدون / ١١٢

[555] مقدمة ابن خلدون / ١١٣

[556] تاريخ الخلفاء لإمام السيوطى / ١٥٧

ئایا كەس هەیە بڵێت ئیمام حسین خەواریج بوو ؟ لە كاتێكدا ڕەیحانە و نەوەی خۆشەویستی پێغەمبــەرمان ﷺ بوو ، وەهەر لە دونیا مژدەی بەهەشتی پێدرابوو ؟ حاشا هەرگیز خەواریج نەبوو ، بەڵام ئەوە بۆچوونی بەشێك لە سەلەف بوو كە بە دروستی دەزانی خروج لە كاربەدەستی زاڵم بكرێت.

## ئیمام عبدالله كوڕی زوبیر وخروجی لەیزید و خەلافەتەكەی

لە دوای ئەوەی ئیمام چوو بۆ مەككە و دواتر هەواڵی شەهید بوونی ئیمامی حسینی ﷺ پێگەیشت، عبدالله ﷺ سووورتربوو لە دژایەتی كردنی حوكمی یزید، وە هێزێكی جیهادی دروست كرد بانگەوازی جیهادی كرد[٥٥٨] ، وە خەڵكێكی زۆری لە دەور كۆبۆیەوە لە هاوەڵان وتابعی شارەكانی مەككە و مەدینە و بەشێكی تائیف و شوێنەكانی تریش، وە نەبێت ئەم كارە بێ ئامانج بوبێت، نەخێر: بەڵكو چەند ئامانجێكی گەورەی هەبوو.

[٥٥٧]هەرچەندە لەم بابەتە خیلاف دروستكاراوە هەیە، بەڵام خیلافەكە بێ بەڵگەیە كە دروست كراوە ، دەڵێن كاكە خۆ یزید نەیوت بڕۆ حسین بكوژە ، ئەم قسەیە ئەصڵ و ئەساسی نیە ، لەگەڵ ئەوەی كە بەڵێ ڕیوایەت هاتووە فەرمانی بە كوشتاری حسین كردووە ، لەگەڵ ئەوەیشدا عبیدالله كە تەنها ئەمیرێكە چۆن دەتوانێ كارێكی ئاوا ترسناك بكات بەبێ ڕەزا مەندی یزید ، چونكە ڕووداوی شەهیدكردنی حسین كارێكی مەترسیدار بوو ، كەسێك كە مژدەی بەهەشتی پێدراوە وە لە نێو خەڵكیش خۆشەویست بوو ، بۆیە كارێكی ئاوا هەرگیز ناكرێت عبیدالله بە سەربەخۆی كاری وای كردبێت ؟! ، باشە دواتر كە سەری حسین لەلاشەی جیاكرایەوە و عبیدالله ناردی بۆ شام بۆلای یزید ئەی یزید بۆ هیچ كاردانەوەیكی نەبوو ، بۆ لانی كەم عبیدالله ـی لە پۆستەكەی دوورنەخستتەوە ؟ هەموو ئەم بەرگریانە هیچن ، دواتر كارەساتی حرەی بەسەر مەدینەی رسول الله ﷺ هێنا كە نوسینیشی قورسە وموسڵمان لەو كارە بێزدەكاتەوە ، پاشان پەلاماری شاری مەككەی دا وە هێزەكەی یزید بە مەنجەلیق ناو شاری مەككەیان بۆردومان دەكرد، تاكو وای لێهات مەنجەلیق بە دیواری كەعبەی پیرۆز كەوت و ئەوە رویدا كەرویدا، وە ئەوەی كە مسلمی كوڕی عقبە مەدینەی سێ ڕۆژ حەڵاڵ كرد بە فەرمانی یزید بوو هەروەكو مێژوونوسان لەوانە ابن كثیر و الذهبي و السیوطي باسی دەكە، بەكورتی خودی یزید بەرپرسیاری یەكەمە لەم كوشتن و خوێن ڕشتنەی ڕووداوی تەف و غەیری تەفیش.

[٥٥٨]عبدالله بن زبیر و الأمویون / ٦٧

١– لادانی یزید لـه خەلافەت بە هۆی ئەوەی شایستەی خەلافەت نیە.

٢– گەڕانەوەی سیستەمی خەلافەت بۆ سەر سونەت ، کە شوری بوو.

وە پەنای بۆ مەککە بردبوو لـەدوای ئەوەی وەك باسمانکرد لـەگەڵ حسین هەڕەشەیان لـەسەر بوو ، بەڵام یزید بەبیٚ ئەوەی ڕەچاوی شاری مەککە بکات کە شەڕ تێیدا حەڕامە و پارێزراوە هێزیشکی نارد، سەرەتا بۆ ناچارکردنی عبدالله بۆ بەیعەتی یزید چ بە خۆشی بێت یان ناخۆشی ، عبدالله لـەمەدا بەجوانی سەرکەوت بەسەر هێزەکەی یزیدا و تێکی شکاندن .

دواتر هێزێکی تری نارد، حەسینی کوڕی نمیر ئەمیری بوو کاتێك گەیشتن بە مەککە ، شەڕ دەستی پێکرد و هێزەکەی یزیدیش مەنجەلـیقیان بەکار هێنا تاکو وای لـێهات بەرد بەر دیواری ککەعبە کەوت و سوتا ، وە لـەو کاتانەیا هەواڵی مردنی یزید گەیشت بە هێزەکەی شام لـە مەککە، ئەو یزیدەی کە ئەم هەموو کارە قێزەونە و پیسەی کرد تاکو لـەسەر کورسی خەلافەت بێت، بەڵام هیهات ئایا نامریت ؟ یزید مرد ، هێزەکەی شام بەسەرکردایەتی حەسین ملکەچی عبدالله بوون و پێیان وابوو ئێستا عبدالله شایەنی خەلافەتە، وە بە عبدالله ــی وت کە بێت بۆ شام تاکو بەیعەتی پێبدەن، بەڵام عبدالله ئەمەی قبوڵ نەکرد چونکە چوون بۆشام مەترسیدار بوو ، وە حەسینیش هیچ کارە بوو خۆ کارێکی ئاوا بە دەستی حەسین نیە تاکو ئەو بڕیار بدات .

## ئەو هاوەڵانەی خروجیان لە کاربەدەستی ستەمکار کردووە

**ئیمامی عبدالله بن الزبیر** ﵁: عبدالله کە لـە هاوەڵانی پێغەمبــەری خوایە ﷺ وە لـەخواترس و خاوەن عیبادەت بوو، لـە باوکیەوە نەوەی زوبەیری کوڕی عەوام بوو ﵁، لـە دایکیەوە کوڕی ئەسمائی کچی ئیمامی أبوبکر بوو ﵁ ، واتە خوشکەزا و خۆشەویستی دایکمان عائشە بوو، بە لـەدایك بوونی هەموو موسڵمانان دڵخۆش

بوون ، هەربە منداڵی وەکو پیاو بەیعەتی بە پێغەمبـەری خوا داوە ﷺ ، ئیمامی عبدالله لـە یزید دەرچوو وەك باسمانكرد تاكو شەهید بوو.

**ئیمام حسین بن علي** ﷺ: ڕەیحانە و ئیجگار خۆشەویستەکەی پێغەمبـەری خوا ﷺ، کوڕی فاتیمە خانی کچی پێغەمبەری خوا، لـە باوکیەوە کوڕی ئەمیری ئیمانداران علی کوڕی أبی تاڵیب ﷺ، هەر لـە دونیا مژدەی بەهەشتی پێدراوە[559]، لـە یزید دەرچوو تاكو شەهید بوو.

**ئیمام عبدالله بن حنظلة الأنصاري** ﷺ: ئیمام یەکێکە لـە هاوەڵانی پێغەمبەری خو، باوکیشی أبو عامری راهیب بەهەمان شێوە، باوکی لـە جەنگی أحد شەهید بوو وە فریشتەکان شۆردیان[560]، جا ئیمام یەکێك بوو لـە سەرکردەکان لـە شاری مەدینە لـە ڕووداوی حرە کە دژی یزید وەســتایەوە و شــەڕی کرد تاكو شەهید بوو[561].

**ئیمامی عبدالله بن زید** ﷺ: یەکێکە لـە هاوەڵانی پێغەمبـەری خوا ﷺ ، وە گێڕەرەوەی دەست نوێژی خۆشەویستمانە[562] ﷺ ، باوکیشی بەهەمان شێوە صحابی بووە ، ئیمامی عبدالله یەکێکی ترە لـەو هاوەڵانەی دژی یزید وەستایەوە و لـە ڕووداوی حرە دژی یزید جەنگا تاكو شەهید بوو[563].

**ئیمامی معقل بن سنان الأشجعي** ﷺ: ئیمامی معقل یەکێکی ترە لـە هاوەڵانی پێغەمبـەری خوا ﷺ ، لـە ڕۆژی فەتحی مەککە هەڵگری ئاڵای قەومەکەی خۆی

---

[559] ئیمامی أحمد / ١٠٩٩٩ وة ئیمامی ابن أبي شیبة لة مصنف / ٣٢٨٤٠ وة ئیمامی ابن ماجة / ١١٨ و الترمذي / ٣٧٦٨ ڕیوایةتیانكردووة (وة صحيحة).

[560] المستدرك (صلى الله عليه وسلم) ٣ / ٢٠٤، ٢٠٥،والبيهقي ٤ / ١٥ (وە سەنەدەکەی بەهێزە).

[561] سير اعلام النبلاء : ٣٢٤/٣

[562] أخرجهالبخاري ١/ ٢٥١، ٢٥٢،ومسلم (٢٣٥) ومالكفيالموطأ ١/ ١٨

[563] سير اعلام النبلاء : ١٤٦/٥

بوو[564] ، وە لە سەردەمی یزید لە هاوەڵانی مەدینە بوو وە لە ڕووداوی حرە دژی یزید وەستایەوە وە ئەمیری مهاجرین بوو لەو شەڕە تاکو شەهید بوو[565].

**ئیمام مسور بن مخرمة** ﵁: ئیمام یەکێکی ترە لە هاوەڵانی پێغەمبەری خوا ﷺ، وە لەکاتی یزیدا لەگەڵ عبداللە بوو ﵁ وە دژی خەلافەتی یزید بوو ، تاکو شەڕەکەی ابن الزبیر ﵁ و حصین لەو شەڕەدا مەنجەلیقێك دای بە سەریدا لەکاتی نوێژدا و پاشان شەهید بوو[566].

**ئیمامی معاذ بن الحارث** ﵁: یەکێکی تر لەو هاوەڵە پایەدارانەی تر، بکوژی أبو جهل ودڵسۆزی رسول اللە ﷺ، ئیمامی معاذي کوڕِی الحارثة، ئیمام یەکێك بووە لەو کەسانەی کە پێش هەموو ئەنصار لە شاری مەککە لەکاتی حەج بووبە موسڵمان[567]، وە بەژداری هەردوو پەیمانی عەقەبەی یەکەم و دووەمی کردووە وە یەکێك بووە لەو شەش کەسەی یە کەم کەسانی ئەنصار بوون کە زوو پێغەمبەری خوایان ﷺ بینی[568]، وە تەنانەت بەژداری جەنگی بەدری کردووە[569]، وە یەکێك بوو لەو دووگەنجەی کە ئیمامی عبدالرحمن بن عوف دەفەرمووێ لە گەرمەی جەنگی بەدردا بینیم دوو گەنجی کەم تەمەنی ئەنصاری لە دەورمن ، یەکیان چپانی لە گوێمدا وتی مامە : أبو جهل دەناسیت ؟ وتم بەڵێ بۆچیتە ؟ وتی : بیستومە جوێنی بە پێغەمبــەری خوا ﷺ داوە ....، بۆیە لەگەڵ براکەی چوون پێکەوە پەلاماری أبوجهلیانداو کوشتیان، دواریش پێغەمبەری خوا ﷺ سەیری شمشێرەکەیانی کرد و فەرمووی هەردوکتان کوشتوتانە ، ئەوانیش زۆر دڵخۆش

---

[564] تاريخ الإسلام : ٢٥١/٥

[565] تاريخ الإسلام : ٢٥٢/٥ و البداية والنهاية : ٢٢٠/٨

[566] مختصرتاريخدمشقلابنعساكر : ٣٠٦/٢٤

[567] طبقات الكبير لإمام ابن سعد : ٤٥٥/٣

[568] طبقات الكبير : ٤٥٥/٣

[569] مشاهيرعلماءالأمصاروأعلامفقهاءالأقطار / ٤٥

بوون[570] ،جا ئەم ئیمامە بەڕێزەیەکێك بوو لەو دوو گەنجە ، لە سەردەمی یزید لە ڕووداوی حرە لەو چەکدارانەی شاری مەدینە بوو کە دژی یزید جەنگا تاکو شەهید بوو[571].

**ئیمامی واسع بن حبان** ﷺ: ئیمام یەکێکی ترە لەو هاوەڵانەی کە دژی یزید جەنگی کرد تاکو شەهید بوو ، هەرچەندە لەسەر ئەوەی ئایا صحابی بوە یان تابعی خلافێك هەیە، ئیمامی العجلی دەفەرمووێ تابعی بووە ،بەڵام ئیمامی البغوی وە المدائنی لە هاوەڵانیان لەقەڵەم داوە، تەنانەت ئیمامی العدوی دەفەرمووێ بەژداری بەیعەتی ڕیضوانی کردووە لەگەڵ پێغەمبەری خوا ﷺ ، وە ڕەئی بەهێزئەوەیە کە صحابی بووە[572].

**ئیمامی عبداللە بن مطیع العدوي** ﷺ: یەکێکی تر لە هاوەڵانی پێغەمبەری خوا ﷺ ئیمامی عبداللە بن مطیع ـە ، کە ئەمیش بەهەمان شێوە شانبەشانی ابن الزبیر لە یزید دەرچوو، وە لێی دوورنەکەوتەوە تاکو شەهید بوو، تەنانەت سەرەکەی لەگەڵ سەری ئیمامی ابن الزبیر و ابن صفوان لە مەدینە پێکەوە هەڵواسرابوون[573] (خوای تعالی لە هەموویان ڕازی بێت).

وە زۆرێکی تر لە هاوەڵان وتابعین لە ئال وبەیت کە لەگەڵ ئیمامی الحسین لە کەربەلاو دژی هێزەکەی یزید کوشتاریان کرد وشەهید بوون.

بابەتی من لەم کتابە ئەم بابەتە نیە ئەگینا نمونەی تر زۆرە، ئەم چەند لاپەرەیەیشم تەنها بۆ ئەوە لێرە نووسی تا بزانن کە کاتێك زانایەکی بەرێز دەڵێت لە فلان بابەت إجماع هەیە ئیتر قسەکەی وەکو نەص وەرنەگرین، ئەم هەمووە لەسەلەف

[570] البخاري / ٣٩٨٨ و مسلم / ر.١٧٥٢ و أحمد / ر.١٦٧٣ و الحاكم : ٤٢٥/٣

[571] الاستيعابفيمعرفةالأصحاب / ر.٢٤١٧ و سير اعلام النبلاء : ٥٨٥/٢

[572] إكمال تهذيب الكمال في أسماءالرجال : ١٩٨/١٢

[573] إكمال تهذيب الكمال في أسماءالرجال : ٢١٠/٨

پێمان دەڵێن نەخێر إجماع لەم بابەتە نیە وشەرت نیە هەرچیەکیش وتی إجماع لە فلآن بابەت هەیە ئیتر قسەکەی صواب بێت.

## تابعین و خروج لە کاربەدەستی ستەمکار

ئەگەر بمانەوێ باسی ژمارەی ئەو تابعینانە بکەین کە لەم دەرچونانەدا بەژداربوون ئەوا هەرگیز ناتوانین، چونکە ژمارەکە هێندە زۆرە زانایانی مێژوونوسیش لە ئاستی دەستەوسانن ، بۆ نمونە هەموو ئەو خەڵکەی لە ڕووداوی حرە و شەڕەکانی دواتر بەژدار بوون دەگاتە هەزارەها کەس کە پشتی ابن الزبیریان گرت دژی یزید، وە ژمارەیەکی زۆریان تەنانەت لە سەردەمی پێغەمبەری خوا ﷺ لەدایك بوبون و لە کباری تابعین بوون .

پاشان خروجی ئیمامی الشعبـي و سعید بن جبیر و ژمارەیەکی دیکە کە زۆرن لە هاوەڵان و تابعین غەیری ئەوانیش لە حجاجی کوڕی یوسفی سەقەفیش بابەتێکی ترە کە ئەگەر باسی بکەین کتابەکەمان لە بابەتی سەرەکی لادەدات ، چونکە ژمارەیەکی تری سەلەف لە حجاج خروجیان کرد ، الله تعالی ئاسانی بکات نامیلکەیەکمان لەم بارەوە نووسیوە بڵاوی دەکەینەوە .

### وتەی تەواو لەم بارەوە :

سەلەف جیاوازیان هەبووە لە گوێڕایەڵی و ملکەچ بوون بۆ کاربەدەسی ستەمکار، وە پێموابێت لە سەرەوە بە تفصیلەوە ئەو جیاوازییەمان سەلماند، بۆیە ئەوەی دەڵێت لەنێوان سەلەف لەم بارەوەخیلاف نەبووە ئەوا هەڵەی کرد، وە لە خەلەفیش هەبووە کە خروجی لە کاربەدەستی زاڵم بە دروست زانیوە.

## ئەوەی من مەبەستمە

ئەگەر سەلەف و بەتایبەت صحابە خیلافیان هەبێ لە خروج لە حاکمێك کە موسڵمانە، بەڵام زوڵمی هەیە، ئەی دەبێ بیروباوەڕیان بەرامبەر حاکمێك چی بێت کە :

١-پاساكەی الله ـی لاداوە و بەدڵی خۆی و ئەندامەكانی یاسادەنوسێتەوە .

٢-حەرامەكانی الله بەدڵی خۆی بەیاسا حەڵاڵ دەكات .

٣-حوكمی الله لای ئەو بۆ سەدەی پێشكەوتن نابێت، بەڵكو حوكمی هەتاهەتای دیموكراسی ـە.

٤-هاوكاری كافران دەكات وخۆیان وبەرنامەیان سەردەخات بەرامبەر موسڵمانان و بەرنامەیان.

٥-بە یاسا ڕێگە دەدات كێ كوفر دەكات ئازادە، مولحیدی زەردەشتیت داریت بەردیت ببە ، چیشت پێخۆشە بیڵێ ..

وە غەیری ئەم كوفرە بەواحانە ..؟

## شوبهەی حەوتەم : یوسف پێغەمبەر چووە حوکمەتی کافرەوە

پێش ئەوەی جوابی شوبهەکە بدەینەوە گفتوگۆیەك لەگەڵ خاوەنی ئەم شوبهەبچوکە دەکەین، ڕۆژێك لەگەڵ جەهمیەك باسی ئەم بابەتەم کرد، وتی حاکم بغیر ما أنزل الله خاوەنی کوفری بچوکە و خاوەنەکەی پێی کافر نابێت ، ئەگەر وانیە ئەی بۆچی یوسف عليه السلام کافر نەبوو ؟!!.

گوتم ئایە تۆ پێت وایە یوسف عليه السلام کوفری بچوکی ئەنجامداوە ؟(پەنابەالله) ، چونکە ئەم قسەیە ئەو واتایە دەبەخشێت .ئەگەر پێتوابێت حوکم کردن بە غەیری شەریعەتی الله سبحانه وتعالى کوفری گەورەیە ئەوا واتە یوسف عليه السلام کافر بۆتەوە، ئەگەریش پێتوایە کوفری بچوکە واتە یوسف کوفری بچوکی ئەنجامداوە، ئەگەریش پێت وایە حوکم کردن بە غەیری شەرعی الله عز وجل ئەصڵەن تاوانیش نیە، ئەوا پێت دەڵێین : هەرکامیان هەڵبژێریت لەویتر ترسناکترە.

١- ئەگەر بڵێی کوفری گەورەیە کەواتە یوسف عليه السلام کافربووەوە (پەنابەخوا)، هەرکەسێکیش ئەمە بیروباوەڕی بێت کافربۆتەوە لە ڕیزی مورتەددان حیسابی بۆ دەکرێت لە دونیا و قیامەت .

٢- خۆ ئەگەر بیشڵێیت کوفری بچوکە، کەواتە یوسف عليه السلام کوفری بچوکی ئەنجامداوە کە زۆر لە تاوانە گەورەکان (وەکو دزی و داوێن پیسی و کوشتنی بە ناحەق) گەورەترە (پەنابەخوا) ، پاك و بێگەردی بۆ الله تعالى وحاشا پێغەمبەر وخۆشەویستمان یوسف عليه السلام، چونکە پێغەمبەران مەعصوم بوون لە کوفر و تاوانی گەورە بە إجماع، وە بەدرۆخستنەوەی ئایەتی قورئانە کە الله تعالى خۆی هەواڵی پاراستنی یوسفیدا لە تاوان، بۆیە دووبارە خاوەنی ئەم قسەیە کافر دەبێتەوە، وە شتێکی وتووە کە بە درۆخەرەوەی قورئان و سونەت و ئیجماعە ، وە پێشی ئەم کەس ئەمەی نەوتووە .

٣- خۆ ئەگەریش بوترێت حوکم کردن نە کوفری گەورەیە و نە بچوك، بەڵکو ئاساییە کێ حوکم بە شەرعی الله تعالى دەکات یا بـیکات، کێیش نایکات یا نەیکات، نە کوفرە و نەتاوان، ئەوا خاوەنی ئەم قسەیە کافرتر و پیسترە لـە خاوەنی دوو قسەی پێشتر، زیاد لـە (٢٨٠) لاپەڕەیە باسی کافرێتی و موجریمییەتی حاکم بغیر ما أنزل الله دەکەین و ئەو هەموو ئایەت و فەرموودەیەی لـەسەر هاتووە، کەچی کەسێك بەناوەی دینەوە بلێت وازهێنان لـە حوکمی الله ﷻ ئاساییە، ئەوا ئەمیش کافر بۆتەوە بە دەقی قورئان و سونەت و ئیجماعی هەموو سەلـەف و خەلـەف .

هەریەك لـە ئیمامەکان البربهاري[٥٧٤] وەقاضي عیاض[٥٧٥] وە ابن عبدالبر[٥٧٦] وە ابن حزم[٥٧٧] وە أبو یعلى[٥٧٨] و ابن القدامة[٥٧٩] وە شێخی ئیسلام ابن تیمیة[٥٨٠] وە ابن الوزیر[٥٨١]وە الطبري[٥٨٢] و القرطبـي[٥٨٣] و ابن کثیریش[٥٨٤]و غەیری ئەوانیش إجماع نقلْ دەکەن کە هەرکەسێك یەك حەڕامێك حەڵاڵ بکات کافر دەبـیت بە یەکدەنگی هەموو ئوممەت ، ئەی دەپرسم : ئەگەر ئەمە حوکمی کەسێك بـیت کە حەڕامێك حەڵاڵ بکات بەو شێوازە ترسناك بـیت ، ئەی حوکمی کەسێك چیە کە

---

[٥٧٤] شرح السنة للبربهاري / لا ٣١.

[٥٧٥] الشفا : ٢/ ١٠٧٣.

[٥٧٦] التمهید : ١/ ١٤٢، ١٤٣.

[٥٧٧] مراتب الإجماع / لا ١٧٧ و الفصل : ٣/ ٢٤٥.

[٥٧٨] المعتمد في أصول الدین / لا ٢٧١، ٢٧٢.

[٥٧٩] المغني : ٨/ ١٣١.

[٥٨٠] مجموع الفتاوى : ٣/ ٢٦٧، ٢٦٨.

[٥٨١] إیثار الحق على الخلق/ لا ١١٦، و لا ١٢١، ١٣٨.

[٥٨٢] جامع البـیان في تأویل القرآن : سورة الأنعام / ١٢١

[٥٨٣] تفسیر القرطبـي : سورة الأنعام / ١٢١

[٥٨٤] تفسیر القرآن العظیم لإمام ابن کثیر : سورة الأنعام /١٢١

کوفرێك حەڵاڵ دەکات کە دەیەها بەڵگە لەسەر کوفرییەتییەکەی هاتووە؟ ، بێگومان کوفر و ڕیددەی ئەم گەورەترە.

ئێستا دەپرسم یوسف ﷺ تووشی کام حاڵەت بوو؟ بێگومان دەبێت تووشی یەکێك لەم حاڵەتانە بوبوێت، سێ حاڵەت و چوارەمی نیە .

بۆیە پێویستە بگوترێت ئەم شوبهەیە لە ئەساسەوە درۆ ودەلەسە وچەواشەکاریەك نەبێت هیچی تر نیە چونکە لەهەر دەرگایەکیان بدەن کێشەکەیان لەوی تر قورستر دەبێت، چونکە هەرگیز یوسف ﷺ حوکمی بە یاسای غەیری الله ﷻ نەکردووە، بەڵکو پەیوەست بووە بە حوکمەکەی الله ﷻ .

یان دەبێت بڵێن یوسف ﷺ شوێنی بەرنامەی کافران کەوت ووازی لە بەرنامەکەی الله ﷻ هێنا، لە کاتێکدا کە یوسف ﷺ هەرخۆی وەڵامی ئەم شوبهەیە پوچە دەداتەوە کە دواتر باسی لێوە دەکرێت، یانیش دەبێت بوترێت ئەم شوبهەیە لە ئەساسەوە درۆیەك نەبێت هیچی تر نیە .

ئەمەی تاکو ئێستا باسمانکرد وەڵامی گومانەکە نەبوو، ئەمە تەنها نیشاندانی نەزۆکیشوبهەکە و لاوازییەکەی بوو، چونکە پێچەوانەی دەقی قورئان ودینی پێغەمبەران ئەصڵ و قاعیدە شەرعییەکانە کە پێغەمبەران بۆی هاتن .

## وەڵامی شوبهەکە دەدەینەوە لە چەند ڕوویەکەوە

١- ئایا یوسف پێغەمبەر ﷺ لەو ڕێچەکەیە لایدا کە خوای تعالی نیشانی دابوو ؟

٢- ئایە هەر بەڕاست ئەو حکومەتە کوفری بوو ؟

٣- یوسف ﷺ حوکمی بە یاسای الله تعالی کرد !.

**ڕووی یەکەم : ئایا یوسف عليه السلام لە ڕێچکەی پێغەمبەرایەتی لایدا؟**

ئەمیش بە چەند ئایەت و فەرموودەیەك وەڵام دەدینەوە :

١- وەك باسكرا دەگوترێت یوسف عليه السلام چووە ناو حكومەتی كوفرەوە و تاغوتەوە. باشە كەواتە یوسف پێغەمبەر وازی لە بانگەوازی پێغەمبەرایەتی هێناوە ! چونكە هەموو پێغەمبەران بۆ ئەوە هاتن كە خەڵك ئاگاداربكەنەوە كە كوفر بە تاغوت بكەن و لێیان دووربكەونەوە نەك شوێنیان بكەون و ببنە هاوكار و هاودەستیان ، خوای تعالی دەفەرمووێ ﴿**ولقد بعثنا في كل أمة رسولا أنعبدوا الله واجتنبوا الطاغوت**﴾ . واتە : بەڕاستی بۆ هەموو گەلێك پێغەمبەرێكمان بۆ ناردن تاكو بانگەوازیان بكەن بۆ دوو شت :

أ- پەرستنی الله تعالی .

ب- پشت هەڵكردن لە تاغوت .

كەواتە یوسف وازی لەمە هێناوە، چونكە پێغەمبەران هەمیشە توندترین ململانێیان لەگەڵ تاغوتان بووە، وە دژایەتی تاغوتانیان كردووە و خەڵكیان ئاگادار كردۆتەوە كە لە تاغوت دوور بكەونەوە . ئێستا كەواتە یان یوسف (علیه السلام) وازی لەم ئامانجە هێناوە ، یان ئایەتەكەی قورئان ڕاست نیە ، یان خاوەنی شوبهەكە ڕووی ڕەشە و إفترا بەسەر خۆشەویستمان یوسف پێغەمبەر (علیه السلام) دەكات ، كە بێگومان سێهەمیانە .

لە جوانی وگەورەی قورئان ئەوەیە هەر گومڕایەك گومانێك دروست بكات ولە قورئان بەڵگە بۆخۆی بهێنێ، الله سبحانه وتعالى هەرلەو سورەتە باطلی قسەكەی دەردەخات.

خوای تعالی لەسەر زاری یوسف عليه السلام خۆیەوە نقلی دەكات بۆمان كە فەرموویەتی ﴿**إن الحكم إلا لله**﴾ . واتە حوكم تەنها بۆ خوایە، ئائەمە وتەی خۆشەویستمان یوسفی كوڕی یعقوبە صەڵات و سەلام لەسەر هەردووكیان.

دووباره ئەم ئایەتە ڕووی ڕەشی ئەم مونافیقانە دەردەخاتەوە کە یوسف پێغەمبەر زۆر باش زانیویەتی کە حوکم بۆ کێیە ؟ ، چۆن دەکرێت بە زمان شتێك بلێیت و بە کردەوە هەڵوەشێنەرەوەکەی ئەنجامبدات ؟ کە ئەمیش دیسان دوورە لە ڕێبازی پێغەمبەران.

٣- خوای تعالی دەفەرمووێ : ﴿وَتِلْكَ حُجَّتُنَا آتَيْنَاهَا إِبْرَاهِيمَ عَلَى قَوْمِهِ نَرْفَعُ دَرَجَاتٍ مَنْ نَشَاءُ إِنَّ رَبَّكَ حَكِيمٌ عَلِيمٌ (٨٣) وَوَهَبْنَا لَهُ إِسْحَاقَ وَيَعْقُوبَ كُلًّا هَدَيْنَا وَنُوحًا هَدَيْنَا مِنْ قَبْلُ وَمِنْ ذُرِّيَّتِهِ دَاوُودَ وَسُلَيْمَانَ وَأَيُّوبَ وَيُوسُفَ وَمُوسَى وَهَارُونَ وَكَذَلِكَ نَجْزِي الْمُحْسِنِينَ (٨٤) وَزَكَرِيَّا وَيَحْيَى وَعِيسَى وَإِلْيَاسَ كُلٌّ مِنَ الصَّالِحِينَ (٨٥) وَإِسْمَاعِيلَ وَالْيَسَعَ وَيُونُسَ وَلُوطًا وَكُلًّا فَضَّلْنَا عَلَى الْعَالَمِينَ (٨٦) وَمِنْ آبَائِهِمْ وَذُرِّيَّاتِهِمْ وَإِخْوَانِهِمْ وَاجْتَبَيْنَاهُمْ وَهَدَيْنَاهُمْ إِلَى صِرَاطٍ مُسْتَقِيمٍ (٨٧) ذَلِكَ هُدَى اللَّهِ يَهْدِي بِهِ مَنْ يَشَاءُ مِنْ عِبَادِهِ وَلَوْ أَشْرَكُوا لَحَبِطَ عَنْهُمْ مَا كَانُوا يَعْمَلُونَ (٨٨) أُولَئِكَ الَّذِينَ آتَيْنَاهُمُ الْكِتَابَ وَالْحُكْمَ وَالنُّبُوَّةَ فَإِنْ يَكْفُرْ بِهَا هَؤُلَاءِ فَقَدْ وَكَّلْنَا بِهَا قَوْمًا لَيْسُوا بِهَا بِكَافِرِينَ (٨٩) أُولَئِكَ الَّذِينَ هَدَى اللَّهُ فَبِهُدَاهُمُ اقْتَدِهْ قُلْ لَا أَسْأَلُكُمْ عَلَيْهِ أَجْرًا إِنْ هُوَ إِلَّا ذِكْرَى لِلْعَالَمِينَ (٩٠)﴾[٥٨٥]. واتە: (لە دوای ئەوەی خوای تعالی باسی ئەو پێغەمبەرانە دەکات و بە وەصفێکی جوان وەصفیان دەکات ، لە ناویاندا یوسف (علیه السلام) ، پاشان الله ﷻ فەرمووی ﴿أُولَئِكَ الَّذِينَ هَدَى اللَّهُ فَبِهُدَاهُمُ اقْتَدِهْ﴾[٥٨٦] واتە : ئائەم پێەمبەرانە خوای تعالی هیدایەتی دان، دەسا تۆیش ئەی محمد ﷺ شوێن ڕێچکە و هیدایەتی ئەوان بکەوە و إقتدای پێوەبکە .

گوتم : ئەگەر یوسف عليه السلام بەژداری لە حکومەتی کافردا کردبێت وحوکمی بە یاسای ئەوان کردبێت، ئەوا بێگومان ڕێگەی هیدایەتە هەروەکو الله ﷻ فەرمووی

---

[٥٨٥] (سورة الأنعام)

[٥٨٦](سورة الأنعام / ٩٠)

﴿**هَدَى اللَّهُ**﴾، کەواتە دەبــیت محمد پێغەمبــەریش ﷺ بچێتە حکومەتی کافرەوە ، چونکە ئەگەر ئەوە هیدایەت بــیت کەواتە خۆشەویستمانیش ﷺ فەرمانی پێکرابوو کە شوێنی ئەو هیدایەتە بکەوێت ﴿**فَبِهُدَاهُمُ اقْتَدِهْ**﴾ . بەڵام پێغەمبــەری خوا ﷺ هەرگیز ئەمەی نەکرد ، وە هەرگیز نەچووە ناو حکومەت و شوێنی بڕیاری قورەیشەوە و لـەگەڵیانا دەست تێکەڵ بکات وەکو ئەمڕۆ ، نەخێر : تەنانەت بۆ جارێکیش نەچووە (دار الندوة) کە پەرلـەمانەکەی قورەیــش بوو ، بەڵکو تاکو وەفاتی کرد دژایەتی کردن و خوێنی حەڵاڵ کردن ، ئائـــەمە بوو خۆشـــەویستـــمان ﷺ.

تەنانەت الله ﷻ ئاگاداری دەکاتەوە کە کەمێکیش لـە حوکمەکەی الله عليه السلام لانەدات، هەروەکو الله پێی دەفەرمووێ ﴿**واحذرهم أن يفتنوك ببعض ما أنزل الله إليك**﴾.

**کەواتە** : یان یوسف عليه السلام لـەسەر هیدایەت نەبووە (پەنابەخوا) ، یان محمد ﷺ شوێنی هیدایەت نەکەوت (پەنابەخوا) ، یانیش دیسان خاوەنی شوبهەکە ڕووی ڕەش بوو وە خوای تعالى دیسان فەزحی کرد. کە بــێگومان سێهەمیان تەواوە .

٤- خۆشەویستمان یوسف پێغەمبـــەر عليه السلام دیسان خۆی وەڵامی ئەم نەخۆشانەمان بۆ دەداتەوە و خوای تعالى بۆی نقڵ کردووین و دەفەرمووێ ﴿**إِنِّي تَرَكْتُ مِلَّةَ قَوْمٍ لَا يُؤْمِنُونَ بِاللَّهِ وَهُمْ بِالْآخِرَةِ هُمْ كَافِرُونَ (٣٧) وَاتَّبَعْتُ مِلَّةَ آبَائِي إِبْرَاهِيمَ وَإِسْحَاقَ وَيَعْقُوبَ مَا كَانَ لَنَا أَنْ نُشْرِكَ بِاللَّهِ مِنْ شَيْءٍ ذَلِكَ مِنْ فَضْلِ اللَّهِ عَلَيْنَا وَعَلَى النَّاسِ وَلَكِنَّ أَكْثَرَ النَّاسِ لَا يَشْكُرُونَ**﴾[٥٨٧] . واتە : من وازم لـە ڕێبازی میللـەتێك هێناوە کە بە خوا ﷻ و ڕۆژی قیامەت بیّ بڕوا بن ، بەڵکو شوێنی ڕێبازی باو باپیرانی خۆم إبراهیم و إسحاق و یەعقوب کەوتوم ، بۆ ئێمە نیە کە

[٥٨٧](سورة یوسف / ٣٧ و ٣٨)

شەریكمان بۆ الله ﷺ قەرار دابـێت ، ئائەمە فەزڵ و منەتی الله تعالی لـە لەسەرمان ، بەڵام زۆرینەی هەرەزۆری خەڵك سوپاس گوزاری الله نین .

ئەم ئایەتە پیرۆزەیش دیسان وەڵامی ئەم قسە پوكاوە دەداتەوە لـە چەند ڕوویەكەوە:

١ – خۆشەویستمان یوسف ﷺ خۆی دەفەرمووێ من وازم لـە ڕێچكەی كافران هێناوە ، ئەی كەواتە چۆن دەچێت و دەستیان لـەگەڵ تێكەڵ دەكات ؟؟

یان ئەوەتا قورئان بە هەڵە بەسەرهاتەكەمان بۆ نقل دەكات، یانیش یوسف ﷺ كار بە وتەكەی خۆی ناكات ، یانیش وتەی ئەم كافرە جەهمییانە درۆودەلـەسەیە و هیچی تر نیە، چونكە ئەم جەهمیانە دەڵێن یوسف ﷺ چووە ناو حكومەتێكی كافر و بوە عەزیز و حوكمی بە یاسای ئەوان كردووە، یوسف ﷺ خۆی وەڵامدەداتەوە و دەفەرمووێ من پشتم لـە كافران كردووە نەك ببمە هاودەستیان.

٢– پاشان دەفەرمووێ من شوێنی ڕێبازی باپیرم إبراهیم كەوتووم هەروەكو فەرمووی ﴿وَاتَّبَعْتُ مِلَّةَ آبَائِي إِبْرَاهِيمَ﴾ . ئایە میلـلـەتی إبراهیم چی بوو ؟؟ خوای تعالی بۆی ڕوونكردینەتەوە كە میلـلـەتی إبراهیم چی بوو : هەروەكو فەرموویەتی : ﴿قَدْ كَانَتْ لَكُمْ أُسْوَةٌ حَسَنَةٌ فِي إِبْرَاهِيمَ وَالَّذِينَ مَعَهُ إِذْ قَالُوا لِقَوْمِهِمْ إِنَّا بُرَآءُ مِنْكُمْ وَمِمَّا تَعْبُدُونَ مِنْ دُونِ اللَّهِ كَفَرْنَا بِكُمْ وَبَدَا بَيْنَنَا وَبَيْنَكُمُ الْعَدَاوَةُ وَالْبَغْضَاءُ أَبَدًا حَتَّى تُؤْمِنُوا بِاللَّهِ وَحْدَهُ﴾ . واتە : بۆ ئێوە پێشەنگێكی جوان و باش هەیە لـە (ڕێبازی) إبراهیم پێغەمبـەردا ﷺ و هاوەڵـانیدا ، كاتێك بە قەومەكەی خۆیانیان فەرموو : ئێمە بەرین لـە ئێوە (حاشاتان لـێبێ) وە حاشا لـە پەرستراوەكانیشتان دەكەین ، بە ئێوە كافرین (واتە بە كافرتان دەزانین) ، وە بـیشزانن كە نێوان ئێمە و ئێوە دوژمنایەتی و ڕق و كینەیە هەتاكو ئیمانێكی ڕاستەقینە بە الله تعالی دەهێنن و بە تاك و تەنها دەیپەرستن .

ئائەمە ڕێبازی باوکی پێغەمبـەران إبراهیم بوو ، کە هەتاهەتایە دوژمنایەکی کافران بکات و ڕقی لـێیان بـیت و حاشایان لـێبکات ، نەك ببـیتە هاوکاریان و دەستیان لـەگەڵ تێکەڵ بکات و بچێتە حکمومەتەکەیە وە و شوێنی بەرنامەی کافران بکەوێت .

کەواتە : یان ئایەتەکەی قورئان ڕاست نیە و ڕێبازی إبراهیم  بەوشێوازە نیە ، یانیش یوسف  کار بە قسەکەی خۆی ناکات، یانیش دووبارە خوای تعالی ڕووی خاوەن گومان و شوبهەکەی ڕەش کردەوە و فەزحی کرد .

**گوتم** : یوسف  شوێنی ئەو دینە پاکە کەوتبوو کە خۆی لـە تەکفیری کافران و دژایەتی کردنیان دبـینیەوە، وە هەرگیز لـەو ڕێچکە پاکە لاینەداوە، بەڵکو کاری پێکردووە و بانگەوازی بۆ کردووە، وە هەرگیز لـەو ڕێچکە پاکەدا نیە کە ببـیتە هاوکار و هاودەستی کافر، چونکە ئەم ڕێکەی پێغەمبـــەرایەتییە ئیمان هێنانە بە الله تعالی و ملکەچ بوون بۆ بەرنامەکەیەتی ، وە کوفر کردنە بە تاغوت و دژایەتی کردنیانە ، نەك هاودەست بونیان .

## ڕووی دووەم : ئایا دەسەڵاتدارەکەی میسر کافر بوو ؟

خاوەنی ئەم شوبهە لاوازە دەڵێن ئەوەتا حاکمەکە کافر بوو، کەچی یوسف پێغەمبـەر  چووە حکومەتەکەیەوە ، بۆیە کەواتە دروستە لـە حکومەتی کافرا بە ژدار بـیت وکار بە یاسای ئەوان بکەین .

دیارە مفسیرین وەڵامی ئەم پرسیارەیشیان بۆ داوینەتەوە ، بۆچوونی بەهێز ئەوەیە کە ئەم مەلیکە شوێنی دینی تەوحید کەوتووە و ئیمانی هێناوە، چونکە ئەمە کاری هەموو پێغەمبـەرانە (صەڵات و سەلامی خوایان لـێبێ) کە هەمیشە بانگەوازیان بۆ دین و تەوحید کردوە و هەرگیز لـێی ماندوو نەبوونە، ئەوە یوسف  کاتێك لـە زیندان بوو دوو هاورێکەی پرسیاریان لـێکرد دەربارەی خەون و واتاکەی، کەچی یوسف  پێش ئەوەی وەڵامیان بداتەوە باسی بابەتێکیان بۆدەکات کە ئەوان پرسیاریان لـێوەنەکردوە کە تەوحیدە ، هەروەکو الله تعالی بۆی نقلّ کردووین و

دەفەرمووێ ﴿**إِنِّي تَرَكْتُ مِلَّةَ قَوْمٍ لَا يُؤْمِنُونَ بِاللَّهِ وَهُمْ بِالْآخِرَةِ هُمْ كَافِرُونَ (٣٧) وَاتَّبَعْتُ مِلَّةَ آبَائِي إِبْرَاهِيمَ وَإِسْحَاقَ وَيَعْقُوبَ مَا كَانَ لَنَا أَنْ نُشْرِكَ بِاللَّهِ مِنْ شَيْءٍ ذَلِكَ مِنْ فَضْلِ اللَّهِ عَلَيْنَا وَعَلَى النَّاسِ وَلَكِنَّ أَكْثَرَ النَّاسِ لَا يَشْكُرُونَ (٣٨) يَا صَاحِبَيِ السِّجْنِ أَأَرْبَابٌ مُتَفَرِّقُونَ خَيْرٌ أَمِ اللَّهُ الْوَاحِدُ الْقَهَّارُ (٣٩) مَا تَعْبُدُونَ مِنْ دُونِهِ إِلَّا أَسْمَاءً سَمَّيْتُمُوهَا أَنْتُمْ وَآبَاؤُكُمْ مَا أَنْزَلَ اللَّهُ بِهَا مِنْ سُلْطَانٍ إِنِ الْحُكْمُ إِلَّا لِلَّهِ أَمَرَ أَلَّا تَعْبُدُوا إِلَّا إِيَّاهُ ذَلِكَ الدِّينُ الْقَيِّمُ وَلَكِنَّ أَكْثَرَ النَّاسِ لَا يَعْلَمُونَ**﴾[٥٨٨]. واته : ئەی هاوڕێکانم من وازم لـە ڕێبازی کافران هێناوە ، بەڵکو شوێنی ڕێبازی باو و باپیریانی خۆم کەوتوم إبراهیم و إسحاق و یەعقوب کەوتووم ، بۆ ئێمە شیاونیە کە هیچ جۆرە شەریکێك بۆ الله تعالی قەرار بدەین ، ئائەمە فەزڵ و منەتی الله تعالی ــە لـەسەرمان و لـەسەر خەڵکی ئەوانەی کە شوێنی ئەم ڕێبازە کەوتوون، بەڵام زۆرینەی خەڵك سوپاسگوزاری الله تعالی نین، ئەی هاوەرێیانی زیندانم ئایا ئەوە باشترە کە کۆمەڵی خوای جیاواز بپەرستن باشترە یان خوایەکی تاك و تەنها و بـیشەریك؟ خودایەك کە بەسەر هەموو شتێکدا زاڵـە ؟ ئەوانەی ئێوە دەیپەرستن هیچ و پوچە و تەنها خۆتان و باوباپیرانتان ناوتان ناون خوا و لـەخۆتانکردووە بە خوا، بەڵکو خوای تاك و تەنها بەوە ڕازی نیە و هیچ ڕینمویەکیشی بۆ نەناردوون تاکو ئەوانە بپەرستن ، بەڕاستی حوکم و حوکمڕانی تەنها بۆ الله تعالی ــە ، ئەم حاکمە فەرمانی کردووە کە تەنها ئەو بپەرستین و شەریکی بۆ قەرار نەدەین، ئائەمە دین و ڕێبازە تەواو و حەقەکەیە ، بەڵام زۆرینەی خەڵکی ئەم ڕاستیە نازانێت .

پاشان باسی خەونەکە وتەفسیرەکەیان بۆ دەکات، ئائەمە کاری پێغەمبــەران بووە، هەر جۆرێك بۆیان کرابـیت دەعوەی حەقیانکردووە و ماندوو نەبوونە ، لـە پێش هەموو شتێك دایانناوە و خاڵی دەستپێك بووە لـەلایان، بۆیــە گومان لـەوەدا نیە کە دەعوەی ئەو پادشایەی کردووە، خوای تعالی کاتێك دەفەرمووێ ﴿**فلما**

[٥٨٨](سورة یوسف / ٣٧-٣٨-٣٩-٤٠)

كلْمه﴾ واته : كاتێك یوسفی دواند و گفتوگۆیانكرد، ئەمە ڕوونە وەك باسكرا كاری لەپێشینەی پێغەمبەران دەعوە بووە بۆ دینی الله ﷻ ، بە تایبەت لەم كاتەیا كە پادشا پاكی وڕاستگۆیی یوسفی ؑ بۆ دەركەوت ئەوا ڕێزی زۆر لێگرت، كەواتە باشترین دەرفەت بووە بۆ یوسف پێغەمبەر ؑ كە بانگی بكات بۆ دین، بۆیە ئەم مەلیكە بۆتە موسڵمان .

ئیمامی تابعی مجاهدی كوڕی جبر رحمه الله دەفەرمووێ : (أسلم الملك الذي كان معه یوسف)[589]. واته : ئەو پادشایەی كە لەگەڵ یوسفی ؑ لەگەڵدا بوو موسڵمان بوو.وە هەمان وتە هەریەك لە ئیمامەكانی البغوي[590] و السیوطي[591] و ابن عطیة[592] و غەیری ئەوانیش باسی لێوە دەكەن .

وە ئیمامی مفسیر ابن كثیریش رحمه الله دەفەرمووێ : (وَأَسْلَمَ الْمَلِكُ عَلَى يَدَيْ يُوسُفَ ؑ)[593] . واته : پادشاكە موسڵمان بوو لەسەر دەستی یوسف ؑ.

كەواتە ئەم قسەیەیش ناتوانرێت هەروا بەئاسانی بوترێت حاكمی میصرٍ كافر بوو، ئەوە زانایانی تەفسرین دەفەرموون موسڵمان بووە، بەڵام ئەوەی بۆ من بەدیاركەتووە ئەوەیە كە حاكمی میصرٍ لە كۆتایدا ئیمان دەهێنێت ، چونكە كاتێك خوای تعالى دەفەرمووێ ﴿ماكان لیأخذ أخاه في دين الملك﴾ واته كاتێك براكەی خۆی گلدایەوە یوسف ؑ ئەم كارەی لە ڕێبازی مەلیكەوە نەكرد، كەواتە ڕێبازی مەلیك جیابووە و غەیری دینی یوسف ؑ بووە ، بەڵام دواتر ئیمانی هێناوە والله أعلى وأعلم.

---

[589] تفسیر الإمام الطبري / ر.١٩٤٦٢

[590] (٢/ ٤٣٣)

[591] (٤/ ٤٤)

[592] (٣/ ٢٥٦)

[593] تفسیر الإمام ابن كثیر : ٣٩٦/٤

## ڕووی سێهەم : یوسف عليه السلام حوكمی بە یاسای الله تعالی كرد

گریمان حاكمەكەیش كافر بوو، وە یاسای وڵاتیش كوفری بوو، ئایا یوسف پێغەمبەر عليه السلام چووە ناو حكومەتەكە و وەكو بەناو ئیسلامیەكانی ئەمڕۆ كار بەو یاسا كوفریانەی دەكرد ؟ ، ئایا ملكەچی تاغوت بوو ؟؟ نەخێر ! بەڵكو حوكمی بە یاسای الله تعالی كرد و یاسای وڵاتی پشت گوێ خست، خوای تعالی خۆی ئەمەمان بۆ ڕووندەكاتەوە كە دواتر باسی دەكەین ، بەڵام پێویستە ئەمە بە خاڵ خاڵ ڕوونبكرێتەوە :

یوسف عليه السلام ناچار نەكرا ملكەچی یاسای كوفری ببیت، بەڵكو ئازاد كرا و حورییەتی تەواوی پێدرا لە چۆنییەتی حكومڕانی، نەوەك وەكو بەناو ئیسلامییەكانی سەردەم لە حكومەتە كوفرییەكان بەژدار دەبن وناچار دەكرێن تاكو ملكەچی یاسا كوفری و دیموكراسیەكانی ئەورووپا دەكرێن، تەنانەت وایلێهاتووە خۆیان بانگەشە بۆ دیموكراسیەت دەكەن، ئەوەندە باسی دیموكراسی دەكەن نیوئەوەندی باسی حوكمی الله سبحانه وتعالى ناكەن، ئەوە ڕاستیە و بە چاوی خۆمان دەیبینین كە ملكەچی بڕیاری كافران بوونە و تووشی شیركی أكبر بوون .

بەڵام یوسف عليه السلام تەواو ئازادكرا كە حوكم بە چی دەكات، بۆیشە یوسف پێغەمبەر عليه السلام بەژداری كرد، ئەگینا هەرگیز ناچووە ناو حكومەتێكی بەو شێوازەوە ، هەروەكو الله تعالی بۆمانی ڕوون دەكاتەوە و لەسەر زاری پادشاكەی مصرەوە دەفەرمووێ ﴿إِنَّكَ الْيَوْمَ لَدَيْنَا مَكِينٌ أَمِينٌ﴾[٥٩٤]. واتە : پادشاكە بە یوسفی گوت : تۆ لەمڕۆوە لەلامان كەسێكی خاوەن پلە و پایە و جێ متمانەیت .

پاشان خوای تعالی دەفەرمووێ ﴿وَكَذَلِكَ مَكَّنَّا لِيُوسُفَ فِي الْأَرْضِ يَتَبَوَّأُ مِنْهَا حَيْثُ يَشَاءُ﴾[٥٩٥]. واتە ئابەو شێوازە یوسفمان عليه السلام لە مصر كردە خاوەن

[٥٩٤] (سورة یوسف / ٥٤)

[٥٩٥] (سورة یوسف / ٥٦)

دەسەڵات ، هەرچیەکی بویستایە بۆی دەکرا و لە هەرشوێنی بـیویستایە لـەوێ دەبوو .

لێرەوە بۆمان دەردەکەوێت کە یوسف عليه السلام ملکەچی یاسای کوفری نەکراوە، مادام ئازادکراوە، ئەوا ئەمیش بـێگومان بەرنامەی الله تعالى پەیڕەو دەکات، ئەگەر پێغەمبـەران بەرنامەی الله سبحانه وتعالى جێبەجێ نەکەن ئەی کێ جێبەجێی دەکات ؟، یوسفێك کە لـە زیندان حوکمی الله تعالى ـی بـیرنەچوو ، بەڵکو دەیفەرموو ﴿إن الحكم إلا لله﴾[596] واتە حوکم تەنها بۆ الله تعالى ـە، ئەی چۆن دواتر جێبەجێی ناکات، بۆیــە ئایەتەکە سەلمێنەری ئەوەیە کە یوسف حوکمی بە یاسای کوفری نەکردووە .

ئیمامی السدی دەفەرمووێ : (استعمله الملك على مصر، وكان صاحب أمرها، وكان يلي البـيعَ والتجارة وأمرَها كله، فذلك قوله: ﴿وكذلك مكنا ليوسف في الأرض يتبوأ منها حيث يشاء﴾)[597]. واتە پادشاکە کردی بەدەسەڵاتدار وخاوەن بڕیاری وڵات..

وە ئیمامی الطبري دەفەرمووێ : (**أي: متمكن مما أردت، وعرض لك من حاجة قبلنا، لرفعة مكانك ومنزلتك، لدينا أمين على ما أؤتمنت عليه منشيء**)[598] . واتە : تەمکینت هەیە بەوەی کە دەتەوێ ..

الله تعالى ئەوی کرد بە دەسەڵاتدار و ئەوەی ویستی دەیکرد هەروەکو الله تعالى فەرمووی ﴿وَكَذَلِكَ مَكَّنَّا لِيُوسُفَ فِي الْأَرْضِ يَتَبَوَّأُ مِنْهَا حَيْثُ يَشَاءُ نُصِيبُ بِرَحْمَتِنَا مَنْ نَشَاءُ وَلَا نُضِيعُ أَجْرَ الْمُحْسِنِينَ﴾ واتە : ئێمە دەسەڵاتمان دا بە یوسف عليه السلام لـەو وڵاتەدا، وە هەرچیەکی بویستایە، وە هەرشوێنێکی بویستایە لـەوێ دەبوو..

---

[596](سورة يوسف / ٤٠)

[597]تفسير الطبري : سورة يوسف / ٥٦

[598]تفسير الطبري : سورة يوسف / ٥٦

کەواتە یوسف ﷵ چی دەویست دەستی دەکەوت، ئێستا من دەپرسم پێغەمبەران چییان دەویست ؟ ئایا تەنها گوێڕایەڵی الله ﷻ نیە ؟ ئایا هەرئەوە نیە کە خەڵك شوێنی حەق بکەوێ، کەواتە یوسف ﷵ حوکمی بە حوکمی الله ﷻ کرد کە ئێستا ڕوونتری دەکەینەوە.

## بەسەرهاتی بنیامین

بەڵگەی دووەم کە بە یەکجاری دەرگای جدال لـەم بابەتە دادەخات بەسەرهاتی بنیامینە، کە بەناوەی دزییەوە یوسف ﷵ بەناوەکردی بە کۆیلە، واتە لـە حوکمی دزی کردی بە کۆیلە، ئائەم حوکمە کە خۆشەویستمان یوسف ﷵ کردی خوای تعالی لـە قورئاندا بۆی ڕوونکردوینەتەوە ، هەروەکو فەرموویەتی : ﴿**فَبَدَأَ بِأَوْعِيَتِهِمْ قَبْلَ وِعَاءِ أَخِيهِ ثُمَّ اسْتَخْرَجَهَا مِنْ وِعَاءِ أَخِيهِ كَذَلِكَ كِدْنَا لِيُوسُفَ مَا كَانَ لِيَأْخُذَ أَخَاهُ فِي دِينِ الْمَلِكِ**﴾[٥٩٩]. واتە : یوسف ﷵ دەستی کرد بە گەڕان لـەناو پرسیاسکەکانی براکانی تری ، پاشان لـەناو کەل و پەل و پرسیاسکەکەی براکەی خۆی (بنیامین) ـدا دۆزیەوە ، ئابەو شێوازە ڕێگامان بۆ یوسف کێشا ، ئەم کارەیشی کە کردی لـە یاسا و شەریعەتی پادشاکەوە نەبوو.

**گوتم** : ئەم ئایەتە پیرۆزە بەڵگەیە لـەسەر ئەوەی کە یوسف ﷵ حوکمی بە یاسای الله تعالی کردووە نەك یاسای وڵات، یاسای وڵاتی میصر لـەو کاتەدا بۆ کەسانی دز ئەوەبوو کە تێی هەڵبدرێت و بە دووقاتی لـێبسەنرێتەوە لـەو شتەی کە بردوویەتی ، بەڵام یوسف ﷵ هەرگیز پشت لـە حوکمی الله تعالی ناکات، بۆیــە حوکمی بە یاسای الله تعالی کرد ، چونکە لـەیاسای الله تعالی کە بۆ یەعقوبی باوکی ﷵ ناردبوو بۆ دز ئەوەبوو کە دەکرا بە کۆیلە، بۆیــە یوسف پێغەمبــەر ﷵ ویستی کارێك بکات کە براکەی لای خۆی بهێڵێتەوە ، بۆیــە لـە بەرچاوی براکانی تری تۆمەتی دزیدا بە پاڵی .

[٥٩٩](سورة یوسف / ٧٦)

خوای تعالی ـیش ئەم بەسەرهاتەمان بۆ دەگوازێتەوە و باسی ئەوەمان بۆ دەكات كە یوسف عليه السلام شوێنی یاسای الله سبحانه وتعالى كەوت نەك یاسای وڵاتی میصر ، بۆ ئەوەی كەس پەیدا نەبـیت بلّێت یوسف عليه السلام پشتی لـە یاسای الله سبحانه وتعالى كرد ، بەڵام لە سەرووی ئەوەیشەوە ئەمڕۆ كەسانێكی نەزان بە دینی الله تعالی دەڵێن یوسف عليه السلام حوكمی بە یاسای الله تعالی نەكرد ، هەركەسێك بە زانینەوە ئەو قسەیە بكات پێی كافر دەبـیت ، چونكە كوفری داوەتە پاڵ پێغەمبـەرێكی بەڕێز كە گەورەترین درۆ و إفترای كردووە .

**ئیمام و تابعی قتادة بن دعامة** رحمه الله**:** عبدالـرزاق ڕیوایەتی كردووە (**عن معمر عن قتادة في قوله تعالى ما كان ليأخذ أخاه في دين الملك قال لم يكن ذلك في دين الملك أن يأخذ من سرق عبدا**)[600]. واته: لـە معمرەوە ئەویش لـە ئیمامی قتادەوە رحمه الله كە دەربارەی ئەو ئایەتە پیرۆزە فەرموویەتی : لـە یاسای پادشای ئەو كاتی میصردا نەبوو كە دز بكرێت بە كۆیلە.

**وە هەر ئیمام قتادة بن دعامة** رحمه الله**:** الطبري دەفەرمووێ : (**حدثنا بشر قال، حدثنا يزيد قال، حدثنا سعيد، عن قتادة قوله: (ما كان ليأخذ أخاه في دين الملك إلا أن يشاء الله) ، يقول: ما كان ذلك في قضاء الملك أن يستعبد رجلا بسرقة**)[601].

واته : ئیمامی قتادة رحمه الله دەربارەی ئایەتەكە فەرموویەتی: لـە یاسا و بڕیاری پادشاكەدا نەبوو كە دز بكرێت بە كۆیلە .

**وە ئیمامی البغوي** رحمه الله دەفەرمووێ : (**قَالُوا، يَعْنِي: إِخْوَةَ يُوسُفَ، جَزاؤُهُ مَنْ وُجِدَ فِي رَحْلِهِ فَهُوَ جَزاؤُهُ، أَيْ: فَالسَّارِقُ جَزَاؤُهُ أَنْ يُسَلَّمَ السَّارِقُ بِسَرِقَتِهِ إِلَى الْمَسْرُوقِ مِنْهُ فَيَسْتَرِقُّهُ سَنَةً، وَكَانَ ذَلِكَ سُنَّةَ آلِ يَعْقُوبَ فِي حُكْمِ السَّارِقِ، وكان في حُكْمُ مَلِكِ مِصْرَ أَنْ يُضْرَبَ السَّارِقُ وَيُغَرَّمَ ضِعْفَيْ قِيمَةِ الْمَسْرُوقِ**)[602]. واته :

[600] تفسير الإمام عبدالرزاق : سورة يوسف / ٧٥
[601] تفسير الطبري / ر. ١٩٥٧٢
[602] تفسير الإمام البغوي : ٢/٥٠٥

براكانی یوسف ﷺ وتیان : ئەگەر هاتوو شتە دزراوەكە لەلای ئێمە بوو، ئەوا حوكمەكەی ئەوەیە كە دزەكە تەسلیمی دزیلێكراوەكە بكرێت .. ئائەمەیش لە سەر ڕێبازی و یاسای بنەماڵەی پێغەمبەر یەعقوب بوو ﷺ لەسەر دز، بەڵام لە یاسای پادشای میصرِ ئەوەبوو كە لە دز هەڵبدرێت وچەندقاتی دزیەكەی لێبسەنرێتەوە.

**وە ئیمامی الطبري** رحمه الله دەفەرمووێ : (**ما كان يوسف ليأخذ أخاه في حكم ملك مصر وقضائه وطاعته منهم، لأنه لم يكن من حكم ذلك الملك وقضائه أن يسترقّ أحد بالسَّرَق**)[603]. واتە ئەو كارەی كە كردی لە حوكمی پادشاكەوە نەبوو..

**وە ئیمامی ابن ابـیطالبـي القيرواني** رحمه الله دەفەرمووێ : (**قوله: ﴿مَا كَانَ لِيَأْخُذَ أَخَاهُ فِي دِينِ الملك﴾: أي: في حكمه، بل أخذه بحكم يعقوب**)[604]. واتە : یوسف ﷺ كاتێك ئەو كارەی كرد لە حوكمی پادشاكە نەبوو ، بەڵكو بە حوكمی پێغەمبــەر یەعقوب ﷺ گرتی .

**وە ئیمامی ابن كثير** رحمه الله دەفەرمووێ : (**لَمْ يَكُنْ لَهُ أَخْذُهُ فِي حُكْمِ مَلِكِ مِصْرَ**)[605]. واتە ئەو كارەی یوسف ﷺ كردی كە براكەی كردە كۆیلە لە حوكمی پادشاكەوە نەبوو (پاشان باسی ئەوە دەكات كە لەیاسای خۆیانەوە بوو).

**وە ئیمامی الشوكاني** رحمه الله دەفەرمووێ : (**هو دين يعقوب وشريعته**)[606] كارەكەی یوسف لەسەر دین و یاسای یعقوب بوو.

---

[603] تفسير الطبري : سورة يوسف / ٧٦

[604] الهداية إلى بلوغ النهاية في علم معاني القرآن وتفسيره، وأحكامه، وجمل من فنون علومه : سورة يوسف / ٧٦

[605] تفسير ابن كثير : ٤٠١/٤

[606] فتح القدير : ٤٣/٣

**گوتم** : یوسف پێغەمبــەر ﷺ هەرگیز حوکمی بە یاسای تاغوتی کافران نەکردووە، بەڵکو بەو حوکمە حوکمی کردووە کە الله تعالی لـە ڕێگەی وەحیەوە بۆی ناردووە، خوای تعالی خۆی یوسف پێغەمبەری کرد بە دەسەڵاتدار ﴿**ولقد مكّنّا ليوسف**﴾ ، بۆیــە هەرگیز ئیهمالی ناکات کە چۆن ئەو دەسەڵاتە بباتە ڕێوە، ئەم نمونەیەیش تەنها نمونەیەك بوو لـە حوکمی خۆشەویستمان یوسف ﷺ کە ئەم پێغەمبــەرە حوکمی بە حوکمی الله تعالی کردووە نەك یاسای تاغوتان .

بۆیـــە ئەمە بە هیچ شێوەیەك نابــیتە بەڵگە بۆ ئەو دیموکراسی خوازانەی ئەمڕۆ بەناوی ئیسلامیەوە لـە کوفرا چەقیون و دەستیان لـەگەڵ کافران تێکەڵ کردووە، وە هەرگیز توانای ئەوەیان نیە کە حوکمی الله ﷻ جێبەجێ بکەن ئەگەر خۆیشیان بــیانەوێت، بەڵکو پێویستە ملکەچی حوکمی زۆرینە و دیموکراسی بن، هەرچەندە ئێستا ئەمانیش خۆیان بانگەشە بۆ دیموکراسی دەکەن، بەڵام یوسف ﷺ بەم شێوازە نەبوو ، بەڵکو یاسای الله تعالی ــی جێبەجێ کرد و ملکەچی یاسای کوفری نەبوو .

## شوبهەی هەشتەم : بابەتی و مەصڵەحەت و مەفسەدەت

ئەو کەسانەی کە بەناوەی دینەوە بەژداری لەم جۆرە حکومەتانە دەکەن بەناوەی مەصلەحەتەوە بەژداری دەکەن، دەڵێن ئێمە بچینە دەسەڵات باشترە لەوەی کە عیلمانیەك بچێت، ئێمە گۆڕەپان بۆ ئەوان چۆڵ ناکەین، ئێمە تێدەکۆشین بۆ حەق ... هتد لەم قسانە .

**گوتم** : مەگەر تێکۆشانی ئێوە تەنها بۆ موچە و بایەعی مانگانە نیە ؟ ، هەرگیز نەمان بینی دژی شیرکی دیموکراسی تێبکۆشن وشەڕ لەسەر حوکمی الله بکەن، بەڵکو بە پێچەوانەوە ئێستا خۆتان بانگەشە بۆ دیموکراسی دەکەن، ئەمیش شتێك نیە لە خۆمانەوە بیلێین، بەڵکو بەرنامەی حیزبە بەناوئیسلامییەکانتانە .

چ مەصلەحەتێك لەوەدا هەیە کە تۆ خەریکی شەڕ کردن بیت لەسەر موچە و نەوت وخواردن، کەچی خۆت تووشی شیرك کردووە وبڕوات بە دینی دیموکراسی هێناوە؟، بە یەکەم هەنگاوت بۆ ناو پەرلەمان بڕوات بە حوکمی گەل و زۆرینەو چەمکە دیموکراسیەکان هێناوە، ئایە تۆ خۆت کافر دەکەیت بۆ ئەوەی عیلمانی نەیاتە سەر حوکم؟ بەڵام تۆ خۆت کافر کرد وهەر عیلمانیش لەسەر حوکمە، چونکە هەرگیز دین بە شیرك نایەتەوە، خۆ ئەگەر بچنە حوکمیش ئەوا هەرگیز حوکمی خودا ناهێننەوە، ئەوەیشمان بینی لە میصر و تورکیا و پاکستان و مالیزیا وغەیری ئەوانیش کە بەناو ئیسلامیەکان چوونە دەسەڵات کە وەکو ئێوە خۆیان بە خادمی دین دەزانی، کەچی کەسیان ئامادە نەبوون بۆ ڕۆژێکیش حوکمی قورئان جێبەجێ بکەن .

مصلحە و مفسدە :گەورەترین مەصلەحەت بریتیە لە تەوحید، ئەمە مەصلەحەتی گەورەیە کە هۆکاری ڕزگارکردنی گەردنی بەندەکانە لە سزایەتی پشت شکێن .

گەورەترین مەفسەدەیش شیرکە، ئێوە نەك مەصلەحەتەکەتان نەپێکاوە، بەڵکو تووشی گەورەترین مەفسەدەیش بوونە کە شیرکە، ئێوە موشریکن چونکە بڕواتان

بەوە هێماوە کە گەلیش بۆی هەیە حوکم بدات، شوێنی دیموکراسی کەوتن و وازتان لـە حوکمی الله ﷻ هێناوە و تەنانەت هەوڵیشی بۆ نادەن، تەنانەت یەکێك لـە ئەندامە هەرە بەرزەکانی یەکێك لـەم حیزبە بەناوئیسلامیانەی وڵاتی خۆمان دەڵێت : بچینە حوکم حوکم بە یاسایەکە مەدەنیانە و دیموکراسیانە دەکەین نەك دینی، تەنانەت دەڵێت من دڵنیای دەدەم لـەم بارەوە !! (پەنابەخوا) لـەم شیرکە .

خوای تعالی کەسی نەکردووە بە شەریکی خۆی لـە حوکمدا، کەچی ئەمان گەل دەکەن بە شەریکی الله تعالی لـە حوکمدا، ئەمان دیموکراسی دەکەن بە شەریکی الله تعالی لـە حوکمیدا ، دیموکراسیەك کە ئەوروپا بۆی هێناین، دیموکراسیەك کە هەموو ئەحکامە ئیسلامیەکانی لـە دەستووری وڵات لادا و پاشان سەرلـەنوێ لـەسەر بڕیاری زۆرینە یاسا دادەنێتەوە، هیچیش لـەلای گرنگ نیە پێچەوانەی یاسای الله تعالی بـیت یان نا .

کەواتە بەهیچ شێوەیەك باسی مەصلّەحە و مەفسەدە مەکەن، چونکە خۆتان تووشی گەورەترین مەفسەدە بوونە بەوەی کە بە دیموکراسی ڕازی بوونە، مەصلّەحەتی گەورە تەوحیدی الله تعالی ـە نەك موچە و خواردن.

مەصلّەحەت لـەوەدایە تەوبە بکەن وبگەڕێنەوە بۆلای الله تعالی وبانگەواز بۆ تەوحید بکەن ودژی کوفری دیموکراسی بوەستنەوە و هەوڵ بۆ چەسپاندنی یاسای الله ﷻ بدەن نەك ئەوروپا . (والله المستعان).

## شوبهەی نۆهەم: نەجاشی حوكمی بە قورئان نەكرد كەچی كافریش نەبوو !

دیارە یەكێكی تر لـە گومانی ئەوانەی كە بەژداری لـەم حكومەتە تاغوتیانە دەكەن، دەڵێن ئەوەتا نەجاشی پادشای حەبەشە حوكمی بە قورئان نەكرد و كافریش نەبوو.

**ئەمیش وەڵام دەدرێتەوە لەچەند ڕوویەكەوە :**

١- پێش هەموو شتێك ئەمە خۆی لـە خۆیدا ڕاست نیە كە دەوترێ حوكمی پێنەكردووە، چونكە هیچ بەڵگەیەك نیە نە لـە قورئان و نەلـە سونەت وهیچ ئەسەرێكی صحیح، تەنانەت هیچ بەسەرهاتێكی مێژووی كە جێی متمانە بـیت وئەم قسەیە پشت ڕاست بكاتەوە، من ناڵێم حوكمی بە قورئان كردووە، بەڵام نایشلـێم حوكمی پێنەكردووە، چونكە بەڵگە لـەم بارەوە نیە، ئەگەر دەیشلێن هەیە فەرموون بـیهێنن، نە بۆتان هێناین نە دەیشیهێنن .

٢- گریمان وابوو بە قسەی ئێوە ئەم پیاوە چاكەكارە حوكمی بە قورئان نەكرد، ئایە هۆكاری چیبوو؟ ئایە وەكو ئێوە شەرمی لـە ئاشكرا كردنی دین و بەرنامەی خۆی دەكرد ؟ ، نەخێر بەڵكو هۆكارێكی تری هەبوو .

ئەویش ئەوەبوو: كە نەجاشی ﵀ دینی بە تەواوی پێنەگەیشتبوو، ئەمیش بە سێ هۆكار :

**یەكەم** : بە هۆی زۆر دووری شوێنەكەی لـە پێغەمبــەری خواوە ﷺ.

**دووەم** : بەهۆی كامڵ نەبوونی دین، ئەو كاتەی نەجاشی لـە ژیاندا بوو دین و أحكامەكان كامڵ نەبووبوو، بەردەوام ئایەت دادەبەزی وأحكامی نوێ دەهاتە خوارەوە، وە ئایەتی ناسخ دەهاتە خوارەوە وبابەتە مەنسوخەكان كەمە كەمە دەردەكەوتن، بۆیــە ئەمە ئەستەمە كە بۆ كەسێك كە لـە وڵـاتێكی دووری وەكو حەبەشە ئاگاداری ئەم هەموو زانستە بـیت .

**سێیەم** : ئەو کات کە هاوەڵان چوون بۆ حەبەشە وئەو ئایەت وبنەما شەرعیانەیان دەزانی و بۆ نەجاشیان خوێندەوە، ئەوکات سەردەمی مەککی بوو وە هاوەڵانیش تەنها کەمێك لـە ئایەتە مەککییەکانیان دەزانی، لـە کاتێکدا ئایەتەکانی حوکم ودەوڵەتداری و حەددەکان لـە مەدینەی پیرۆز دابەزین، کەواتە ئەوکاتەی هاوەڵان چوون بۆ حەبەشە ئەصڵەن ئەم بابەتانە هەر دانەبەزیبوون، تەنانەت بابەتانێکی وەکو زەکات ورۆژوو وزەکات وجیهاد هەمووی لـە مەدینە دابەزی، چ جای بگاتە حوکم وحەدد وبابەتە فەرعیەکان.

کەواتە نەجاشی لۆمە ناکرێت کە بۆچی حوکمی پێنەکرد، تەنانەت هاوەڵانیش بـێبەش نەبوون لـەم کێشەیە ، ئیمامێکی وەکو عبداللە ـی کوڕی مسعود رضي الله عنه کە لـە زانایانی صەحابەیە بەڵام تووشی ئەم کێشەیە بوبوو.

ئیمامی البخاري رحمه الله دەفەرمووێ : (**حَدَّثَنَا ابْنُ نُمَيْرٍ ، حَدَّثَنَا ابْنُ فُضَيْلٍ ، حَدَّثَنَا الأَعْمَشُ ، عَنْ إِبْرَاهِيمَ ، عَنْ عَلْقَمَةَ ، عَنْ عَبْدِ اللهِ (إبن مسعود) رضي الله عنه قَالَ : كُنَّا نُسَلِّمُ عَلَى النَّبِـي صلى الله عليه وسلم وَهُوَ فِي الصَّلاَةِ فَيَرُدُّ عَلَيْنَا فَلَمَّا رَجَعْنَا مِنْ عِنْدِ النَّجَاشِيِّ سَلَّمْنَا عَلَيْهِ فَلَمْ يَرُدَّ عَلَيْنَا وَقَالَ إِنَّ فِي الصَّلاَةِ شُغْلاً**)[٦٠٧]. واتە لـە عبداللە ـی کوڕی مەسعودەوە رضي الله عنه کە فەرموویەتی : ئێمە سەلامان لـە پێغەمبـەری خوا صلى الله عليه وسلم دەکرد لـە کاتێکدا کە ئەو لـە نوێژدا بوو، وەڵامی دەداینەوە، بەڵام کاتێك کە لـەلای نەجاشی گەڕاینەوە سەلامان لـە پێغەمبـەری خوا صلى الله عليه وسلم دەکرد، بەڵام وەڵامی نەداینەوە، وە پاشان فەرمووی: بەڕاستی لـە نوێژدا وتووێژ لـەگەڵ اللە تعالی ـدا هەیە، واتە سەلام مەکەن .

گوتم : ئەمە بابەتێکی هەستیاری وەکو نوێژە کە زانایەکی نێو هاوەڵان لـێی بـێئاگابوو، لـەبەر ئەوەی کە لـە حەبەشە بوو، ئەی بابەتەکانی تر کە وەك وتمان کە

[٦٠٧] صحيح البخاري / ر.١١٩٩ و صحيح مسلم / ر.٥٣٨ و غەیری ئەمانیش ..

لە مەدینەیش دابەزین، وە هەندێکیان نەسخ دەبوونەوە و حوکمی تازە دەهاتە جێی ئەمە چۆن بزانن ؟ ئەوکاتیش ڕێگاکانی گەیاندی هەواڵ وەکو ئێستا نەبوون .

بۆ نمونە حوکمی حەرامیەتی عەرەق بە سێ قۆناغ کرا ، تەنانەت لە جەنگی ئحودیشا حەرام نەکرابوو وە موسڵمانان دەیانخواردەوە، پاشان حەرامکرا و پاشان حەددی بۆ دانرا.

وە حەددی زیناکار تاکو مصافەیەك دوای هیجرەتیش دانەبەزیبوو، ئایە نەجاشیەك کە لە وڵاتێکی دوور حوکم بە چی بکات؟ بە شتێك کە هێشتا دانەبەزیووە؟؟ بابەتەکە ڕوونە، ئەم بابەتانە پیویستە ڕوونبکرێتەوە و خەڵکی لێ هۆشیار بکرێتەوە کە بەم درۆیانە هەڵنەخەڵەتێن .

وە نەجاشی بەو حاڵەیشەوە زۆر لەم بەناو ئیسلامییانەی سەردەم جوانتر دینەکەی گرتبوو (ئەوەی کە پێی گەیشتبوو) چونکە :

**یەکەم** : ئەو بڕوایەکی تەواوی بە تەوحید هێنابوو وە خۆی لە شیرك پاراستبوو، بڕواهێنانێك کە خۆشەویستمان ﷺ شایەتی بۆ بدات ، پێچەوانەی دیموکراسی خوازانی ئەمڕۆوە کە ڕۆچوونە لە شیرکا، بەتایبەت لە شیرکی حوکم و ڕازی بوون بە حوکمی دیموکراسی .

**دووەم** : ئەو خاوەنی ولاء و براء بوو، بەرائەتی لە کافران کردبوو، پێش ئەوەی ببـێتە بە موسڵمان ئاڵوگۆڕی شت و مەکی لەگەڵ دەوڵەتی ڕۆم دەکرد، بەڵام دوای موسڵمان بوونی فەرمووی (**ئەگەر داوای یەك درهەمیش بکەن پێیان نادەم!**)[٦٠٨]. بە پێچەوانەی ئێوەوە کە پشتان لە موسڵمانان وبەرنامە وئامانجیانکردووە و بوونەتە هاوپەیمان وخزمەتکاری کافران وبە بەرنامەکانیان ڕازی بوون و ئەوەتان لە مێشکی خۆتان دەرکردووە کە بۆ چەسپاندی شەرع تێبکۆشن،

---

[٦٠٨] زاد المعاد : ٦٣/٣

بەڵكو سەریشیان دەخەن بەرامبــەر ئەو موسڵمانانەی كە دەیانەوەێت شەرع حاكم بــیت .

كەواتە نەجاشی بە هیچ شێوەیەك ناكرێتە بەڵگە بۆتان، ئەو هەموو عوزرەی ئەو هەیبوو ئێوە نیتانە، بەڵكو تەنها چەواشەكاری دەكەن وخەڵكی جاهیل وعامی هەڵدەخەڵەتێنن، ئەمیش لـە پێناو كوفری ناو پەرلـەمان .

## شوبهەی دەیەم : حكم بغير ما انزل الله و فعل بما انزل الله

ئەم شوبهەیە هەم جەهمیەكانی سەردەم وهەمیش موشریكە بەناوئیسلامییەكانیش ئەم شوبهەیە دەورووژێنن، دەڵێن هەركەسێك حوكم بە قورئان نەكات كافر نیە، ئەی بۆچی دز كافر نیە خۆ ئەویش حوكمی بە قورئان نەكردوە و خۆ زیناكاریش حوكمی بە قورئان نەكردووە و خۆ خۆ..

تەنانەت یەكێك لە بەناوزانا گەورەكانی جەهمییەكان لە میصریش كە محمد رسلان بوو ئەم قسەیە دەكات، لە كاتێكدا كەسێك یەك كەمێك شارەزایی لەم بابەتە هەبـیت ئەم قسە پڕوپوچە ناكات .

خوای تعالی كاتێك تەكفیری حاكم بغير ما أنزل الله دەكات دەفەرمووێ ﴿**ومن لم يحكم بما أنزل الله فأولئك هم الكافرون**﴾ . واتە : وە هەركەسێك حوكم بەوە نەكات كە الله تعالی دایگرتووە، ئەوا ئەوانە كافرن.

خوای تعالی دەفەرمووێ (يحكم) نەك (يفعل) ، ئەمە زۆر جیاوازە، خاوەنی شوبهەكە بە ڕادەیەك جەهیلە كە نازانێت كە ئەم دووانە جیاوازن، خوای تعالی نەیفەرموو ومن لم يفعل (يان يعمل) بغير ما أنزل الله فأولئك هم الكافرون. واتە هەركەسێك كار بە قورئان نەكات كافرە، ئەمە بـیروبۆچوونی خەواریجە كە خەڵكی بە تاوانی گەورە تەكفیر دەكەن بە پێچەوانەی ئەهلی سونەوە كە هیچ كەسێك بە كافر نازانین بە هۆی ئەنجامدنی تاوانی گەورەوە .

ئێمە پێمان وایە كە هەركەسێك تووشی شیرك و كوفری گەورەبوو ئەوجا تەكفیر دەكرێت، بەڵام تاوانی گەورە هەرچەندە زۆر بـیت مادەم بە حەڵاڵیان نازانێت كافر نابـیت، هەروەكو خوای تعالی دەفەرمووێ ﴿**إن الله لا يغفر أن يشرك به و يغفر ما دون ذلك لمن يشاء**﴾ واتە : بەڕاستی خوای تعالی لە كەسێك خۆش نابـیت كە هاوەڵ و شەریكی بۆ الله ﷻ دانابـیت ، وە لە خواری ئەوە (وەكو

تاوانەکان) خوای تعالی بۆ هەرکەس ویستی لێبـیت لێی خۆش دەبـیت . واتە دەکەوێتە ژێر مەشیئەتی الله تعالی ـەوە، بۆی هەیە سزای نەدات و لێیشی خۆش ببـیت، بۆیشی هەیە سزای بدات پاشان بـیکتە بەهەشتەوە، بە پێچەوانەی کوفر یان شیرکەوە کە لێخۆش بوون بۆی نیە مەگەر تەوبە و ئیمانێکی ڕستەقینەی هاوردبـیتەوە .

بۆیە وەڵامی ئەم گومانە تەفصیلی ناوێت ، تەنها جیاوازی کردنە لە نێوان دوو وشە، حکم و فعل، حوکم کردن بە غەیری قورئان کوفرە، بەڵام کارنەکردن بە غەیری قورئان کوفری گەورە نیە، بۆ نمونە (دزی یان ڕیبا یان داوێن پیسی یان قەتلی بە ناحەق ...) ئەمانە خاوەنەکەی پێی کافر نابـیت ئیللا مەگەر تاوانەکە بە حەڵاڵ بزانێت .

**بۆیە دەڵێین**: حکم بەغەیری قورئان کوفرە وخاوەنەکەی پێی کافر دەبێت، بەڵام شەرت نیە هەرکەسێك کاری بە قورئان نەکرد (بۆنمونە دزی یان درۆی کرد) ئەوا کافربێت.

## شوبهەی یازدەهەم : پێغەمبەری خوا لەنێوان جولەکەکان حوکمی بەتەورات کرد !

یەکێکی تر لە گومانی ئەم جاهیل و نەفامانە، ئەوەیە دەڵێن پێغەمبەری خوا ﷺ لەنێوان جولەکەکان حوکمی بە تەورات کرد ، نەك قورئان، کەواتە ئەگەر حوکم بە غەیری قورئان کوفربێت چۆن پێغەمبەری خوا ﷺ کاری وادەکات ..؟

**لەوەلامدا دەڵێین** : گومانێکی لاوازە و وەڵامیشی ئاسانە، سەرەتا با باسی ئەصڵی بابەتەکە بکەین .

ئیمامی البخاري[٦٠٩] ومسلم[٦١٠] وأحمد[٦١١] وأبوداود[٦١٢] وعبدالرزاق[٦١٣] و غەیری غەیری ئەوانیش ڕیوایەتیان کردووە لە نافع و عبدالله بن دینار و زید بن أسلم، هەرسێکیان لە إبن عمر کە فەرموویەتی «إِنَّ الْيَهُودَ جَاءُوا إِلَى رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، فَذَكَرُوا لَهُ أَنَّ رَجُلًا مِنْهُمْ وَامْرَأَةً زَنَيَا، فَقَالَ لَهُمْ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: «مَا تَجِدُونَ فِي التَّوْرَاةِ فِي شَأْنِ الرَّجْمِ» فَقَالُوا: نَفْضَحُهُمْ وَيُجْلَدُونَ، قَالَ عَبْدُ اللَّهِ بْنُ سَلَامٍ: كَذَبْتُمْ إِنَّ فِيهَا الرَّجْمَ، فَأَتَوْا بِالتَّوْرَاةِ فَنَشَرُوهَا، فَوَضَعَ أَحَدُهُمْ يَدَهُ عَلَى آيَةِ الرَّجْمِ، فَقَرَأَ مَا قَبْلَهَا وَمَا بَعْدَهَا، فَقَالَ لَهُ عَبْدُ اللَّهِ بْنُ سَلَامٍ: ارْفَعْ يَدَكَ فَرَفَعَ يَدَهُ فَإِذَا فِيهَا آيَةُ الرَّجْمِ، قَالُوا: صَدَقَ يَا مُحَمَّدُ فِيهَا آيَةُ الرَّجْمِ، فَأَمَرَ بِهِمَا رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَرُجِمَا» واتە : یەهود هاتن بۆلای پێغەمبەری خوا ﷺ ، بۆیان باسکرد کە ژن و پیاوێکی جوولەکە زینایان کردووە ، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی «چیتان دەست دەکەوێت لە تەوڕاتدا دەربارەی ڕەجم کردن ؟»، وتیان حەیایان دەبەین و لێیان دەدەین ، عبدالله بن سلام رضي الله عنه (کەپێشتر جولەکە بوو وە موسڵمان بوبوو) وتی: درۆتان کرد ، لە تەوڕاتدا (حوکمی بۆ ئەوانە) ڕەجمی تێدایە ، تەوڕات بهێنن ، یەکێکیان (لە جولەکەکان)

[٦٠٩] (٦٨٤١) و (٦٨١٩)
[٦١٠] (١٦٩٩)
[٦١١] (٤٤٩٨) و (٤٤٤٩)
[٦١٢] (٤٤٤٦)
[٦١٣] (١٣٣٣١)

دەستی لـەسەر ئایەتی ڕەجم دانا (تادیارنەبێ) پاش و پێشی ئایەتەکەیان خوێندەوە ، عبدالله بن سلام ﷺ فەرمووی : دەستت بەرز بکەوە، دەستی بەرزکردەوە ئایەتی ڕەجمی تێدابوو، وتیان عبدالله ڕاست دەکات ئایەتی ڕەجمی تێدایە، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانی کرد و ڕەجم کران.

## وەڵامی شوبهەکە بەدوو خاڵێك دەدەینەوە :

١- پێغەمبەری خوا ﷺ بۆیە داوای تەوڕاتی کرد لـەم بابەتە چونکە دەیزانی لـە تەوڕاتیش هەمان حوکمی قورئانی تێدایە لـەم بابەتە ، هەروەکو فەرمووی «مَا تَجِدُونَ فِي التَّوْرَاةِ فِي شَأْنِ الرَّجْمِ» واتە چیتان دەست دەکەوێ لـەتەوڕاتدا دەربارەی ڕەجم ؟ ئەمیش هاتووە لـە ڕێگاکەی مالك لـە نافع لـە ابن عمر کە بەهێزترینی ڕێگاکانە، وە هیچ ڕێگایەکی حدیث بەهێزتر نیە لـەم ڕێگایە ، دەبینین پێغەمبەری خوا ﷺ باش دەیزانی کە لـەتەوڕاتەکەی خۆیشیاندا هەمان حوکمی قورئانی تێدایە ، خوای تعالی ـیش دەفەرمووێ ﴿وَكَيْفَ يُحَكِّمُونَكَ وَعِنْدَهُمُ التَّوْرَاةُ فِيهَا حُكْمُ اللَّهِ﴾ واتە چۆن دێن بۆلای تۆ و دەتکەن بەحەکەم لـەکاتێکدا خۆیان تەوڕاتیان لایە و حوکمی الله ـی ﷻ تێدایە.

**ئیمامی أبو سلیمان الخطابي** ﵀ فەرموویەتی (**ولیس یخلو الأمر فیما صنعه رسول الله ﷺ من ذلك عن أن یكون موافقاً لحكم الإسلام أو مخالفا له فإن كان مخالفاً فلا یجوز أن یحكم بالمنسوخ ویترك الناسخ.**

**وإن كان موافقاً له فهو شریعته والحكم الموافق لشریعته لا یجوز أن یكون مضافاً إلى غیره ولا أن یكون فیه تابعاً لمن سواه**)[٦١٤] واتە ئەگەر حوکمەکە هەمان حوکمی قورئان بوو ئەوا دروستە کاری پێبکرێ، خۆ ئەگەر هەمان حوکم نەبوو دروست نیە.

---

[٦١٤] معالم السنن : ٣/٣٢٦

وه ئیمامی إبن عبدالبر رحمه الله فه‌رموویه‌تی (أَنَّ أَهْلَ الْكِتَابِ إِذَا ارْتَفَعُوا إِلَيْنَا مُتَحَاكِمِينَ رَاضِينَ بِحُكْمِنَا فِيهِمْ وَكَانَتْ شَرِيعَتُنَا مُوَافِقَةً فِي ذَلِكَ لِحُكْمِ شَرِيعَتِهِمْ جَازَ لَنَا أَنْ نَظْهَرَ عَلَيْهِمْ بِكِتَابِهِمْ حُجَّةً عَلَيْهِمْ وَإِنْ لَمْ تَكُنِ الشَّرِيعَةُ فِي ذَلِكَ الْحُكْمِ مُوَافِقَةً لِحُكْمِهِمْ حَكَمْنَا بَيْنَهُمْ بِمَا أَنْزَلَ اللَّهُ تَعَالَى فِي كِتَابِهِ الْقُرْآنِ)[٦١٥] واته ئه‌گه‌ر جوله‌که و نه‌صرانیه‌کان حوکمیان بۆلای ئێمه به‌رز کرده‌وه، وه ڕازی بوون به حوکمی ئێمه له‌نێوان ئه‌واندا، وه له‌و بابه‌ته‌دا حوکمی ئێمه هه‌مان حوکمی شه‌ریعه‌ته‌که‌ی خۆیانی هه‌بوو، دروسته بۆ ئێمه که هه‌ڵسین به‌سه‌ریانه‌وه به کتابه‌که‌ی خۆیان ، وه‌کو حوجه‌یه‌ك له‌سه‌ریان، خۆ ئه‌گه‌ر حوکمه‌که‌ی ئێمه له‌و بابه‌ته‌دا هه‌مان حوکمی ئه‌وان نه‌بوو، ئه‌وا حوکم به قورئان ده‌که‌ین .

**گوتم** : که‌واته پێغه‌مبه‌ری خوا ﷺ بۆیه ئه‌م کاره‌ی کرد، بۆ ئه‌وه‌ی به کتابه‌که‌ی خۆیان ده‌ستیان ببه‌ستێته‌وه، وه هیچیان پێنه‌گوترێ له به‌رامبه‌ر خۆشه‌ویستمان ﷺ ، وه بۆ ئه‌وه‌ی به خۆیاندا بچنه‌وه، نه‌ك بۆ ئه‌وه‌ی ته‌وراتِ بکات به حه‌که‌م له غه‌یری ئه‌م بابه‌ته‌یش.

٤ – ئه‌و کاره له‌سه‌ره‌تای هاتنی رسول الله ﷺ بوو بۆ مه‌دینه، وه دواتر ئه‌وه‌یش قه‌ده‌غه‌کرا، واته نسخ بۆته‌وه .

**إبن بطال** ده‌ڵێت : (**وكان ذلك أول دخوله ﷺ المدينة، ثم نزل عليه القرآن بعد ذلك الذى نسخ خطه وبقى حكمه**)[٦١٦]واته : ئه‌و کاره له‌سه‌ره‌تاکانی چوونی پێغه‌مبه‌ری خوا بوو ﷺ بۆ مه‌دینه ، دواتر وه‌حی دابه‌زی (که ئایه‌تی ڕه‌جم بوو)، که وه‌کو نوسین نسخ بۆوه و وه‌کو حوکمیش جێگیربوو.

**پاشان ده‌ڵێت : (فلم يحكم بعد هذه الآية بين أهل الكتاب إذا تحاكموا إليه إلا بالقرآن)**[٦١٧] إبن بطال باسی ئایه‌تی (٥١) له سوره‌تی العنكبوت ده‌کات و ده‌ڵێت

---

[٦١٥] الأستذكار : ٤٥٩/٧

[٦١٦] شرح صحيح البخارى لابن بطال : ٤٧٥/٨

[٦١٧] شرح صحيح البخاري لإبن بطال : ٤٧٦/٨

لەدوای دابەزینی ئەم ئایەتە ئیتر رسول الله ﷺ بە قورئان نەبوایە حوكمی لە نێوانیان ناكرد.

وە **بدرالدین العینی** دەفەرمووێ (**كَانَ يحكم التَّوْرَاة قبل نزُول آيَة الْجلد فِي أول مَا دخل ﷺ الْمَدِينَة، فَصَارَ مَنْسُوخا بهَا**)[618] واتە ئەمە پێش دابەزینی ئایەتی جەڵد بوو ، لە سەرەتای چوونی پێغەمبەری خوا بۆ مەدینە ، وە نەسخ بۆیەوە .

وە **إبن حجر** رحمه الله فەرموویەتی (**كان ذَلِكَ أَوَّلُ دُخُولِ النَّبِيِّ ﷺ الْمَدِينَةَ وَكَانَ مَأْمُورًا بِاتِّبَاعِ حُكْمِ التَّوْرَاةِ وَالْعَمَلِ بِهَا حَتَّى يُنْسَخَ ذَلِكَ فِي شَرْعِهِ..**)[619] واتە ئەوە ڕوداوە لەسەرەتای چوونی پێغەمبەری خوا ﷺ بوو بۆ مەدینە ، ئەوكاتە فەرمانی پێكرابوو كە شوێنی حوكمی تەوراتی بكەوێت و كاری پێبكات تاكو ئەوە نەسخ كرایەوە لە حوكمەكەیدا..

الله تعالی دەفەرمووێ ﴿**وَأَنِ احْكُمْ بَيْنَهُمْ بِمَا أَنْزَلَ اللَّهُ وَلَا تَتَّبِعْ أَهْوَاءَهُمْ وَاحْذَرْهُمْ أَنْ يَفْتِنُوكَ عَنْ بَعْضِ مَا أَنْزَلَ اللَّهُ إِلَيْكَ**﴾[620] . واتە : ئەی محمد ﷺ حوكم بە قورئانە بكە كە الله بۆی ناردویتە خوارەوە ، نەكەی شوێنی هەواو ئارەزووی یەهوود بكەویت، وە ئاگاداریان بە كە تووشی هەڵەت نەكەن و لە بەشێك لەو حوكمە لات نەدەن كە الله بۆی ناردوویت .

**ئیمامی الشافعی** رحمه الله فەرموویەتی (**ولا يجوز أن يحكم بينهم في شيء من الدنيا إلا بحكم المسلمين**)[621] واتە دروست نیە حوكم لەنێوان (یەهود و غەیری ئەوانیش) لە هەرشتێكی دونیا بكرێت ئیللا دەبێ حوكم بە حوكمی موسڵمانان بكرێت كە قورئانە.

**سبحانك اللهم و بحمدك ، أشهد أن لا اله الا أنت ، أستغفرك و أتوب إليك .**

[618] عمدة القاري : ١٦١/١٦

[619] فتح الباري ١٧٠/١٢

[620] سورة المائدة / ٤٩

[621] تفسير الإمام الشافعي : ٧٦٠/٢

لێرەدا دەوەستین والحمدلله رب العالمین ..

تەواوبووم لـه ٨/ ڕەمەزانی / ساڵی ١٤٤٠ هیجری.

بەرامبـــەر به ١٣ / ٥ / ســــاڵی ٢٠١٩ میلادی.

# فهرس



# ئاگاداركردنەوەی بەندەكان

لە ترسناكی گەڕانەوەی حوكم بۆلای یاسا دەستكردەكان

نووسینی

إبراهيم عمر كوردی

2019 -1440